# سەردەم ٢١

گۆڤاریکی تایبەتە بە وەرگیران و کەلتووری بییانی


خاوەنی ئیمتیاز: شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر: ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین: ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری: قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری

تاڤگە فائق



ناونیشان

سلێمانی فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن: 130347٢

بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044162 8486008 Faz: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

١٤٦٦٥/٦١٥ و ١٤٦٦٥/٦١٦ تاران

لە ریگەی ( e~mail )ەوە

sardam@sardam.org




Fin mickelborg

گۆڤاری (سەردەم) هەر لە سەرەتاوە ویستوویەتی پەنجەرەیەك بیت لەسەر کەلتووری بیگانە، بە تایبەتیش بوارەکانی فەلسەفەو فیکرو تۆژینەوەی رەخنەی ئەدەبیو هەلبژاردە لە دەقی بیگانەو هونەرەجوانەکان. بە مەبەستی ئاشناکردنی خوینەری کوردیش بەو کەلتوورە؛ گۆڤاری (سەردەم) جەخت لەسەر هەلبژاردنی چۆنیی بابەتەکانو وەرگیرانی سەرکەوتوو دەکات. هەر بۆیە ئومیدەوارە کە بتوانیت لەم رییەوە؛ لە بزاوتی رۆشنبیریی کوردیدا بە جۆریك لە جۆران رۆلی خۆی ببینیت. ئەوەش رادەگەیەنین کە ئەم گۆڤارە گۆڤاری هەموو وەرگیریکی کوردە کە ئەم پیرەوە رەچاو بکات.

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بلاویدەکاتەوە

حوزەیرانی

٢٠٠٢

سالی حەوادەم

سەردەم ٢١

Sardam

# ناوەڕۆك

د. مووسا ئیبراهیم

# جان جاك ڕۆسۆ

## (١٧١٢ – ١٧٧٨)



جان جاك ڕۆسۆ

و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بە گشتی:**

"جان جاك ڕۆسۆ" ساڵی ١٧١٢ لە شاری (جنیڤ)ی سویسرا و لە بنەماڵەیەکی فەرەنسی پرۆتستانت مەزهەب هاتۆتە دنیاوە. باوکی پیشەی سەعاتچی بووە. هەر لە سەرەتاوە ژیانێکی چەرمەسەری و ئاوارەیی و پڕ نەهامەتی ژیاوە. هەفتەیەك دوای لەدایکبوونی، دایکی دەمرێت و پووری دەیگرێتە خۆی.. لەم بارەیەوە دەڵێت: (بە لاوازی و نەخۆشیەوە لەدایك بووم. لە پێناو هێنانە دنیای مندا، دایکم قوربانی بە ژیانی خۆی دا. هاتنە دنیام بەمجۆرە، یەکەمین کۆست و نەهامەتی من بوو)[1].

سەرەتای تەمەنی بە پیشەی هەڵکۆڵین دەست پێکرد، بەڵام زوڵم و ستەمی مامۆستاکەی ناچاری کرد لە تەمەنی شانزەساڵیدا هەڵبێت و ڕووبکاتە ئیتاڵیاو هەموو جۆرە کارێك بکات. دوای هەڵهاتنی بە هەشت ساڵ، لە (ساڤوا) تووشی خانمێکی خانەدان دێت. ئەم خانمە توانی بۆ ماوەی پێنج ساڵ جۆرە ژیانێکی ئارامی بۆ فەراهەم بکات. لەم ماوەیەدا توانی فێری مۆسیقاو زمانی لاتینی بێت و خۆی بە خوێندنەوەی فەلسەفەوە خەریك بکات.

ساڵی ١٧٤١ دەچێتە پاریس، پاش ماوەیەك ئەوێ جێدێڵێ و لە ڤینیسیا دەبێتە نووسەری باڵوێزی فەرەنسا. لە تەمەنی سی و سێ ساڵیدا دەگەڕێتەوە شاری (پاریس) و خێزان دروست دەکات و پێنج منداڵی دەبێت، بەڵام بە هۆی هەژاری و دەست کورتییەوە منداڵەکانی پێ بەخێو ناکرێت و ناچار دەیانخاتە هەتیوخانەیەك. لەم قۆناغەدا هاتوچۆی فەیلەسوفەکان دەکات، بە تایبەتی "دیدرۆ".

ساڵی ١٧٤٩ بەشداری پێشبڕکێیەك دەکات کە ئەکادیمیای (دیگۆن) ڕێکی خستبوو. بابەتی پێشبڕکێکەش ئەم پرسیارە بوو: (ئایا زانست و هونەر ڕۆڵیان لە چاکترکردنی ئاکاردا بینیوە؟)، خەڵاتی یەکەمیش درا بەو. ئەم وتارەی لە ساڵی ١٧٥٠ بوە دەسپێکی نووسینی کتێبێك بە ناوی (وتارێك دەربارەی زانست و هونەر). ئەمە ناوبانگێکی زۆری لە ئەورووپادا بۆ پەیدا کرد، لەبەرئەوەی زۆربەی ڕۆشنبیرانی ئەورووپا لە سەدەی هەژدەهەمدا زمانی فەرەنسیان دەزانی و پێیان دەخوێندەوە. ساڵی ١٧٥٤ دووەم کتێبی خۆی (وتارێك دەربارەی سەرچاوەی جیاوازی نێوان ئینسانەکان)ی بڵاوکردەوە.

بۆ دوەم جار بەشداری پێشبڕکێی ئەکادیمیای (دیگۆن) دەکات، پرسیاری ئەو پێشبڕکێیەش بەم جۆرە دەبێت: (سەرچاوەی جیاوازی پلەوپایەی نێوان مرۆڤ چییە؟ ئایا ئەم جیاوازیە یاسای سروشتی پەسەندی دەکات؟)، بەڵام وەکی یەکەمین جار ناتوانێت خەڵات وەربگرێت. ساڵی ١٧٥٥ (ئابوری سیاسی) دەنووسێت. ساڵی ١٧٦٢ دوو کتێب بڵاودەکاتەوە: (پەیمانی کۆمەڵایەتی) و (ئەمیل).

لەسەر نووسینی (ئەمیل) ڕەخنەیەکی زۆری ئاراستە کراو بوە مایەی ڕق و توڕەیی باوەڕداران و بێ باوەڕان (مەسیحیەکان و فەیلەسوفان). هاوکات پەرلەمانی

(پاریس)یش بڕیاری دا ئەو کتێبە بسوتێنرێت و نووسەرەکەشی زیندانی بکرێت. هەموو ئەمانە بوونە مایەی ئەوەی "ڕۆسۆ" بەرەو سویسرا هەڵبێت، بەڵام ئەو وڵاتە نەیگرتە خۆی. ناچار ڕوی کردە بەریتانیا و لەگەڵ "دایڤید هیوم"دا ئاشنایەتی پەیدا کردو بوە میوانی ئەو، بەڵام زۆری نەبرد نێوانیان تێکچوو، بەم جۆرە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ پاریس.

"ڕۆسۆ" بە چاکترین شێوە تەعبیری لە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی فەرەنسای بەر لە شۆڕشی ١٧٨٩ کردوە. مەبەستی سەرەکی نووسینەکانیشی دۆزینەوەی چارەسەرێك بوە بۆ ئەو کێشانە. بەکارهێنانی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی لە لایەن "ڕۆسۆ"وە، جیاواز بوو لە بەکارهێنانی هەریەك لە "تۆماس هۆبس" و "جۆن لوك". نووسینەکانی دەنگدانەوەیەکی گەورەی لە سەرانسەری ئەوروپادا هەبوو، هەروەها کاریگەری زۆریشی لەسەر هەردوو شۆڕشی فەرەنسی و ئەمریکی بەجێهێشت. سەرەڕای ئەوەی کەمەکێك ئاگاداری مێژوو و فەلسەفە بوو، بەڵام ستایشی زۆری سستمی کۆماری ڕۆمانیەکانی دەکرد و دژی ئەو ئەقڵانیەتە بوو کە لە سەردەم و ڕۆژگاری خۆیدا باڵادەست بوو.

کەسایەتی خۆی، کاریگەری بەسەر نووسینەکانیەوە هەبوو. ئەو کەسێکی لەخۆبایی و هەست ناسك و سەختگیر بوو، دژی ڕێ و ڕەسمە کۆنەکان و ژیانی شارستانی بوو. متمانەی بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا نەبوو، هەر بۆیە داوای ئازادی مرۆڤی دەکرد. هاوکات ڕەخنەی لە سستمی حوکمڕانی پاشایەتی دیسپۆتیزمیش دەگرت، سستمێك دەسەڵاتی خۆی لەسەر تیۆری مافی خوایەتی بەرقەرار کردبوو، جیاوازی چینایەتی و گەندەڵیش تیایدا ڕەگی داکوتیبوو.

"ڕۆسۆ" وەکی "مۆنتسکیۆ" و "ڤۆلتێر" داوای بەخشینی ئازادی بە چینی ناوەند نەدەکرد، بەڵکو دەیویست ئەو مافانە تەواوی چینی جوتیاران و کرێکارانیش بگرێتەوە. هەروەها هێرشی دەکردە سەر ئەو دیاردە شارستانیە پیشەسازیانەشی پشت بە دەسکەوت و دۆزینەوەکانی ئەقڵ دەبەستن. دژ بەو بۆچوونانەش وەستایەوە کە دەڵێت پێشکەوتن بەرهەمی زانینە. ئەو بانگەشەی بۆ بەها باڵاکانی وەك دیموکراسی ڕاستەوخۆ و دادپەروەریەکی تەواو دەکرد، هەروەها سەرلەنوێ بونیادنانەوەی سستمی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە کارێکی پێویست دەبینی.

"ڕۆسۆ" بە چاکترین شێوە تەعبیری لە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسای بەر لە شۆڕشی ١٧٨٩ کردوە

"رۆسۆ" بە هەمان شێوەی "تۆماس هۆبس" و "جۆن لوك"، باسی لە چۆنیەتی گواستنەوەی مرۆڤ لە دۆخی سروشتیەوە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی کردوە.

### دۆخی سروشتی و سەرچاوەی جیاوازی نێوان مرۆڤەکان:

"رۆسۆ" بە هەمان شێوەی "تۆماس هۆبس" و "جۆن لوك"، باسی لە چۆنیەتی گواستنەوەی مرۆڤ لە دۆخی سروشتیەوە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی کردوە. ئەو پێی وایە مرۆڤ بەرلەوەی داخڵ بە کۆمەڵگەیەکی رێکخراو بێت لە حاڵەتێکی سروشتیدا ژیاوە، لەم دۆخەدا هەموو مرۆڤەکان یەکسان بوون و هەر کەسە و پێداویستی خۆی تێر کردوەو هەموانیش بەو ژیانە رازی بوون. لەم روەوە "داننج" دەڵێت: (تایبەتمەندی دۆخی سروشتی یەکسانی تەواوی نێوان مرۆڤەکان بوو، لەو دۆخەدا هیچ جۆرە جیاوازیەك لە نێوان یەکێك و یەکێکی تردا نەبوو)[٢].

مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا، لەژێر کۆمەڵێك هەست و سۆزی خۆرسك و بەرژەوەندی تایبەتیدا هەڵسوکەوت دەکات کە بەختەوەری و کامەرانی بۆ دەستەبەر دەکەن. لەم قۆناغەدا مرۆڤ لە جەنگەڵەکان، لەنێو ئاژەڵدا دەژیا و بە غەریزە درکی بە هەموو ئەو شتانە دەکرد کە بۆ ژیانی پێویست بوون. ئەوەی تەنها ترسی لێی هەبوو، ئازار و برسیەتی بوو. لە ژیانیشدا تەنها خەیاڵی لای خواردن و نوستن و جووت بوون بوو، (تەنها خولیای ئەوە بوو بێوەی بێت و دەرونی ئارام و جەستەشی تەندروست بێت)[٣].

مرۆڤی هاوشێوەی خۆی لێرەو لەوێ تاق و تەرا ژیانیان دەگوزەراند، بەڵام هیچ پەیوەندیەکی بازرگانی لەگەڵدا نەدەکردن، چونکە نە پێویستی پێیان هەبوو نە بیری لە ئازاردانیشیان دەکردەوە. لە نێوان ئەم و ئەواندا هیچ جۆرە پەیوەندیەکی ئەخلاقی یاخود ئەرکی هاوبەش نەبوو. سروشت مرۆڤی سەرەتایی فێری هەموو شتێك کردبوو، هەروەها هەموو ئەو ئامرازانەی بۆ دەستەبەر کردبوو کە بەکاری دەهێنان و پێویستی پێیان بوو.

مرۆڤی سەرەتایی پێویستی بە دەستگیرۆیی کەسانی تر نەبوو، ئەو درندە خۆپەرستەش نەبوو کە شەڕ لە دژی هەموان بکات وەك "تۆماس هۆبس" پێی وابوو. (جەنگ و ترس و خۆپەرستی تەنها لە دۆخی کۆمەڵایەتیدا دێتە ئارا، لە ژیانی سادەو خۆرسك و گۆشەگیریدا کە خەسڵەتی دۆخی سروشتین، مرۆڤ بەم خەسڵەتانە نامۆ بوە)[٤].

كەواتە ئەقڵ لای هەریەك لە "هۆپس و لۆك" ئامرازێكە بۆ گواستنەوەی مرۆڤ لە دۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی كۆمەڵایەتی، بەڵام لای "ڕۆسۆ" بەرەنجامی ئەو گواستنەوەیەیە.

"ڕۆسۆ" زیاد لە "هۆپس" و "لۆك" بڕوای بە دۆخی سروشتی هەیە، بەڵام وەك ئەوان ئەو سەنگ و قورساییە نادات بە ئەقڵ. "هۆپس" و "لۆك" پێیان وایە ئەوە ئەقڵە وا لە مرۆڤ دەكات تا لە دۆخی سروشتییەوە بەرەو دۆخی كۆمەڵایەتی بچێت، بەڵام "ڕۆسۆ" ئەقڵ بە بەرەنجامی بەرەوپێشچوونی ژیانی ئابووری و پیشەسازی دەزانێت، لە كۆمەڵگەی سیاسی دیسپلینكراودا و پێی وایە گەشەی ئەقڵ مایەی بەدبەختی وماڵوێرانییە بۆ مرۆڤ، چونكە كامەرانی و بەختەوەری مرۆڤی لەناوبرد. (مرۆڤی سەرەتایی پێویستی بە ئەقڵ و تێفكرین نەبوو، سروشت هەموو ئەو شتانەی پێ بەخشی بوو كە ئارەزوە خۆڕسكەكانی تێر دەكرد و سروشتیش دژ بە ئەقڵەو لەگەلێدا ناكۆكە). "ڕۆسۆ" زیاتر پێی لێ هەڵدەبڕێت و دەڵێت: (بیركردنەوە پێچەوانەی سروشتە، ئەو مرۆڤەشی بیردەكاتەوە بوونەوەرێكی گەندەڵە)[٥]. كەواتە ئەقڵ لای هەریەك لە "هۆپس" و لۆك" ئامرازێكە بۆ گواستنەوەی مرۆڤ لە دۆخی سروشتییەوە بۆ دۆخی كۆمەڵایەتی، بەڵام لای "ڕۆسۆ" بەرەنجامی ئەو گواستنەوەیەیە.

"ڕۆسۆ" پێی وایە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا دڵخۆش و خانەدانە، تەنها ئەو كاتەش دەگاتە ئەو حاڵەتی شەڕانگێزیەی "هۆپس" باسی دەكات كە ژیانی كۆمەڵایەتی بەرەوپێشچوونی بە خۆیەوە بینی. لە دۆخی سروشتیدا مرۆڤ ڕاستەوخۆ هەستی بە ئێش و ئازاری هاوڕەگەزانی خۆی دەكرد. بەلای "ڕۆسۆ"وە، بەزەیی پێداهاتنەوە (هەستێكی سروشتیەو وا دەكات مرۆڤ لە ڕێی خۆشویستنی خۆیەوە، هەمان هەستی بەرامبەر ئەوانی دیكەش هەبێت)[٦]. لەوكاتەدا مرۆڤ هەستی بە جیاوازی نەدەكرد، بەڵام كاتێك دوچاری هەلومەرجێكی تر هات، ژیانی لە دۆخی سروشتییەوە گۆڕدرا بۆ دۆخی كۆمەڵایەتی. لەوكاتەوەی مرۆڤ بوە بە بونەوەرێكی كۆمەڵایەتی، بوە كەسێكی شەڕانگێزو كێشەو ململانێ لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاراندا دەستی پێكرد، بوو بە بوونەوەرێكی چاوبرسی و لە هەوڵی بەدەستهێنانی دەسكەوتی تایبەتی خۆیدا بوو. ئاكامی ئەمەش جیاوازیەكی ڕوون و ئاشكرای لێكەوتەوە، لە موڵكایەتی تایبەتی و لە ماف و لە ئازادیە سیاسیەكان. هەموو ئەم خەسڵەتە دزێوانە، مرۆڤ لە دوا قۆناغەكانی دۆخی سروشتیدا فێریان بوو، كاتێك مەیلی خۆپەرستی زیادی كرد و هۆكارەكانی دوژمنایەتی و كێبڕكێ كردن تاویان سەند. "ڕۆسۆ" لەم بارەیەوە دەڵێت: "هاتنە ئارای موڵكایەتی تایبەتی كۆتایی بە یەكسانی دۆخی سروشتی هێنا، ئەمەش دوا قۆناغی دۆخی سروشتی و یەكەمین هەنگاوی زەق

بوونەوەی نایەکسانی بوو لە دۆخی کۆمەڵایەتیدا)[٧]. کۆمەڵگە مرۆڤی وێران کرد، دەوڵەتیش بەڵایەکە و گەشەی ئابووری هێناویەتیە ئاراوە. بەڵای گەورەشی نەبوونی یەکسانیە لە نێوان ئینسانەکاندا.

> ئیلتزامی کۆمەڵایەتی و ملکەچکردن بۆ دەسەڵات نابێت سەرچاوەکەیان هێز بێت

## پەیمانی کۆمەڵایەتی:

شاکارە بەناوبانگەکەی "ڕۆسۆ" (پەیمانی کۆمەڵایەتی)، لە چوار کتێب پێکهاتوە. دەسپێکی (کتێبی یەکەم) بەم وتە بەناوبانگەی دەست پێ دەکات: (مرۆڤ بە ئازادی لەدایك دەبێت، کەچی دەبینین لە هەموو جێیەکدا زنجیر کراوە.. ئەم گۆڕانە چۆن ڕویدا)[٨]. هەروەها دەڵێت: (ئیلتزامی کۆمەڵایەتی و ملکەچکردن بۆ دەسەڵات نابێت سەرچاوەکەیان هێز بێت، دامەزراندنی دەسەڵات لەسەر هەقی فەتحکردن و پەلاماردان بە مانای نکوڵی کردنە لە ئایدیای هەق بە گشتی. ئەوە چ هەقێکە کە بە نەمانی هێز ئەویش نامێنێت؟ هاوکات ناکرێت ئیلتزامی کۆمەڵایەتی لەسەر ئایدیای دەسەڵاتی سروشتی باوك یان هەر سەرۆکێك کە دەسەڵاتی لە سروشتەوە سەرچاوە بگرێت دروست بکرێت). هەرچەندە خێزان کۆنترین یەکەی کۆمەڵایەتیە، بەڵام لەسەر ئیرادەو ڕێککەوتن دامەزراوە. لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان باوك و فرزەندەکان کۆتایی دێت هەرکاتێك فرزەندەکان پێویستییان بە چاودێری باوانیان نەما، بەڵام گەر هاتوو ئارەزویەکی هاوبەش بۆ پێکەوە ژیانێکی هاوبەش لە هەردوولاوە هەبوو، ئەوا پەیوەندی خێزانی بەردەوام دەبێت. لەم بارەیەوە "ڕۆسۆ" دەڵێت: (مادامەکی خێزان کە یەکەم کایەی کۆمەڵایەتیە– لەسەر ڕێکەوتنێکی ئازاد دامەزراوە، ئەوا ناکرێت مەزەندەی گروپێکی سیاسی بکەین بەبێ بوونی ڕێکەوتنێك لە نێوان ئەندامەکانیدا لەسەر ژیانێکی هاوبەش لەناو یەك گروپدا. وەها ڕێککەوتنێك یاخود پەیمانێکی کۆمەڵایەتی لەو جۆرە، سەرکەوتوو نابێت تەنها بە خواست و ڕەزامەندی ئیرادەی ئازادی تەواوی ئەندامانی ئەو گروپە نەبێت. چونکە کۆبوونەوەی مەدەنی پرۆسەیەکە زیاتر پابەندی خواستی فەردەکان خۆیانە و کەس ناتوانێت بە هیچ بیانوویەك بەبێ خواستی خۆی کەسێکی تر ناچار بکات، لەبەرئەوەی ئەو مرۆڤەش بە ئازادی لەدایك بوەو بڕیاری خۆی لە دەستی خۆیدایە. بەڵام لە دەرەوەی ئەم مسیاقە سەرەکیەدا ئەوا ڕێسای زۆرینە جێبەجێ دەکرێت)[٩].

لێرەوە ئاشکرا دەبێت کە "ڕۆسۆ" عەودالی دۆزینەوەی فۆرمێکە (بۆ یەکگرتن یاخود بۆ کۆبوونەوە)، بە جۆرێك سەروماڵی هەموو ئەندامانی تێدا پارێزراو بێت و هەر ئەندامێکی ئەو گروپە لەگەڵ باقی ئەندامەکانی تردا پەیوەندی بەستبێت، بەلام بێ ئەوەی دەستبەرداری ئەو ئازادییە بووبێت کە پێشتر هەیبوە. ئەمەش ئەو کێشە حەقیقیە سەرەکیەیە کە پەیمانی کۆمەڵایەتی دەیەوێت چارەسەرێکی دروستی بۆ بدۆزێتەوە.

بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی هەموو فەردێك دەستبەرداری مافەکانی خۆی دەبێت بۆ کۆمەڵگە، ئەمەش مەرجێکە بەبێ جیاوازی بەسەر هەمواندا جێبەجێ دەبێت. کاتێك تاکەکەس خۆی دەداتە دەست کۆمەڵگە واتە خۆی ناداتە دەست هیچ کەسێك، یان بەشێوەیەکی وردتر دەتوانین بڵێین: (هەر کەسەو بەبێ جیاوازی خۆی و تەواوی هێزو تواناکانی دەسپێرێت بە ئیرادەی گشتی، گردبوونەوەی هەموو ئەوانە دەبێتە یەك جەستە. واتە هەر یەکێك دەبێتە بەشێکی دانەبڕاو لە گشت)[10]. بەم جۆرە جەستەیەکی مەعنەوی دەستەجەمعی دێتە ئاراوەو جێگای ئەو تاکە کەسانە دەگرێتەوە کە لە ڕێگەی ڕێکەوتنی ناو خۆیانەوە دروستیان کردوە. ئیرادەی گشتی (دەسەلاتێکی سەرتاسەریەو بەرەنجامی یەکگرتنی ئیرادەی تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگەیە)[11].

هەرچەندە "ڕۆسۆ" پێی وابوو دۆخی سروشتی بەختەوەری بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات، بەلام وەك دۆخێکی نمونەیی لێی ناڕوانێت. بەڵکو پێی وایە کۆمەڵگەی سیاسی ڕێکخراو دەتوانێت بەختەوەرترین ژیان بۆ مرۆڤ مسۆگەر بکات و مرۆڤ و هێزە مەعنەویەکانی بەرەو ئاستێکی بالاتر ببات. هەر لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵگایەشدا دادپەروەری و ئاکار جێگای حەز و ئارەزوەکان دەگرنەوە. کەواتە پەیمانی کۆمەڵایەتی هێزو توانای خۆی بە تەنها لە ڕەزامەندی تاکە کەسەکانەوە وەرناگرێت، بەڵکو هاوکات لە سەلامەتی ئەو ڕێگایانەی دەیگرێتە بەرو ئەو ئامانجانەشی هەوڵی بەدیهێنانیان دەدات، سەرچاوە دەگرێت. لەبەرئەوەی پەیمانی کۆمەڵایەتی تەنها بۆ ئەوە هاتۆتە ئارا تا ژیانێکی ئاسودەتر و چاکتر لە دۆخی سروشتی کە ئازادی و یەکسانی تێدا بەرقەرارە، بۆ ئەندامەکانی مسۆگەر بکات. بۆیە پێویستە پەیمانی کۆمەڵایەتی گرانتی ئازادیەکانیان بکات، ئەو ئازادیەی ناکرێت دەستبەرداری بن، تەنانەت گەر هاتوو کەسەکان خۆشیان ویستێکی واشیان هەبوو. "ڕۆسۆ" لەم بارەیەوە دەڵێت: (هیچ کەسێك خۆبەخۆو بێ بەرامبەر دەستبەرداری

بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی هەموو فەردێك دەستبەرداری مافەکانی خۆی دەبێت بۆ کۆمەڵگە

ئازادی خۆی نابێت. ئەو قسەیەشی کە دەڵێت خەڵکانێك هەن بێ بەرامبەر خۆیان دەدەنە دەستی کەسانێکی تر، قسەیەکی زۆر بێ ماناو ناماقوڵە)[١٢].

بە پێی ئەو پەیمانی کۆمەڵایەتیەی لای "ڕۆسۆ"، تاکە کەسەکان دەستبەرداری تەواوی مافە سروشتیەکانی خۆیان دەبن بۆ کۆمەڵگە، ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان ئازادی و مافەکانی خۆیان لە دەست دەدەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، ئەوان ئەمە بە ماف و ئازادی مەدەنی دەگۆڕنەوە کە کۆمەڵگەی مەدەنی بڕیاری لێدەدات و دەوڵەتیش بە ئەرکی پارێزگاریکردنی هەڵدەستێت. ئامانج لە دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی دیسپلینکراویش ئەمەیە. (پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕێگاچارەیەکی یاسایی پێویستە بۆئەوەی شەرعیەت بداتە گۆڕینی مرۆڤ بە هاولاتی و هەروەها بۆئەوەی جێگای یەکسانی و ئازادی سروشتیش بگرێتەوە)[١٣]. یەکسانی مەدەنی دەبێتە مایەی تەواوکردنی یەکسانی سروشتی و ڕەهەندێکی ئەخلاقیشی بە بەردا دەکات. سروشت جۆرێك لە نایەکسانی مادی لە نێوان ئینسانەکاندا دروست کردوە، بۆیە کۆمەڵگە لە جێی ئەوەدا یەکسانیەکی ئەخلاقی و ڕەوا دروست دەکات. ئەو پیاوانەی لە هێزو تواناو ئەفراندندا وەك یەك نین، ئەوا هەموویان لە مافدا یەکسان دەبن.

سەبارەت بە ئازادیش، مادامەکی هەرکەسەو خۆی دەداتە دەستی هەموان نەك کەسێکی دیاری کراو، هەموو کەسێکیش گوێڕایەڵی ئیرادەی گشتی دەکات کە خۆی چون یەك لەگەڵ ئەوانی تردا بەشێکن لێی، ئەوا ئەو دەسەڵاتە چەندە تەعبیر لە ئیرادەی هەموان دەکات، ئەوەندەش تەعبیر لە ئیرادەی ئەو دەکات. هەر بۆیە ئەوەی بە گژ ئیرادەی گشتیدا دەچێتەوە، کارێك دەکات پێچەوانەی ئازادی خۆیەتی، لەبەرئەوەی بەگژ ئیرادەیەکدا دەچێتەوە کە ئیرادەی خۆیەتی، وەك چۆن ئیرادەی هەر کەسێکی دیکەشە. (ئەوەی بە زەبری هێز ناچار دەکرێت گوێ ڕایەڵ بێت، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئازادی پێشێل کراوە، بەڵکو زۆری لێ دەکرێت بۆئەوەی ئازاد بێت و دۆخی ئازادی هەڵبژێرێت)[١٤].

لێرەوە "ڕۆسۆ" دەیەوێت ئەو ناکۆکیەی لە نێوان بۆچونەکانی سەبارەت بە بەرگری کردنی لە تاکە کەس و مافەکانی و ئیعترافکردنی بە کۆمەڵ و دەسەڵاتە بێ سنورو ڕەهاکانیدا هەیە، نەهێڵێت. بە هۆی بوونی ئەم ناکۆکیە لە بۆچونەکانیداو دەستەوستانیشی لە چارەسەرکردنیدا، خوێنەرانی بوون بە دوو بەشەوە:

ڕۆسۆ دەیەوێت ئەو ناکۆکیەی لە نێوان بۆچونەکانی سەبارەت بە بەرگری کردنی لە تاکە کەس و مافەکانی و ئیعترافکردنی بە کۆمەڵ و دەسەڵاتە بێ سنورو ڕەهاکانیدا هەیە

دوای دروستبوونی دەوڵەت، ئیرادەی زۆرینە نوێنەرایەتی ئیرادەی گشتی دەکات و دەبێت کەمینەش ملکەچی ئیرادەی زۆرینە بێت

بەشێکیان بڕوایان وابوو کە ئەو لایەنگری بیروڕای ئازادو مافەکانی تاکە کەسە، هەندێکی دیکەش بە لایەنگری دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەتیان دەزانی و لەمەشدا پشتیان بە بیروبۆچوونەکانی خۆی بەستبوو، سەبارەت بە ئیرادەی گشتی و سەروەری.

## ئیرادەی گشتی (*Volonte generale*):

"ڕۆسۆ" پێی وایە کاتێك مرۆڤەکان پێکهاتن لەسەر دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی ڕێکخراو، ئەوا بەم هەنگاوەیان دەست بەرداری مافی سەروەرێتی خۆیان بوون بۆ جڤات. واتە ئەمەیان بۆ ئەوە کرد تا ئیرادەی تاکە کەس لەگەڵ ئیرادەی ئەوانی دیدا بەشداربێت لە دروستکردنی ئەوەی پێی دەڵێن ئیرادەی گشتی. "ڕۆسۆ" بۆ بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕەزامەندبوونی تەواوی کەسەکان لەسەر ئەو هەنگاوە، بە کارێکی پێویست دەزانێت.

دوای دروستبوونی دەوڵەت، ئیرادەی زۆرینە نوێنەرایەتی ئیرادەی گشتی دەکات و دەبێت کەمینەش ملکەچی ئیرادەی زۆرینە بێت. گەرواش نەکات ئەوا دوچاری هەڵە دەبێت کە سەرچاوەکەی نەزانینە، هەر کاتێکیش ئەو نەزانینە نەما ئەوا کەمینە هەست بەوە دەکات کە ئیرادەی ئەویش جیاوازی لەگەڵ ئیرادەی زۆرینەدا نیە. لەبەرئەوە "ڕۆسۆ" پێی وایە هەمیشە ئیرادەی زۆرینە تەعبیرە لە ئیرادەی گشتی و ناچارکردنی کەمینە بەوەی ڕێزی ئیرادەی زۆرینە بگرێت، دەبێتە مایەی ئەوەی کەمینە زۆر ئازاد و سەرفرازترین لەوەی گەر تەنها شوێن ڕاوبۆچونی خۆیان بکەون.

ئیرادەی گشتی بریتیە لە ئیرادەی مرۆڤ کە خۆی لە هەموو خۆپەرستی و حەز و ئارەزویەکی تایبەتی داماڵیبێت، ئیرادەی مرۆڤە وەك بوونەوەرێکی ئەخلاقی کە مەبەستی بەرژەوەندی گشتیە. بەو پێیەی ئیرادەی گشتی مەبەستی تەنها بەرژەوەندی گشتیە، ئەوا دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان ئیرادەی گشتی لەگەڵ ئەوەی دەشێت بە *Volonte,de tous* یاخود ئیرادەی تاکە کەسەکان لە کۆمەڵگەدا ناوی بەرین، چونکە ئیرادەی گشتی خۆی لە بەرژەوەندی کەسێتی بەدوور دەگرێت. ئیرادەی گشتی لە سەرو ئیرادەی تاکە کەسیەوەیەو میللەتیش خاوەنی ئەو ئیرادەیەیە، هەر بەم ئیرادەیەشەوە میللەت دەتوانێت ئەو دامودەزگایانەی کۆمەڵگە بپارێزێت کە دراونەتە دەستی ئەو و بەڵێنی پارێزگاری لێکردنیشی داون. هەر بەم ئیرادەیەش میللەت دەتوانێت کۆمەڵگە لە چاوچنۆکی ئیرادە تایبەتیەکان بپارێزێت، ئەویش لە ڕێگای

مەبەست لە دەنگدان لە کاتی پێشنیارکردنی یاسایەکدا، پەسەندکردن یان نەکردنی ئەو پێشنیارە نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانرێت لەگەڵ ئیرادەی گشتیدا دەگونجێت یان نا، تەنها دوای دەنگدانیش ئەو ئیرادەیە دەزانرێت

**یاسا گەلێکەوە کە ئازادی هاولاتی تێدا رەنگ بداتەوەو وەك رەگەزێکی سەرەکی ئیرادەی گشتی سەیر بکرێت. هاولاتی کاتێك گوێڕایەڵی یاساکان دەکات، ئەوا گوێڕایەڵی ئیرادەی گشتی دەکات کە لە یەك کاتدا ئیرادەی خۆی و ئیرادەی هەموانیشە. گەر لەو یاسایانەش یاخی بوو، پێویستە بە زەبری هێز ناچار بکرێت بۆئەوەی گوێڕایەڵی یاسا بێت، لەبەرئەوەی یاخی بوونی لە یاسا بە مانای یاخی بوونیەتی لە ئیرادەو ویستی خۆی. لە کاتێکدا کەمینە ناچار دەکرێت گوێڕایەڵی ئەو یاسایانە بێت کە زۆرینە دەنگی لەسەر داوە، ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئازادی پێشێل کراوە، بەڵکو مانای بەرکەماڵبوونی ئازادی ئەو دەگەیەنێت.**

**"رۆسۆ" دەڵێت: (مەبەست لە دەنگدان لە کاتی پێشنیارکردنی یاسایەکدا، پەسەندکردن یان نەکردنی ئەو پێشنیارە نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانرێت لەگەڵ ئیرادەی گشتیدا دەگونجێت یان نا، تەنها دوای دەنگدانیش ئەو ئیرادەیە دەزانرێت).. هەروەها دەڵێت: (کاتێك رایەکی پێچەوانەی رای من سەردەکەوێت، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە من هەڵە بووم)[١٥]. بەشداریکردنی هاولاتیان لە پرۆسەی دەنگدانی گشتیدا (کاتێك کە دەگەنە تەمەنێکی دیاریکراو)، مەرجێکی سەرەکیە بۆ بەشداریکردن لە دەسەلاتی گشتی و تەعبیرکردن لە ئیرادەی گشتی لەناو کۆمەڵەو رێکخراوە سیاسیەکاندا.**

### سەروەری:

**سەروەریەك مەشروع بێت و رەوایەتی هەبێت، سەروەری گەلە کە لە ئیرادەی گشتیدا بەرجەستە دەبێت و ئامادەگی خۆی لە رێی پەیمانی کۆمەلایەتیەوە دەسەلمێنێت. ئەمەش سەروەری راستەقینەیە، لەبەرئەوەی سەروەری بریتیە لە مومارەسەکردنی ئیرادەی گشتی و پێدانی سەروەری بە کەسێك یان کۆمەڵە کەسێك، ئەو یەکسانیەی نێوان هاولاتیان تێکدەدات کە لە پەیمانەکەدا هاتوە. بۆیە بەشداریکردنی تەواوی هاولاتیان لە دەسەلاتێکی خاوەن سەروەریدا لە رێگای دەنگدانێکی گشتیەوە، تەنها نیشانەیەکی یەکسانیەو لە رێی ئەوەشەوە یاساکان بۆ کۆمەڵگە دادەرێژرێن.**

بەم جۆرە دەبینین "ڕۆسۆ" لەوانەیە کە داکۆکی لە دەسەڵاتی میللی دەکات و سەروەری دەداتە دەستی میللەت، ئەمەش بە پێچەوانەی "جان بودان"ەوەیە کە بە لایەنگری دەسەڵاتی ڕەهای تاکە کەس دادەنرێت و سەروەری دەگێڕێتەوە بۆ پادشا.

"ڕۆسۆ" پێی وایە ئیرادەی گشتی تەعبیرە لە بەرژەوەندی هاوبەشی سەرجەم هاوڵاتیان و، یاساکانیش تەنها ئەوکاتە دەبنە یاسای ڕاست و دروست کە لە ڕێی ئیرادەی گشتیەوە دەرچووبن و خزمەت بە بەرژەوەندی گشتی بکەن. هەروەها بڕیارەکانی حکومەتیشی لە یاسا جیاکردۆتەوە، بەو پێیەی بڕیارەکانی حکومەت لە پێناو جێبەجێکردنی یاسادا دەردەچن و یاساش گوزارشتە لە ئیرادەی گشتی.

سەروەری هەمان ئەو سیفەتانەی تێدایە کە لە ئیرادەی گشتیشدا هەن، گرنگترینیان بریتیە لە:

**١-سەروەری هەڵە ناکات و دوچاری هەڵەکردن نابێت:**

سەروەری بۆیە ناکەوێتە هەڵەوە، چونکە لە گەڵەوە سەرچاوە دەگرێت و ئامانجیشی بەدیهێنانی بەرژەوەندی گشتیە. ئیرادەی گشتی لە ڕوی پێناسەو ناوەڕۆکەوە تەنها مەبەستی بەرژەوەندی گشتیە. هەرکاتێکیش گەل هەستی بەوە کرد کە دەسەڵات کار بۆ بەرژەوەندی گشتی ناکات و لە دەستنیشانکردنی ئەو دەسەڵاتەدا بە هەڵەدا چوە، ئەوا ئەوکات گەل لە بەرامبەر ئیرادەی گشتیدا نییە بەڵکو لە بەردەم ئیرادەی مرۆڤ گەلێکدایە کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان کاردەکەن.

"ڕۆسۆ" بوونی کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان وەکی ناوەندێك لە نێوان لیژنەی سیاسی و تاکەکەسدا ڕەتدەکاتەوە، چونکە ترسی هەیە لەوەی ئەمانە لە ڕێی ئیرادەی تایبەتی خۆیانەوە کاربکەنە سەر ڕەوتی ژیانی کۆمەڵایەتی.

**٢-سەروەری بە هیچ شتێک ناگۆڕدرێتەوەو دەستبەردار بوونیشی مەحاڵە:**

بە هیچ شێوەیەك نابێت سازش لەسەر سەروەری بکرێت، دەکرێت واز لە دەسەڵات بهێنرێت، بەڵام لە ئیرادەی گشتی ناکرێت، سەروەریش بریتیە لە مومارەسەکردنی ئیرادەی گشتی.. ئەمەش مانای وایە کە ئیرادە نوێنەرایەتیکردن قبوڵ ناکات، "ڕۆسۆ" چەمکی *Deputes* یان *Representants du peuple* بەلاوە پەسەند و گونجاو نییە، چونکە ئەوانە تەنها نوێنەرانی گەلن *delegues*.

پێویستە سەرجەم هاوڵاتیان خۆیان بڕیار لەسەر یاساکان بدەن، بۆ ئەم مەبەستەش بۆیان نییە نوێنەرە هەڵبژێردراوەکان بەو کارە ڕاسپێرن. هەربۆیە ئەو پێی وابوو دیموکراسی ڕاستەوخۆ تەنها ڕاستە ڕێگایە بۆ تەعبیرکردن لە ئیرادەی گشتی،

پێویستە سەرجەم هاوڵاتیان خۆیان بڕیار لەسەر یاساکان بدەن

چونکە لە حاڵەتێکی وادا هەر هاوڵاتیەك دەتوانێت بەردەوام پارێزگاری لە بەشێکی سەروەری خۆی بکات.

٣-سەروەری دابەش ناکرێت:

سەروەری بریتیە لە مومارەسەکردنی ئیرادەی گشتی، ئیرادەی گشتیش بەش بەش ناکرێت، کەواتە سەروەری ناکرێت بە چەند بەشێکەوە. "ڕۆسۆ" تیۆریەکەی "مۆنتسکیۆ" دەربارەی لێك-جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان ڕەتدەکاتەوە، لەبەرئەوەی بەش بەشکردنی سەروەری لە نێوان چەند دەسەڵاتێکدا، مانای وایە کە هەر دەسەڵاتەو تەعبیر لە بەشێکی ئیرادەی گشتی دەکات، کەواتە مومارەسەکردنی سەروەری ناکاتە ئەوەی تەعبیر لە ئیرادەی گشتی بکات.

"ڕۆسۆ" کاتێك بە دابەشکردنی سەروەری قایل نییە، تەنها لەبەرئەوە نییە کە بیرۆکەی لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی بەلاوە پەسەند نییە، بەڵکو لە هەمان کاتدا بوونی ئەو دوو ئەنجوومەنی یاسادانانەش بە پێویست نازانێت کە "مۆنتسکیۆ" باسی لێ کردبوو، لەبەرئەوەی ڕەنگە بوونی ئەو دوو ئەنجومەنە ئیرادەی گشتی بەش بەش بکات، بە تایبەتی کە دانانی یاساکان سەرەکیترین تەعبیرە لە ئیرادەی گشتی خۆی.

٤-سەروەری ڕەها بێ سنورە:

"ڕۆسۆ" پێی وایە پەیمانی کۆمەڵایەتی مافی ئەوە دەداتە ئیرادەی گشتی تا دەسەڵاتێکی ڕەهاو بێ سنوری بەسەر تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگەی ساسیدا هەبێت، مەزندەی ئەوەش ناکات ئیرادەی گشتی لەگەڵ بەرژەوەندی ئەو کەسانەدا ناکۆك بێت کە کۆمەڵگەی سیاسی پێك دێنن. لەم بارەیەوە دەڵێت: (پێویستە دەوڵەت زەبر و زۆرێکی وەهای هەبێت بۆئەوەی بتوانێت تەواوی بەشەکانی کۆمەڵگە بە جۆرێك ئاراستە بکات و سازو ئامادەیان بکات کە بە چاکترین شێوە لەگەڵ کۆمەڵگەدا یەك بێتەوە و بۆ هەموان گونجاو بێت. وەك چۆن سروشت هەموو مرۆڤێکی سەرپشك کردوە لەوەی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر هەموو ئەندامەکانی لەشی خۆیدا هەبێت، پەیمانی کۆمەڵایەتیش ئەو مافە دەداتە دەوڵەت تا دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر تەواوی ئەندامەکانیدا هەبێت)[١٦].

"ڕۆسۆ" هەوڵی ئەوەی دا ئەو ناکۆکیەی ناو تیۆریاکەی نەهێڵێت: (ئەو لەلایەك داکۆکی لە تاکە کەس و مافی تاکە کەس دەکات، لە لایەکی تریشەوە مافی ئەوە

"ڕۆسۆ" پێی وایە پەیمانی کۆمەڵایەتی مافی ئەوە دەداتە ئیرادەی گشتی تا دەسەڵاتێکی ڕەهاو بێ سنوری بەسەر تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگەی ساسیدا هەبێت

یاسا تەعبیر کردنە لە ئیرادەی گشتی و بەلای "ڕۆسۆ"وە تەنها ئامرازێکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاری کەسی فەرمانڕەوا

دەداتە کۆمەڵ کە دەسەڵاتێکی ڕەهاو بێ سنوری هەبێت)، چونکە پێی وایە دەسەڵاتی ڕەها بۆی نییە سنوری ئەو ڕێکەوتنامانە ببەزێنێ کە بە پێیان هەموو کەسێك مافی ئەوەی هەیە چۆنی دەوێت دەتوانێت ئەو موڵك و ماڵ و ئازادیەی هەیەتی بەکاریان بهێنێت، لەبەرئەوەی ئەو ڕێکەوتنانە دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ یەك بەیەکی ئەندامانی کۆمەڵگەدا مۆری کردوە.

بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی تاکە کەس (دەستبەرداری بەشێك لە موڵك و ماڵات و ئازادی خۆی دەبێت، ئەمەش بۆ کۆمەڵ گرنگە)[١٧]. تەنها کەسی دەسەڵاتداریش دەتوانێت بڕیار لەسەر ڕادەی ئەو بەشە گرنگە بدات بۆ کۆمەڵ. بەڵام ئاخۆ چی ناهێڵێت دەسەڵاتێکی ڕەها لەناو ستەمکاریدا ڕۆچێت و ڕێگر بێت لە بەردەم ئەوەی نەهێڵێت دەوڵەتی گەل ببێتە (*Leviathan*)؟.

"ڕۆسۆ" وەها وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە (فەرمانڕەوا گەر کەسێکی حەقیقی ئاسایی بوایە نەوەك قەوارەیەکی مەعنەوی و دەستەجەمعی، ئەوا بێگومان دەسەڵاتی ڕەهای خۆی بە خراپ بەکاردەهێنا، چونکە ئەو کارانەی دەیکردن و ئەو یاسایانەشی دەری دەکردن پێچەوانەی ئەو کارو یاسایانە دەبوو کە ئیرادەی گشتی بڕیاری لەسەر داون و جێبەجێیان دەکات، لەم کاتەدا پێویستە سنورێکی دەستوری توندوتۆڵی بۆ دابنرێت). بەڵام ئەوەی لەگەڵ سەروەریەکی ناشەرعی دەگونجێت، ئەوا بۆ ئەو خاوەن دەسەڵاتە شەرعیەی "ڕۆسۆ" ئیعترافی پێ دەکات هیچ مانایەکی نابێت: (لەبەرئەوەی گەل وەکی جەستەیەك، واتە وەکی گردبوونەوەی خەڵکی ئازاد و چونیەك لە مافدا کە ئیرادەی گشتی دەیبزوێنێ و ڕێنمایی دەکات، ناشێت لە ڕێ لابدات و چەواشە بێت)[١٨].

### یاسا:

یاسا تەعبیر کردنە لە ئیرادەی گشتی و بەلای "ڕۆسۆ"وە تەنها ئامرازێکە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ستەمکاری کەسی فەرمانڕەوا، هەروەها ئەوە یاسایەکە ئازادی و دادپەروەری بۆ هاوڵاتیان فەراهەم دەکات و دەتوانێت و گوزارشت لە سستمێکی ئیلاهی بکات لەسەر زەوی.

بەو پێیەی یاسادانان مافی خاوەن دەسەڵاتە (واتە مافی گەلە)، ئەوا ناشێت یاسا ناڕەواو ناهەق بێت. هەروەها بۆ هیچ فەرمانڕەوایەك نییە خۆی بخاتە سەرو یاساوە، لەبەرئەوەی هەموو فەرمانڕەوایەك لەلایەن میللەتەوە ڕاسپێردراوە تا بەو ئەرکەی

هەستێت. "ڕۆسۆ" لایەنگری ئەوەیە کە میللەت مافی یاسادانانی هەبێت، تەنانەت گەر هاتوو کەسانێکی واشی تێدابن توانای ئەوەیان نەبێت. لەم بارەیەوە دەنووسێت: (میللەت کە پێویستە گوێڕایەڵی یاساکان بکات، دەبێت خۆی دانەری ئەو یاسایانە بێت. هیچ کەسێك جگە لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵە بۆی نییە کارێکی وا بکات)(١٩).

بەم جۆرە دەبێت بابەتی یاسا گشتی بێت و دوور بێت لە خواستە تایبەتیەکان، چونکە شتە تایبەتیەکان هەرگیز جێ گرنگی پێدانی یاسا نین و بە هێند وەریان ناگرێت. ناکرێت یاسا ناهەق و ناڕەوا بێت، مادامەکی خاوەنی سەروەری (واتە میللەت بە تەواوی ئەندامەکانی‌یەوە) یاساکان دادەنێت، ئەوا هیچ کەسێك زوڵم لە خۆی ناکات. کەسی فەرمانڕەواش کە لە ڕاستیدا (تەنها نوێنەری میللەتە) نابێت لە سەرو یاساوە بێت، بەڵکو دەبێت ملکەچ و گوێڕایەڵی یاسا بێت. گەل کە تەواوی ئەندامەکانی گوێڕایەڵی یاسان، دەبێت هەر ئەوانیش ئەو یاسایانە دابڕێژن و بڕیاری لەسەر بدەن.

بۆئەوەی کۆمەڵگا هەستێت بە دانانی یاسا، پێویستە پشت بە یاسا دانەرێك ببەستێت. هەرچەندە یاسادانەر یاساکان دادەنێت، بەڵام ئەو خاوەنی سەروەری نییە و ناتوانێت حوکمی گەل بکات، هەروەها ناتوانێت بڕیاری کارپێکردنی ئەو یاسایانەش بدات کە دایان دەنێت. چونکە ناتوانین دڵنیابین لەوەی ئیرادەی یاسادانەر (کە ئیرادەیەکی تایبەتە)، دەگونجێت لەگەڵ ئیرادەی گشتیدا یان نا. ئەمەش تەنها ئەو کاتە دەکرێت کە ئەو یاسایانە بخرێتە دەنگدانێکی ئاشکرا و ئازادەوەو گەل بەشداری تێدا بکات، لەبەرئەوەی تەنها ئەو دەتوانێت هێزی جێبەجێکردن بداتە ئەو یاسایانە و بڕیار لەسەر کارپێکردنیان بدات. بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی، جگە لە ئیرادەی گشتی کەسی تر بۆی نییە هیچ هاوڵاتیەك ناچار بکات بە کارێك کە خۆی ویستی لەسەر نەبێت.

### حکومەت لای "ڕۆسۆ":

"ڕۆسۆ" بە شێوەیەکی وردو ئاشکرا دەوڵەتی لە حکومەت جیاکردۆتەوەو جیاوازی لە نێوان ئەو دوانەدا دەکات. دەوڵەت بە مانای تەواوی کۆمەڵگە دێت کە هاوڵاتیان بەپێی پەیمانی کۆمەڵایەتی ڕێککەوتوون لەسەر دامەزراندن و

بەم جۆرە دەبێت بابەتی یاسا گشتی بێت و دوور بێت لە خواستە تایبەتیەکان، چونکە شتە تایبەتیەکان هەرگیز جێ گرنگی پێدانی یاسا نین و بە هێند وەریان ناگرێت.

دروستکردنی و لە وێنەی ئیرادەی گشتیدا خۆیمان نیشان دەدات، بەڵام حکومەت بریتیە لەو کەسەی یاخود ئەو لیژنەیەی کۆمەڵگە دەستنیشانی کردوە بۆئەوەی ئیرادەی دەسەڵات و سەروەری جێبەجێ بکات.

حکومەت بە تەنها لیژنەیەکەو ئەرکی ڕاپەڕاندنی ئەو یاسایانەیە کە لەلایەن ئیرادەی گشتیەوە دەردەچێت، هەروەها ئازادیە مەدەنیەکان و ماڵ و سامانی هاوڵاتیانیش دەپارێزێت. حکومەت تەنها دەستەیەکەو دەسەڵاتی نییە، چونکە تاکە دەسەڵاتێك کە لە کۆمەڵگەدا هەبێت دەسەڵاتی گەلەو هەر ئەویش سەرپشکە لە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەی دەوڵەت دایدەنێت.

"ڕۆسۆ" لە سێهەمین کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا فۆرمی حکومەتەکان دەخاتەڕوو، پێی وایە کە ئەم فۆرمانە لە فۆرمە تەقلیدیەکانی سستمی حوکمکردن: (دیموکراسی، ئۆرستۆکراسی، پادشایاتی) جیانابێتەوە، ئەو لێرەدا فۆرمی چوارەمیش زیاد دەکات کە فۆرمی (حکومەتی تێکەڵە).

بەڵام یەك فۆرمی گونجاو لە باری حکومەتی دەستنیشان نەکردوە، لەبەرئەوەی ڕەنگە هۆکاری عەمەلی و هەلومەرجی تایبەتی وەك هەڵکەوتەی ناوچەکەو سامانی سروشتی و لایەنی جوگرافی و کۆمەڵایەتی، یەکبگرن و ببنە مایەی ئەوەی فۆرمێك لە فۆرمەکانی حکومەت لە هەموویان گونجاوتر بێت. بەڵام هیچ یەك لەم فۆرمانەی حکومەت شەرعی نابێت، گەر بێتو دەسەڵات و سەروەری خۆی لە گەلەوە وەرنەگرتبێت.

"ڕۆسۆ" حکومەتی دیموکراسی پێ باشترە، ئەو حکومەتەی هەموو جۆرەکانی ستەمکاری ڕەتدەکاتەوە کە هیچ بنەمایەکی نە لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا هەیەو نە لە یاسادا. ئەگەرچی زۆرجار حکومەتی دیموکراسی لەگەڵ ڕەگەزی مرۆڤایەتیدا ناگونجێت. لەم بارەیەوە "ڕۆسۆ" دەڵێت: (پێویستە دەسەڵات یان دەوڵەت دیموکراسی بێت، بەڵام ڕەنگە حکومەتی دیموکراسی لەگەڵ مرۆڤدا نەگونجێت)[٢٠].

هەموو حکومەتێك بەردەوام سەری لە گەندەڵی دەخورێ و دەخوازێت بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی ئەندامانی پێش بەرژەوەندی گشتی بخات. هەر بۆیە بەردەوام ئەگەری دروستبوونی گەندەڵی لە ئارەدایە: (هەر کاتێك حکومەت بەردەوام بەرەو ئەوە چوو سەروەری پێشێل بکات و هەیبەتێك بە خۆی بدات، ئەوا ئەمە بەرەو ستەمکاری دەبات و ئەمەش دەبێتە مایەی داڕمانی دەسەڵاتی سیاسی)[٢١]. بۆئەوەی ئەم لادانە

"ڕۆسۆ" حکومەتی دیموکراسی پێ باشترە، ئەو حکومەتەی هەموو جۆرەکانی ستەمکاری ڕەتدەکاتەوە کە هیچ بنەمایەکی نە لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا هەیەو نە لە یاسادا.

ڕوونـەدات، "ڕۆسـۆ" پێـی وایـە چارەسـەر ئەوەیـە کـە ناوبـەناو تـەواوی هاوڵاتیـان کۆببنەوە و بە ئازادانە دەنگ لەسەر دوو مەسەلە بدەن[٢٢].

یەکەم/ ئایا بەرژەوەندی گشتی لەوەدایە ئەو فۆرمەی حکومەت کە هەیە، وەکی خۆی بهێڵرێتەوە یاخود بگۆڕدرێت بە فۆرمێکی تر؟

دووەم/ ئایا بەرژەوەندی گشتی دەخوازێت ئەندامانی ئەو حکومەتەی لەسەر کارن، لە جێی خۆیان بمێننەوە یان کەسانی تریان لە جێ دابنرێت؟ نابێت گەل هەڵوێستی سلبی وەرگرێت، بەڵکو پێویستە لە پێناو پاراستنی یاسادا شەونخونی بکات و هەموو هاوڵاتیەك بە بایەخەوە سەیری کاروباری حوکم بکات لە وڵاتەکەیدا، هاوکات دەبێت میللـەت بـەردەوام کۆبوونـەوە بکـات بـۆ تـاوتوێکردن و مشـتومڕکردن لەسـەر کاروبارەکانی حکومەت، هەموو ئەمانەش مەرجی سەرەکین بۆ درێژەدان و بەردەوام بوونی حوکمی ڕاست و دروست. کەواتـە پێویسـتە هـاوڵاتی ئـازاد بێـت و بتوانێـت گوزارشت لە دیدو بۆچوونەکانی خۆی بکات و هەڵوێستی خۆی لە کێشە گشتیەکان دیاری بکات، مادامەکی گەل سەروەرو دەسەڵاتداری یەکەمە.

گەل نـاتوانێت دەسـتبەرداری سـەروەری و دەسـەڵاتی خـۆی بێـت بـۆ حکومـەت، لەبەرئەوەی حکومەت تەنها لە ڕێی یاسایەکەوە دروست بوە کە لـە ئیرادەی گشتیەوە دەرچوە، نەك بەرهەمی پەیمانی کۆمەڵایەتی بێت. ئەندامانی حکومـەتیش سـەروەرو دەسـەڵاتداری گەل نین، بەڵکو بە تەنها کۆمەڵێك فەرمانبەرن و کار بۆ خزمـەتکردنی میللەت و جێبەجێکردنی یاساکانی دەکەن. بەم جۆرە هەموو حکومەتێك کاتێـو گەل هەر کاتێکی بە گونجاو زانی دەتوانێت بیگۆڕێت، ئیتر ئەمە بە گۆڕینی ئەندامەکانی بێت یاخود بە گۆڕین و دەستکاریکردنی فۆرمی حکومەتەکە بێت.

لەژێر کاریگەری سستمی دیموکراسی سویسریداو قەناعەتی تەواوی بەوەی یاسا لـە کۆی میللەتـەوە دەردەچێت، "ڕۆسۆ" سسـتمی دیموکراسـی ڕاسـتەوخۆی لەهـەر سستمێکی دیکە پێ چاکتر بوو. تەنانەت لە سستمی پەرلەمانیشی لە پێشتر دادەنێت. ئەگـەرچی ئەو سسـتمی دیموکراسـی ڕاستەوخۆشی بەلاوە پەسـەندە، بـەڵام نیشـانی دەدات کـــە بـــە تەنـــها بەکـــەڵکی وڵاتـــە بچووکـــەکان دێـــت. هـــەرچی وڵاتـــە گەورەکانـە لەبەرئـەوەی حکومەتـەکانیان خوازیـارن دەسـەڵاتی خۆیـان لـە بەرامبـەر دەسەڵاتی گەلدا زیاتر و فراوانتر بکەن، ئەوا لێرە نـاکرێت دیموکراسـی ڕاسـتەوخۆ جێبەجێ بکرێت.

گەل ناتوانێت دەستبەرداری سەروەری و دەسەڵاتی خۆی بێت بۆ حکومەت، لەبەرئەوەی حکومەت تەنها لە ڕێی یاسایەکەوە دروست بوە کە لە ئیرادەی گشتیەوە دەرچوە، نەك بەرهەمی پەیمانی کۆمەڵایەتی بێت.

"ڕۆسۆ" پێی وایە بۆئەوەی ڕێ لە حکومەتی ئەم وڵاتانە بگیرێت تا دەسەڵاتەکانی خۆیان خراپ بەکارنەهێنن، پێویستە گەل مافی خۆی لە کۆبوونەوە گشتیە ناوبەناوەکاندا بەکاربهێنێت، بۆئەوەی هەڵوێست لە حکومەت یاخود لە فەرمانبەرە گشتیەکان وەرگرێت. لە ماوەی ئەو کۆبوونەوە گشتیانەشدا، پێشنیاری ئەوە دەکات تەواوی دەسەڵاتەکانی حکومەت ڕابگیرێت و کاریان پێ نەکرێت و دەسەڵات بدرێتەوە دەستی گەل، زۆر لە ولایەتەکانی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پەیڕەوی ئەمەیان کردوە. هەروەها بۆ وڵاتە گەورەکان پێشنیار دەکات کە پایتەختێکی گەڕۆکیان هەبێت گەر هاتوو شاری زۆریان هەبوو، یاخود پەیڕەوی سستمی فیدرالی بکەن.

## کۆتایی:

"ڕۆسۆ" دەیویست جیاوازو تایبەت بێت و لە بیریارانی دیکە نەچێت[٢٣]. بێگومان ئەو لە بیروبۆچوونەکانیدا دەربارەی دۆخی سروشتی و مافی سروشتی و مەرج و ناوەڕۆکی پەیمانی کۆمەلایەتی و کێ خاوەنی دەسەڵات بێت و خەسڵەت و ئەدگارەکانی چۆن بن، جیاوازەو لە کەسی تر ناچێت. هەروەها بۆچوونەکانی دەربارەی حکومەت و زەرورەتی هەبوونی یاسادانەر و پۆلێنکردنی بۆ فۆرمەکانی حوکمکردنیش هەر جیاواز بوو، چونکە ئەو ناوەڕۆکێکی جیاوازی بەخشیە فۆرمەکانی پێشووی حوکمکردن، کارێك کە بوە مایەی هاتنە ئارای لێکدانەوەی جیاجیا بۆ حوکمی دیموکراسی و خودی دیموکراسی خۆیشی.

"مۆنتسکیۆ" لەگەڵ ئەوەدا بوو کە دەسەڵاتی گەل تێکەڵ بە ئازادییەکانی نەکرێ و پێکەوە گرێ نەدرێن، بەڵام "ڕۆسۆ" پێی وابوو ئازادی گەل بەبێ دەسەڵاتی گەل واتە بەبێ (دەسەڵاتی دەوڵەت) بوونی نییە. بەلای ئەوەوە هەموو ئەندامێك لە دەوڵەتدا (واتە هەموو هاوڵاتیەك) چەندە ئازاد بێت لەوەی ملکەچی هیچ مرۆڤێك نەکات و چەندێك دەوڵەت بەهێزتر بێت، هێندە زیاتر ئازاد و سەربەخۆتر دەبێت. لە لایەکی ترەوە دەوڵەت تەنها ئەوکاتە دەوڵەتێکی شەرعی دەبێت کە یاسا لە سەرو مرۆڤەوە دابنێت: یاسا بۆ خۆی تەعبیرکردنە لە ئیرادەی گشتی و دەوڵەتیش شەرعیەتی خۆی لەوەوە بە دەست دێنێت کە حکومەتەکەی سوربێت لەسەر پابەندبوون بە یاساوە.

بەم هەنگاوانە "ڕۆسۆ" دەیویست ڕێ لە هەر سنور بەزاندنێکی چاوەڕوانکراوی دەسەڵات بگرێت، چونکە ماهیەتی هەر دەسەڵاتێك هەڵگری ئەگەرێکی لەو جۆرەیە. هەر ئەمەشە وا دەکات (*Alain*)ی فەیلەسوف کە لە سەردەمی کۆماری سێیەمی

"مۆنتسکیۆ" لەگەڵ ئەوەدا بوو کە دەسەڵاتی گەل تێکەڵ بە ئازادییەکانی نەکرێ و پێکەوە گرێ نەدرێن، بەڵام "ڕۆسۆ" پێی وابوو ئازادی گەل بەبێ دەسەڵاتی گەل واتە بەبێ (دەسەڵاتی دەوڵەت) بوونی نییە.

زۆر لە بیروبۆچوونەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بە ئاشکرا باس لە ئەولەویەت و سەروەری و دەسەڵاتی دەوڵەت دەکەن و هەموو دژایەتی کردنێکیشی بە ناڕەوا دەدەنە قەڵەم

فەرەنسادا ژیاوە، سەرسامی خۆی بە "ڕۆسۆ" نەشاریتەوەو بە تەنها کەسێکی دابنێت کە بە ناخی دەسەڵاتدا ڕۆچوو بێت. لەم بارەیەوە (*Alain*) دەڵێت: (لەم ڕووەوە، ڤۆڵتێر بە هیچ شێوەیەك بە ڕۆسۆ بەراورد ناکرێت. ڤۆڵتێر لەوانە بوو کە بەردەوام ناڕەزا بوون و تەنها خولیاشی گەڕان بوو بە دوای پادشایەکی چاك و دادپەروەردا)[٢٤].

لە بەرامبەر ئەم ستایشە زۆرەی (*Alain*)دا، بۆچوونی زۆر توندی (*Benjamin Constant*) و (*P.J. Proudhon*) لەسەر "ڕۆسۆ" بەرچاو دەکەوێت. (*Constant*) کەوتە ڕەخنەکردنی میتافیزیکای سەرمەدی پەیمانی کۆمەڵایەتی لای "ڕۆسۆ" و پێی وابوو کە (ئەم کارەی زۆرجار پشتی پێ بەستراوە بۆ داکۆکیکردن لە ئازادی، دزێوترین ئامرازێکە بۆ زەمینە سازکردن لە بەردەم هەموو جۆرەکانی ستەمکاریدا). هەرچی (*Proudhon*) پێی وایە (ڕۆسۆ هیچ لە پەیمانی کۆمەڵایەتی حاڵی نەبوەو تەنها کارێك ئەو کردبێتی بەرگێکی شەرعی کردوە بەبەر پشێوی کۆمەڵایەتیدا، ئەویش لە ڕێی فێڵێکی گەورەوە کە فێڵی ئیرادەی گشتیە، هەموو ئەمانەش شەرعیەتێك بەو دەسەڵاتە دەدەن و دەبنە مایەی بەهێزکردنی. لە کاتێکدا دەبێت ئەو دەسەڵاتە نەهێڵدرێت و لەناوببرێت)[٢٥].

زۆر لە بیروبۆچوونەکانی پەیمانی کۆمەڵایەتی بە ئاشکرا باس لە ئەولەویەت و سەروەری و دەسەڵاتی دەوڵەت دەکەن و هەموو دژایەتیکردنێکیشی بە ناڕەوا دەدەنە قەڵەم بۆ نمونە: (١-دەوڵەت دەسەڵاتێکی ڕەهای بەسەر تەواوی ئەندامەکانیدا هەیە. ٢-بەتەنها فەرمانڕەوا دەتوانێت بڕیار لەسەر ئەوە بدات کە پێویستە هەر کەسەو دەستبەرداری چەند لە خۆراك و ماڵ و سامان و ئازادی خۆی بێت. ٣-ژیانی هاوڵاتی خۆیشی خەڵاتێکی مەرجدارەو لە لایەن دەوڵەتەوە پێی دراوە.. هتد).

هەموو ئەمانە ناچارمان دەکەن بڵێین "ڕۆسۆ" تەمومژاوی و ناکۆك دێتە بەرچاو. بەڵام گومان لەوەدا نییە کە فەردگەرایی سەرەکی لای "ڕۆسۆ" دوچاری گۆڕانی گەورە بوەو بە تەواوەتی لە فەردانیەتی لیبرالیانەی "جۆن لوك" کە لە سەرەتادا مامۆستای "ڕۆسۆ" بوو، دوورکەوتۆتەوە.

"ڕۆسۆ" چوارچێوەی ئەو بیروبۆچونانەی لەمەڕ ئازادی و یەکسانی لای بیرمەندانی پێش خۆی هەبوون خواستنی و ناوەکەشی بەو ناوەڕۆکە ڕەهایەی پەیمانی کۆمەڵایەتی پڕکردەوە کە "هۆپس" باسی لێدەکرد، ئەمە بەبێ ئەوەی لایەنگری ئەو دەسەڵاتە تاکە کەسیە ستەمکارەی "هۆپس" بێت کە دەوڵەتی

(*Leviathan*) دروستکرد. مەسەلەی گرنگ بە لای ئەوەوەو بە شێوەیەکی تایبەتی پەیوەندی بە ڕەهایی دەسەلاّتی ئیرادەی گشتیەوە هەبوو: مافی هەموو هاولاّتیەکە ئیرادەی گشتی بە ئیرادەی خۆی بزانێت، بە هێندی ئەوەی ئیرادەی هەر کەسێکی ترە لە ناو کۆمەڵدا. نهێنی ئیرادەی گشتیش لێرەدایە کە دێت بۆئەوەی ببێتە ئەلتەرناتیڤی نهێنی پاشایەتی یاخود جێگەی بگرێتەوە، بە هۆی ئەم نهێنیەشەوە شەرعیەتێکی نوێ دروست دەبێت، ئەویش شەرعیەتی دیموکراسیە)[٢٦].

سەرەڕای ناکۆکی دیدو بۆچوونەکانی "ڕۆسۆ"، بەلاّم بەشداریەکی گەورەی کرد لە دەوڵەمەندکردنی فیکری سیاسیدا، بە تایبەت بۆچوونەکانی دەربارەی (چەمکی سەروەری و بەرژەوەندی گشتی و ئیرادەی ڕەهای گشتی). ئەم بۆچوونانەش بوونە خەسڵەتی سەرەکی هەر تیۆریایەك کە لە دەوڵەت بکۆڵێتەوەو باس لە دەوڵەت بکات. هەر لە ڕێی ئەم بۆچونانەشەوە یەکیەتی سەرتاسەری میللەت، بوە هەنگاوی یەکەم لە سیاسەت ناسیدا، هەروەها ئاماژەکردنیشی بۆ ئەو یەکیەتیە چەمکی دەوڵەتی نەتەوەیشی لەخۆ گرتبوو.

جگە لەمانەش کاریگەری "ڕۆسۆ" بەسەر هەریەك لە لیبرالیزم و بنەما سەرەتاییەکانی ڕێبازی سوسیالستیەوە بە ئاشکرا دیارە. نووسینەکانیشی کاریگەری گەورەیان لەسەر پێکهاتەی فیکری پیاوانی شۆڕشی فەرەنسی هەبوو، پەیڕەوکردنی شێوازەکانی دیموکراسی یان مەسەلەگەلێکی وەك (ئایدیای مافەکانی تاکە کەس و سەروەری گەل و یاسا تەعبیرە لە ئیرادەی گشتی و نەهێشتنی جیاوازی چینایەتی و کەمکردنەوە و نەهێشتنی دەسکەوت و دەسەلاّتی بنەماڵەو ئاینزاکان و.. هتد). بێگومان نوسینەکانی لەمەڕ خەم و ناسۆری هەژاران و بانگەشەکردنی بۆ سڕینەوەی جیاوازی چینایەتی و هێنانە ئارای یەکسانی و دادپەروەری کۆمەلاّیەتی لە خاوەنداریێتیدا، بە ڕوونی بانگەشەکردنی بۆ سوسیالیزم پێوە دیارە. بەم جۆرە بیروبۆچوونەکانی "ڕۆسۆ" ناکۆك و دژ بە یەك دێنە بەرچاو. لە کاتێکدا هەندێك بۆچوونەکانی بە بۆچوونی چەپڕەوانە دەدەنە قەڵەم، هەندێکی تر ئەوانە بە بۆچونی ڕاستڕەوانە دەزانن. ئەمەش لەبەرئەوەیە لە لایەك داکۆکی لە بیروڕای ئازادکردوەو لە لایەکی تریشەوە پێی لەسەر دەسەلاّتی ڕەهای دەوڵەت داگرتوە.

سەرەڕای ناکۆکی دیدو بۆچوونەکانی "ڕۆسۆ"، بەلاّم بەشداریەکی گەورەی کرد لە دەوڵەمەندکردنی فیکری سیاسیدا، بە تایبەت بۆچوونەکانی دەربارەی (چەمکی سەروەری و بەرژەوەندی گشتی و ئیرادەی ڕەهای گشتی)

## پەراوێز و سەرچاوەكان

١-اندريه كريسون: روسو- ترجمة: نبيه صقر- منشورات عويدات، بيروت- ١٩٧٨، ص ٨٠.

٢-د. علي عبدالمعطي محمد: الفكر السياسي الغربي- ص ٢٠٠.

٣-جان جاك شوفالييه: تأريخ الفكر السياسي- ص ٤٧٩.

*4-Dunning; A history of Political theories Book 11, P.8.*

*5- 1.*

له: د. على عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو- ص ٢٠٠، وەرگیراوە.

٦-جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشوو- ص ٤٨٠.

٧-هەمان سەرچاوەی پێشوو- ص ٤٨١.

٨-هـ. س. پ- ص ٤٨١.

٩-هـ. س. پ- ص ٤٨١.

١٠-هـ. س. پ- ص ٤٨١.

١١-هـ. س. پ- ص ٤٨١.

*12-Rousseau: Contrat Social, L. I.*

١٣-د. مصطفى البارودي: لمحات من الفكر السياسي حول الفرد و الدولة- مطبعة الجامعة السورية، دمشق- ١٩٥٨، ص ٢٢٤.

١٤-سەرچاوەی پێشوو- ص ص ٢٢٥-٢٢٦.

١٥-جان جاك شوفالييه: سەرچاوەی پێشوو- ص ٤٩٤.

١٦-سەرچاوەی پێشوو- ص ٥٠١.

١٧-هـ. س. پ- ص ص ٥٠١-٥٠٢.

١٨-هـ. س. پ- ص ٥٠٢.

١٩-د. ابراهيم اباظة و عبد العزيز الغنام: تأريخ الفكر السياسي، ص ٢٤٧.

*20-Rousseau: Contrat Social. III. IV.*

*21-Dunning: A history of Political theoris, Book III, P. 37.*

٢٢-د. علي عبدالمعطي محمد: سەرچاوەی پێشوو- ص ٣١٦.

٢٣-جان جاك روسو: المحاورة الثانية، الأعمال الكاملة، المجلد الأول- ص ٨٥٩.

٢٤-آلن: سياسة- باريس، ١٩٥٢- ص ٢٢٦.

٢٥-جان جاك روسو: سەرچاوەی پێشوو- ص ٥٢٢.

٢٦-هـ. س. پ- ص ٥٢٣.

**سەرچاوە:**

د. موسى ابراهيم: معالم الفكر السياسي الحديث و المعاصر- مؤسسة عزالدين للطباعة و النشر، بيروت- الطبعة الاولى، ١٩٩٤.

چارڵز چینکز

# پۆست مۆدێرنیزم چیە؟



و. له فارسییەوە: فەرشید شەریفی

زۆریك له خەلكی، حەزناكەن كه میژووی تـەواوی سـەردەمی پۆسـت مۆدیـرن، دەستنیشـان بكەن یان پیناسەیەكی روون و ئاشكرای بـۆ بكـەن. كـاتیك، ئەوانـە رووبـەرووی ئـەو پرسـیارانە ئەبنەوە سەبارەت به پرەنسیپی زەمان یان شوینی پەیدابوونیو سـەرهەلدانی پۆسـت مۆدیـرن، یان پیناسەكردنی، ئەوە به لەبەرتر ئەزانن كه به هەندێ لیدوانـی گشـتی خۆیـان قوتـار بكـەن. زۆرجار، به شیوەیەكی تەم و مژاویو كینایەوە ئەوە دەرئەبرن كه "هەلبەته پۆست مۆدیرنیزم، زیاتر حالەتیك یان دۆخیكی زەینیو ئەندیشەییە، نەك رووداویكی میژوویی دیاریكراو". هەلبەته، لەم نیوەدا هەندێ كەسی ئاوارتەش هەیه، بـۆ نمونـە چـارلز جینكـز كـه لـەو بروایەدایـە پۆسـت مۆدیرنیزم له بواری كۆشكسازیدا، دروست له كاتژمیری (٣،٣٢)ی پاش نیـوەرۆی ١٥ی ژوئیـەی ١٩٧٢دا لەگەڵ مەرگی كتوپری سەردەمی مۆدیرن له كۆشكسازیدا، سەریهەلدا، واته، كاتیك كـه

پرۆژە گەورەکەی بینای "پرۆئی- ئیگۆ" لە (سان لویس)دا کە وەك شوینیکی نەشیاو بۆ نیشتەجیکردنی کەسانی هەژار بە دینامیت تەقینرایەوە، پرۆژەیەك کە سەردەمانیك وەك "کاملترین ئامرازی مۆدیرن بۆ ژیان" ناودیر ئەکرا. ئەم هەلوەشانەوەیە هاوکات بوو لەگەڵ هەلوەشانەوەی پرەنسیپە باوەریەکان "مۆدیرنیزمی پیشکەوتوو" و هەروەها خواستەکانی بەرەو یەك دەستکردن و یەك جۆر بوونی تەواوی کاروباری دیاردەکات(١).

لە سالەکانی دەیەی ١٩٧٠دا، قوتابخانەو بزاوتەکانی "پۆست مۆدیرنیست" بە خیراییەکی سەرسورهینەر لە تەواوی بوارەکانی کۆمەلگەی خۆرئاوادا بوون بە بەشیك لە دەنگە کەلتوریەکان. جینکز- نەك هەر تەنها ئەندازیاری تەلارسازیو رەخنەگری تەلارسازیە- بەلکو بە یەکیك لە تیۆرسینە گەورەکانی پۆست مۆدیرنیتەش لە قەلەم ئەدریَ- لەم وتارە کورتەی خوارەوە، وەسف و پیناسی خۆی لەسەر ناوەرۆك و دەنگە سەرەکیەکانی پۆست مۆدیرنیزم، ئەخاتەروو.

چارلز جیکنز، یەکیکە لە بەرجەستەترین راڤەکەرانی پۆست مۆدیرنیتە (ئەو، ئەوە بە لەبەرتر ئەزانیَ کە لە نیوان ئەم دوو واژەیەدا هیلی تیرە (-) بەکاربهینریت)، هەروەها یەکیکە لە کۆشکسازە گەورەکانی جیهان. لە بەریتانیا ئەژیو بە شیوەی بانگهیشت کراو (دەعوەت) لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە لۆس ئەنجلسدا، وانە ئەلیتەوە.

* * *

**چاخی مۆدیرن کە سەردەمانیك وا دەرئەکەوت کە بۆ هەمیشە لەو دۆخە میژوییەیدا بە پایەداری ئەمینیتەوە، خەریکە بە خیرایی کۆتایی دیت و بە دووتویی لاپەرەکانی میژوو ئەسپیرریَو ئەرشیف ئەکریت و چیدی ئامادەیی لەو دۆخە میژووییەدا، نابیت. سەردەمی بن پیشەسازی بە خیراییەکی بەرچاو جیگەی پیشەسازی بوون ئەگریتەوەو کارکردن لە کارخانەکاندا جیی خۆیان بە کارکردن لە مال و ئیدارەکاندا ئەدەن. لە بواری هونەردا {سونەتی نویَ} پیکهاتەیەکی تیکەلی لە سونەتە بیشومارەکان لیئەکەویتەوە. تەنانەت کەسانیکیش کە هیشتا خۆیان بە هونەرمەندان و کۆشکسازانی مۆدیرن ئەزانن، سەیریکی چواردەورو پشتسەری خۆیان ئەکەن تا بزانن کە دەبیَ پەیجوری کام یەك لە شیوازو بەهاکان، بن.**

**سەردەمی پۆست مۆدیرن، بە سەردەمی هەلبژاردنی بیشومارو فرەییەکان دائەنریت. سەردەمیکە کە، ناتوانین بەبیَ هەبوونی هۆشیاریو تەنز بە هیچ جۆرە**

سەردەمی پۆست مۆدیرن، بە سەردەمی هەلبژاردنی بیشومارو فرەییەکان دائەنریت.

جەرەیانێکی {ئەرتەدۆکسی} قایل بین، چونکە تەواوی سونەتەکان ئەرزش و بایەخی خۆیان هەیە. تا ڕادەیەك، ئاکامی ئەم مەسەلەیە ئەو شتەیە کە بە تەقینەوەی زانیاری، سەرهەڵدانی زانستی ڕێکخراو، پەیوەندیە جیهانیەکان و سیبرنتیك، ناودێر ئەکرێت. تەنها دەوڵەمەندو خاوەن داراییەکان لە ڕۆژگارێکی تایبەتدا تێکەڵی یەکدی نابن، بەڵکو تەواوی هاوڵاتیان ئەو تێکەڵبوونە ئەیانگرێتەوەو ڕووبەڕووی پلورالیزم ئەبنەوە. ئەم قوتابخانە زاڵ و بەرفراوانەی سەردەمی ئێمە واتە بلورالیزم، هەم گەورەترین کێشەیەو، هەم گەروەترین ڕێگەی دەربازبوون: هەر پیاوێك بە {کۆسمۆپۆلیت} و هەر ژنێکیش بە تاکێکی ئازاد ئەگۆڕێت و سەراسیمەیی‌و دڵەڕاوکێ بەسەر حاڵەتی ڕۆحی‌و زەینی مرۆڤەکاندا زاڵ ئەبێ‌و تاوان و تۆڵەسەندنەوە، وەك شێوەی باوی کەلتوری خەڵکی، دەرئەکەوێت.

ئەمە بەهایەکە کە ئێمە بۆ سەردەمی پۆست مۆدێرن ئەیدەین، بەهایەك کە بە ئەندازەی یەکجۆری‌و کەم چەشنی‌و جەزمیەتی گەرایی‌و هەژاری‌و نەگبەتی سەردەمی مۆدێرن، قورس و یەکجار زۆرە، بەڵام سەرەڕای ئەو هەوڵ و تەقەلا زۆرانەی کە لە ئێران و وڵاتانی دیکەشدا ئەدرێن، گەڕانەوە بەرەو کەلتوری ڕابوردوو شێوەی پیشەسازی، یان داسەپاندنی مەزهەبێکی بونیادگەرا یان تەنانەت جۆرە جەرەیانێکی ئەرتەدۆکسی مۆدێرنیستی {یان مۆدێرنیزمی ئەرتەدۆکس}ی کارێکی مەحاڵە. هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی خودی سیستمی پەیوەندییە جیهانیەکان و شێوەی بەرهەمهێنانی سیبرنتیك دا پێداویستی‌و داخوازیە تایبەتیەکانی خۆشی خوڵقاندوە، ئەوانە جیا لە جەنگی ئەتۆمی، ڕوداوگەلێکی نەگۆڕن و بەرەو دواوە ناگەڕێنەوە.

ڕێگەچارەی ئاستەنگی {هاملێت}ی پۆست مۆدێرن و ڕووبەڕووبوونەوە لە تەك ئەو کێشەو گرفتانەی لە دارایی و سامانەوە هەڵقوڵاون، بریتیە لە هەڵبژاردن و تێکەڵکردنی سونەتەکان لەسەر بنەمای هەڵبژاردن و تێکەڵکردنی هەندێ لایەنی ڕابردوو و ئێستا کە پێدەچێت بۆ ئەم مەبەستە شتێکی شیاوبێت. لە کاتێکدا، کە ئاکام و بەرهەمی ئەو {کار}ە لە سەرکەوتنەوە نزیکبێت، تێکەڵاویەکی سەرنجڕاکێش لە سونەتەکان بەدیدێت، خۆ ئەگەر سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ شتێکی تێکەڵ و پێکەڵ و شڵەژاوی (***Smorgs bord***) لێدەرئەچێت.

بە زۆری بەلەمە هەواییەکانی (شراع) پۆست مۆدێرن، لە دڵەڕاوکێی نێوان تێکەڵکردنی داهێنەرانەو لاساییکردنەوەی شڵەژاودا، ڕێگەی خۆیان ونکردوەو

دوچاری نەهامەتیو چەرمەسەری بوون، بەڵام هەندێ جار بەلینی بەدیهاتنی کەلتوریکی گەورەی پلورالیزم، بە ئازادییەکی بیشومارەوە ئەدەن.

لە بنەرەتدا، پۆست مۆدیرنیزم پیکەوەبوون و تیکەڵاوی هەرجۆرە سونەتیکە لەگەڵ سونەتەکانی رابوردودا: هەم بەردەوامیو دریژەپیدانی مۆدیرنیزمەو، هەم فراژیبون و کاملبوونی. ئەتوانین لەناو تایبەتمەندی ئەسلی بەرهەمی پۆست مۆدیرنەکاندا، کۆدو رەمزی چەندلایەنی، شاراوە، کیناییو تەنزئاسا، بەدبیژی، هەلبژاردنە جۆراوجۆرو پەرش و بڵاوەکان، دژایەتیو نابەردەوامی یان لیکدابرانی سونەتەکان، بدۆزینەوە، چونکە ئەم ناهاوئاهەنگیانەو ناچونیەکیو نایەك چەشنیانەو.. تەواوی فەزای پلورالیزمی ئیمەیان لەخۆ گرتوە. لە خالی بەرامبەری ئەم شیوازە تیکەل و جۆراوجۆرەی پلورالیزمەدا، لانی کەم –گەرایی (حد اقل گرایی) ئایدیۆلۆژیای مۆدیرنی درەنگوەخت و تەواوی ئەو رەقیبانە وەستاون کە پشتیان بە سەلیقە یان پرەنسیبگەلی دۆگمایی تایبەت بەستوە.

ئەم (لانی کەم)ە، هەر ئەو شتەیە کە من بە پیی ئەوە، پۆست مۆدیرنیزم بە بزاوتیکی کەلتوریو یەك دەورە یان سەردەمیکی میژوویی ئەزانم، بەڵامماناو چەمکی ئەم واژەیە لە ماوەی ئەم پەنجا سالەی دواییدا، دوچاری گۆران و وەرگۆرانی زۆر بوەو، تەنها لە دەیەی ١٩٩٠دا ماناو چەمکیکی روون و ئاشکرای لەخۆ گرتوە. هەندێ کەس لە شەپۆلیکی پیشکەوتووخوازو هەندێ کەسی دیکەش بە کۆنەپەرست و دیاردەیەکی رەتکراوەو نیگەتیفی ئەزانن، هەندێ کەس بە هۆی واقیعگەرایی کۆمەڵایەتیو لایەنە تەکنەلۆژیەکەیەوە داکۆکیو پشتیوانی لیئەکەن و هەندێ کەسی دیکەش، وەك جەرەیانیکی موحافیزەکار و فیلبازو فەلسەفەی هەلاتن و پاساوهینەرەوە، مەحکومی ئەکەن. تەنانەت لە زۆر حالەتدا کە بە هۆی روخساری (شیزوفرنیك)یەوە مەحکوم ئەکریت، زۆریك لەو کەسانەی کە داکۆکی لیدەکەن، کەموکوورِیو خەوشەکانی، بە بەشیك لە چاکەو بەها پۆزەتیفەکانی لە قەلەم ئەدەن. هەندێ لە نووسەران بە شیوەیەکی نیگەتیف هەلی ئەسەنگینن و پیناسەیەکی خراپی بۆ ئەکەن و جەخت لەسەر روخساری هەلئاوسان و گەشەی جلەونەکراوی کە خەسلەتی ئابوری چەند لایەنەو فرەچەشن گەرایە، دەکەن[٢]. بەڵام لیکۆلینەوە وردو رەخنەییەکان سەبارەت بە بەلگەو ئیستدلالەکان، ئەوەمان بۆ دەرئەخەن کە بەرهەمهینانی سەرسورهینەرە مەسرەفی دیوانە ئاسا تەواوی بوارەکانی ژیانی

لە بنەرەتدا، پۆست مۆدێرنیزم پێکەوەبوون و تێکەڵاوی هەرجۆرە سونەتێکە لەگەڵ سونەتەکانی رابوردودا: هەم بەردەوامیو درێژەپێدانی مۆدێرنیزمەو، هەم فراژیبون و کاملبوونی.

هاوچەرخی خستۆتە ژێر ركیفی خۆیەوەو بە تەنها وابەستە نیە بە بزاوتێكی تایبەتەوە.

بۆ یەكەم جار پێشگری پۆست ( -Post) لە سالی ١٩٦٥دا وەك چەمكێكی پۆزەتیف لە لایەن (لزلی فیدلەر)ەوە بەكارهێنرا، كە ئەو وەك دوعایەكی جادوییو ئەفسونگەرانە بەكاریبردو لكاندی بەو بزاوتە رادیكاڵانەوە كە بە دژی كەلتور لە قەلەم ئەدران: "پۆست هیومانیستی، پۆست نیرینە، پۆست سپی، پۆست قارەمان و پۆست جولەكە"[٣].

لە راستیدا، هەر بەو شێوەیەی كە ئاندرناس هۆیسەن لە سالی (١٩٨٤)دا دەریخست، ئەم بزاوتگەلە ئانارشیستیو داهێنەرە سەبارەت بە هاوئاهەنگی یان جیابوونەوەی لە جەرەیاناتی {ئەرتەدۆكسی}، و ئەو هێرشە توندانەی كە ئەكرێتە سەر دەستەبژێرگەرایی ماركسیستیو ئاكادیمیسم و سەركوتكردنی پیوریتانی، بەدەرخەری یەكەمین جوڵانەوەی وروژێنەرو خرۆشاوی كەلتوری پۆست مۆدێرن لە قەلەم ئەدرێت و گوایە فیدلەر و ئەوانی دی لە سالەكانی دەیەی ١٩٦٠دا، هەرگیز لەو بروایەدا نەبوون كە ئەم باسانە بەو شێوەیە دەربێت و ئەم سونەتەش لەوجۆرە قالبەدا چەمك بەندی بكرێت[٤]. هەلبەتە، بۆ بەدیهاتنی ئەم مەسەلەیە پێویستمان بە كات بوەو دەبوایە تا سالەكانی دەیەی ١٩٧٠و دەركەوتنی نوسین و بەرهەمەكانی {ئیهاب حەسەن} سەبرو تیرامانمان هەبێت. واتە، كاتێك كە بزاوتە رادیكالیەكان كە سەردەمانێك {فیدلەر} لە دەیەی (١٩٦٠)دا خەریكی پیاهەلنان و ستایشكردنیان بوو، بە كۆن، بەتالكراوەو كۆنەپەرست، لە قەلەم درابوون و مەرگیان راگەیەنرابوو.

لە ناوەراستی دەیەی ١٩٧٠دا (ئیهاب حەسەن) خۆی بە وتەبێژی پۆست مۆدێرن لە قەلەم دا. ئەو، ئەم ناونیشانەی گری دا بە راوو باوەری ئەزمونگەراییەوە لە هونەرو بان تەكنەلۆژی كۆشكسازیدا– ویلیام باروزو باكمینستەر فولر "ئانارشی، پتوركان/ بیدەنگی.. سرینەوەی داهێنان/ بنەماشكێنی/ ئانتی تێز.. ناوەوەی دەق"..– بە كورتی، ئەو جەرەیانانەی كە دواتر من و ئەوانی دیكە بە تایبەتمەندییەكانی "مۆدێرنی درەنگوەخت" ناودێرمان كرد. لە ئەدەبیات و پاشان فەلسەفەدا، بە دوای سەرهەلدانی بەرهەم و نوسینەكانی لیوتاردو حەزكردن بۆ جێخستنی پۆست مۆدێرن لە جێگای بنەماشكێنی، ئەم زاراوەیە بە زۆری وابەستەیی نزیكی خۆی لەتەك ئەو شتەدا پاراست كە ئیهاب حەسەن بە {نابەردەوامی، دیارینەكردن، دەرونی خودی، دەرونی بوون} ناودێری ئەكرد[٥]. یەكێك لە بەرهەمە بەرجەستەكانی ئەم ژانرە، كتێبەكەی {مارك. س. تایلر}ە بە ناونیشانی "عەجیب داوەریكردنێكی نادروستی،

لە ناوەراستی دەیەی ١٩٧٠دا (ئیهاب حەسەن) خۆی بە وتەبێژی پۆست مۆدێرن لە قەڵەم دا.

یەك پۆست مۆدیرن، یەك ئیلاهیات" كە ئیلهامی لە بیروراكانی {دریدا} و بنەما شكینیەوە وەرگرتوە[٦].

هەروەها، لەناو فەیلەسوفەكاندا مەیلیك (گرایش) هەیە كە، تەواوی هزرمەندە پۆست پۆزەتیڤیستەكان بە كەسانی پۆست مۆدیرن ئەزانن، گەرچی تەنها خالی هاوبەشیشیان رەتكردنەوەی پۆزەتیڤیسمی لۆژیكی مۆدیرن بیت. بەمجۆرە، دوو مانای تەواو جیاواز بۆ ئەم واژەیەو تیكەلاوییەك، یان شلەژاوییەكی گشتی بەرچاو ئەكەویت كە پەیوەندی بە تیكرای خەلكیەوە نیە. ئەم رووداوانەو هەروەها پیش زەمینەكانی كۆنفرانسە جۆراوجۆرەكانی ئەم دواییە سەبارەت بەم بابەتە، ئەم (وتارەی ئیستا)ی لیكەوتەوە كە "پۆست مۆدیرنیزم چیە؟"یە. هەر بەو شیوەیە ئەمە هەم پرسیارو هەم وەلامیكە كە من ئەیخەمەروو. ئەتوانین لە ریگەی خویندنەوەو راڤەكردنیكی قولترەوە، سەرنجی ئەو خالە بدەین كە گەشەكردن و پەرەسەندنی بەردەوام و جولەی هەمیشەیی خودی ئەم دیاردەیە بە باشی پشتگیری ئەوە ئەكات كە ناكریّ وەلامیكی براوە (قطعی) و ئاشكرا بۆ ئەم پرسیارە بدۆزینەوە، لانی كەم، ئەمە كاریكی كردەییو ئاسان نیە تا ئەوكاتەی كە ئەم دیاردەیە لە گەشەكردن و جولە نەكەوتبیت.

كەلتوری پۆست مۆدیرن لە تافی مندالی خۆیدا، لە سالەكانی دەیەی ١٩٦٠دا بە جەرەیانیكی رادیكال- رەخنەگرانەو هەلویستی كەمینەیەك لە قەلەم ئەدرا، بۆ نمونە، لە لایەن هونەرمەندانی پاپ و تیۆری پایەوە دژ بە دیدگای لاوازی هونەری مۆدیرن و ئەو جوانناسییەی كە بەسەر دامەزراوگەلیكی وەك مۆزەی هونەرەكانی مۆدیرندا زال بوو، هاتۆتە ئاراوە. لە كۆشكسازیدا، تیم تین و جین یاكۆبزو، رابەت ڤنتوری.. شالاوەكانیان بە زمانیكی سادە لە دژی كۆشكسازی مۆدیرنی ئەرتەدۆكس، بە هۆی خەسلەتی {دەستەبژیرگەرایی} و نابوتكردنی شارەكان و بیروكراسی ئەوانەوە، دەستپیكرد. هاوكات، لەگەلّ دەستپیكردنی دەیەی ١٩٧٠ و گەشەكردن و پەرەسەندنی ئەو سونەتانەو بەهیزبوونیان و گۆران و وەرگۆران تیایانداو هەروەها داهینانی واژەی پۆست مۆدیرنیزم وەك دەربرینیك بۆ تەواوی جەرەیانە جۆراوجۆرەكان، پلە بە پلە ئەم جەرەیانە لایەنە رادیكال و رەخنەییەكانی تافی مندالی لە دەستداو، هەرچی زیاتر بەرەو موحافیزەكاری هەنگاوی هەلگرت و لە كۆتاییدا بە شیوەی جەرەیانیكی ئەكادیمیو عەقلانی دەرهات.

بەو جۆرە، لە کۆتاییدا پۆست مۆدێرنیزم لە کارو پیشە جۆراوجۆرەکان و ناوەندە زانستی و ئەکادیمیەکاندا لە ئاستێکی بەرفراوانتردا لە تەواوی کۆمەڵگادا پەسەندکراو

زۆریك لە لایەنگرانی دەیەی ١٩٦٠، وەك {ئەندی ڤارهول} بە چونیان بۆ ناو بازاری هونەرو رووکردنە کاری پروپاگەندەییو بازرگانی پرداهات، پەیامی رەخنەگرانەی خۆیان لە دەستدا. هەر بەو جۆرە، لە کۆتاییدا پۆست مۆدیرنیزم لە کارو پیشە جۆراوجۆرەکان و ناوەندە زانستیو ئەکادیمیەکاندا لە ئاستیکی بەرفراوانتردا لە تەواوی کۆمەلگادا پەسەندکراو هەروەك باوکی، واتە {مۆدیرنیزم} و هەروەها برا رەقیبەکەی واتە {مۆدیرنیزمی درەنگوەخت} بۆ بەشیك لە دامەزراوگەلە سەقامگرتوەکانی کۆمەلگەو هەروەها لە رەخنەی ئەدەبیشدا لە رووی مانابیەوە بەو چەمکە خۆیەوە لە سونەتەکانی کۆشکسازیو هونەری نزیکتربۆوە.

شانبەشانی نوسەرانی دی، {جان پارث} و {ئەمبیرتۆ ئیکۆ} ئەدەبیاتی پۆست مۆدیرنیزم بەجۆرە نوسینیك ئەزانن کە بۆ جوانکردن و ریکخستنی مانا (ناوەرۆك) پایەدارو هەتاییەکان، بە شیوەی تەنزئاساو کینایی یان بە شیوەی گۆران، کەلك لە فۆرمە سونەتییەکان وەرئەگریت[7]. ئەم جۆرە نوسینە ویرای پشتگیری ئیعتیباری مۆدیرنیزم– گۆرانی ئەو جیهانبینیەی کە لە لایەن نیچە، ئەنشتاین، فرۆیدو ئەوانی دییەوە بەدیهات– هەر بەو جۆرەی کە {جان بارث} ئەلیت، ئومیدەوارە کە ئامرازو خوینەرە تایبەتەکانی کە بە تایبەتمەندی رۆمانە مۆدیرنیستەکان لە قەلەم ئەدرین، بالاتر بروات:

"نوسەری پۆست مۆدیرنیستی ئایدیال و ئەوەی کە خواستی منە، نە تەواوی دایك و باوکی مۆدیرنیستی سەدەی بیستەم یان باوباپیرانی پیش مۆدیرنیستی سەدەی نۆزدەهەمی رەتئەکاتەوە، نە بە تەواوەتیش لاساییان ئەکاتەوە. ئەو، نیوەی ئەم سەدەیەی ئیمەی نەك هەر پشتگوێ نەخستوە، بەلکو خستۆتیە ژیر رکیفی خۆیەوە. نوسەری پۆست مۆدیرن بەبێ ئەوەی بە شیوەیەکی سادە دوچاری گرفتی ئاکاریو هونەری بیت، یان بە شیوەیەکی خراپ و دواکەوتوانە بنوسیت، یان کۆیلەی پارەپەرستن و بەرتیل خواردن بیت لە شەقامەکانی {مەدیسۆن}دا، یان دوچاری گەمژەییو کرچ و کالیەکی درۆزنانە، یان راستەقینە بیت، ئەو خوازیاری چیرۆکیکە کە پلە بە پلە زیاتر لە بەرهەمە سەرسورهینەرەکانی مۆدیرنیستی درەنگوەخت (هەلبەتە بە پیی پیناس و داوەریکردنی من)، وەك "داستان و دەقەکان لە پیناوی هیچ" دای ساموئیل بیکت، یان "ئاگری بیتین"ی ناباکۆف، لە کەش و هەوایەکی دیموکراتیك بەهرەمەند بیت.

ئەو، توانای ئەوەی نیە کە بە پیی هەنگاوەکانی موریدەکانی {جیمز میچنر} و {ئیروینگ والاس}دا بگات و شان بەشانی ئەوان حەرەکەت بکات- پیویست ناکات باسی ئەو نەخویندەوارانە بکەین کە گویگری ئامرازەکانی راگەیاندن و میشکیان شۆراوەتەوە، بەلام ئەو ئەبیت بەوە ئومیدەوارو ئاسودەبیت کە لانی کەم بەشیك لە رۆژەکانی (بە دەربرینی تۆماس مان) بە بالاتر لە "کۆری مەسیحیە بەراییەکان" بگات: واتە بالاتر لە موریدانی پیشەی هونەری بالاو پیشکەوتوو.. رۆمانی باش و ئایدیالیستی پۆست مۆدیرنیستی بە جۆریکی بانتر لە کیشمەکیشی نیوان واقیع گەرایی‌و دژ بە واقیع گەرایی، ئەسالەتی فۆرم و ئەسالەتی ناوەرۆك، ئەدەبیاتی پەتی‌و ئەدەبیاتی بەلین بەستو، داستانی کورە ئەدەبیەکان و داستانە خراپەکان.. خۆی دەرئەخات. ئەو نمونەیەی کە جیی سەرنجمە، جازی باش، یان مۆسیقای کلاسیکە: مرۆڤ لە کاتی گویگرتنی بەردەوام و یەك لە دوای یەکدا یان بە خویندنەوەو لیکۆلینەوەی ورد لەسەر پارچە مۆسیقایەك، هەندێ شتی بۆ دەرئەکەویت کە یەکەم جار دەرکی پینەکردوە، بەلام دەکرێ یەکەم جار هیندە فریودەرو سەرمەستکەر بیت کە ئەو تاکە نەك تەنها پسپۆرەکان- هیندە دوچاری ئیحساساتیکی توند بکات کە لە دووبارە گویگرتنی ئەو مۆسیقایەدا خۆشی‌و شادیەکی لە رادەبەدەر لەخۆبگریت"[٨].

ئەم پشکنین و لیکۆلینەوەیە بۆ دۆزینەوەی هەندێ گویگری زیاتر لە مەسیحیە بەراییەکان، کۆشکسازان و هونەرمەندە پۆست مۆدیرنیستەکان لە هاوتاکانی مۆدیرنی درەنگوەخت و ئەو خولیا سیحرئامیزو ئەویندارییەی کە (ئیهاب حەسەن) لە دەیەی ١٩٧٠دا وەسفی کردبوو، جیاوازو جودا ئەکاتەوە، هەلبەتە، گەلەك ئامانجی دیاریکراو و تایبەتی دیکەش لە دەستوری کاردا بەرچاوئەکەویت کە ئاقارو سەمت و لایەنی تایبەتی پۆست مۆدیرنیزم دیاریئەکەن، بەلام لەبەرئەوەی کە ماناو سونەتی پۆست مۆدیرنیزم هەمیشە لە حالەتی گۆران و وەرگۆراندایە، کەواتە نەك تەنها ئەبێ ئەم چەمکە پیناسەبکەین، بەلکو ئەبێ میژووی کات و شوینی دەستنیشان بکەین.

بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەتە، من پۆست مۆدیرنیزم بە جۆرە دوفاقیەکی ناکۆك (دژبەیەك) یان رەمزگوزاریکی دوفاق ئەزانم کە لە {ناو} یان ناونیشانی دووبەشی‌و ناکۆکی ئەو دوفاقییەدا، شاراوەتەوە. واتە بەردەوامبوونی مۆدیرنیتە، بە گویرەی ئەم لۆژیکە، (پۆست مۆدیرن) لە دیدی (حەسەن)ەوە مۆدیرنی درەنگوەختە، واتە بەردەوامبوونی {مۆدیرنیزم}ە لە فۆرمە توندرەوە یان پر موبالەغە ئامیزەکەیدا. هەندێ

لە نوسەران و رەخنەگرانی وەك بارث و ئیكۆ لەگەڵ ئەو پیناسەدا هاوران، هەر بەوجۆرە ژمارەیەكی دی لە نووسەران و رەخنەگرانی وەك حەسەن و لیوتار پیی قایل نەبوون و رەتیان كردۆتەوە. لەناو ئەم هاورابوون و هاورنەبوونەداو ئەم تەبایی و ناتەباییەدا، جۆرە دیالیكتیكیكی مارئاسا (*Snake- like dialecite*) هەیە، كە هەمیشە ئەم بزاوتە ناوبراوە پیشانی داوەو زۆریش جیی گومانە كە بەر لە كۆتایی هاتنی ئەم بزاوتە چاومان بە پیچ و ئالۆزییەكی زۆر لەم فەنەرو بازنەیەدا، بكەوێ، بەڵام دەكرێ لە یەك شت دلنیابین:

كە تا ئەوكاتەی مۆدیرنیزمەكانی دی نابوت نەبن، راگەیاندنی مەرگ بە هەنگاویكی زۆر پیشوەخت لە قەلەم ئەدریت.

**سەرچاوە:**

پست مدرنیتەو پست مردنیسم

ترجمە و تدوین: حسینعلی نوذری

## کارل ڕایمۆند پۆپەر

# یۆتۆپیا و توندوتیژی



کارل پۆپەر

**و. لە فارسییەوە: محەمەد کەریم**

ئەو کەسانە زۆرن کە لە بەکارهێنانی توندوتیژی بێزارن و لەو باوەڕەدان کە گرنگترین و لە هەمان کاتدا پڕ ئومێدترین ئەرکی ئێمە هەڵکەندنی ڕەگ و ڕیشەی دەست درێژیی و توندوتیژیە لەسەر ئاستی جیهان و یان بەلای کەمەوە لەناوبردنی گلاوترین ڕوخسارەکانێتی. دان بەوەدا دەنێم کە منیش لەو نەیارانەم کە ئومێدم بە لەناوبردنی توندوتیژی هەیە. نەك تەنها لەبەرئەوەی لێی بێزارم، بەڵکو لەو باوەڕەدام کە شەڕ لە دژی دەستدرێژی و توندوتیژی هێندە بێ ڕوانگە نیە. بە ڕاستی دەزانم ئەرکێکی زۆر دژوارمان لەبەردەمدایە هەروەها دەزانم چەندان ئومێد کە لە سەرەتادا وەکو چەند سەرکەوتنێکی گەورە لە شەڕی دژی توندوتیژیدا نیشان دران، پاشان

ئه‌نجامه‌كه‌یان ناكامی و شكست بوو. ئه‌وه‌ش ده‌زانم كه‌ چه‌رخی نوێی سه‌ركوتكردن و توندوتیژی كه‌ به‌ هه‌ردوو جه‌نگی جیهانی یه‌كه‌م و دووه‌م ده‌ستی پێكرد هێشتا به‌ هیچ شێوه‌یه‌ك كۆتایی نه‌هاتوه‌. فاشیزم و سوسیال ناسیونالیزم (نازیزم) شكستیان هێنا، به‌ڵام ئه‌مه‌ به‌ مانای سه‌ركه‌وتن نیه‌ به‌سه‌ر دڕنده‌یی و توندوتیژیدا. به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ هه‌ڵه‌یه‌ ئه‌گه‌ر چاوانمان له‌ ئاستی ئه‌و ڕاستیه‌دا دابخه‌ین كه‌ ئه‌و ئه‌ندێشه‌ قێزه‌ونانه‌ هه‌تا له‌ كاتی شكستیشدا توانیان سه‌ركه‌وتن به‌ ده‌ست بێنن. ده‌بێ دان به‌وه‌دا بنێم كه‌ هیتله‌ر توانی پێوه‌ره‌ ئه‌خلاقیه‌كانی جیهانی خۆرئاوا تا نزمترین پله‌ی شیاو دابه‌زێنێ و ئه‌مرۆ جیهان زیاتر له‌ ده‌یه‌ی سه‌ره‌تای دوای جه‌نگی جیهانی یه‌كه‌م دوچاری زۆری ده‌ستدرێژكارو ده‌سه‌ڵاتی جله‌و بۆ شل كراو بوه‌. نابێ ئه‌و ئه‌گه‌ره‌ به‌ دوور بگیرێ كه‌ شارستانیه‌تی ئیمه‌، هه‌تا له‌ كاتی یه‌كه‌مین ده‌یه‌ی پاش جه‌نگی جیهانی دووه‌م-یشدا، ڕه‌نگبوو سه‌رئه‌نجام به‌ هه‌مان ئه‌و چه‌كه‌ تازانه‌ له‌ناوببرێ كه‌ ئه‌لمانیای هیتله‌ری به‌سه‌رماندا سه‌پاندبووی. چونكه‌ ڕۆحی ئه‌لمانیای هیتله‌ری، بێگومان كاتێ گه‌وره‌ترین سه‌ركه‌وتنی خۆی به‌ ده‌ست هینا كه‌ ئیمه‌ دوای زالبوون به‌ سه‌ریدا، هه‌مان ئه‌و چه‌كانه‌مان به‌كارهینا كه‌ هه‌ره‌شه‌كانی سوسیال ناسیونالیزم ناچاری كردبووین په‌ره‌ی پێ بده‌ین. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌مرۆ له‌ هه‌ر كاتیكی دیكه‌ زیاتر ئومیده‌وارم كه‌ بتوانین به‌سه‌ر توندوتیژیدا زال بین. ئه‌مه‌ تاكه‌ ئومیدی ئیمه‌یه‌و چه‌ند به‌شیكی درێژی میژووی شارستانیه‌تی خۆرهه‌ڵات و خۆرئاوا خۆی به‌ڵگه‌ی ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌م ئومیده‌ هینده‌ نابه‌جێ نیه‌. واته‌ توندوتیژی ده‌توانرێ كۆنترۆڵ بكرێ و بخریته‌ ژێر فه‌رمانی ئه‌قڵه‌وه‌. ڕه‌نگه‌ ئه‌مه‌ بۆ خۆی هۆیه‌ك بیت بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ چۆن من وه‌كو زۆر كه‌سی دیكه‌، باوه‌رم به‌ ئه‌قڵ هه‌یه‌و خۆم به‌ ئه‌قڵانی ده‌زانم. به‌ڵی من ئه‌قڵانیم. چونكه‌ پایه‌گای ئه‌قڵ به‌ تاكه‌ ئه‌گه‌ری شیاو ده‌بینم له‌ به‌رامبه‌ر ده‌سه‌ڵاتی سه‌ركوتكردندا.

هه‌ركاتێ دوو كه‌س پیكه‌وه‌ ناته‌بابن، له‌و ڕووه‌وه‌یه‌ كه‌ یان بیروڕای جیاوازیان هه‌یه‌ یان به‌رژه‌وه‌ندیان جیاوازه‌ یان هه‌م بیروباوه‌رو هه‌م به‌رژه‌وه‌ندیی جیاوازیان هه‌یه‌. له‌ ژیانی كۆمه‌ڵایه‌تی‌دا چه‌ند جیاوازی بیروڕایه‌ك هه‌ن كه‌ ده‌بێ به‌ جۆریك ده‌رباره‌یان بڕیار بدرێ. چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌ك هه‌ن كه‌ ده‌بی چاره‌نوسیان ڕون بكریته‌وه‌، چونكه‌ كه‌مته‌رخه‌می له‌م كاره‌دا ڕه‌نگه‌ چه‌ند كیشه‌یه‌كی تر بخولقینێ و كه‌له‌بوونی ئه‌نجامه‌كانیان چه‌ند بارگرژییه‌كی لێ بكه‌ویته‌وه‌ كه‌ ته‌حه‌مول ناكرین؛ وه‌كو ئاماده‌یی به‌رده‌وام و هه‌مه‌لایه‌نه‌ بۆ بڕیاردانی بێ چه‌ندوچون ده‌رباره‌ی مه‌سه‌له‌یه‌كی وه‌كو

فاشیزم و سوسیال ناسیونالیزم (نازیزم) شكستیان هێنا، به‌ڵام ئه‌مه‌ به‌ مانای سه‌ركه‌وتن نیه‌ به‌سه‌ر دڕنده‌یی و توندوتیژیدا.

بە ڕاستی پێم وایە من لەسەر حەقم؛ بەڵام دەشێ من هەڵە بم و تۆ لەسەر حەق بیت. بەهەرحاڵ باشتر وایە لەم بارەیەوە ژیرانە گفتوگۆ بکەین نەك هەریەکە تەنها جەخت لەسەر ڕوانینی خۆی بکات، چونکە لەم ڕێگەیەوە ڕەنگە لە حەقیقەت نزیکتر بکەوینەوە

**پێشبکرێی چەکسازیی، بڕیارێکی لەو جۆرە ڕەنگە قابیلی خۆلێلادان نەبێ. چۆن دەتوانین بگەینە حوکمێکی یەکلایی کەرەوە؟ لە ڕاستیدا دوو ڕێگە زیاتر لە ئارادا نیە؛ یەکێکیان ڕێگەی بەڵگەهێنانەوەیە (بۆ نمونە لە بەرامبەر تاقمی داوەران یان دادگایەکی نێودەوڵەتیدا) و ئەوی تریان ڕێگەی توندوتیژییە. هەرکاتێ ناکۆکی بەرژەوەندی لە ئارادا بێ، ئەوکاتە ئەو دوو ڕێگایە بریتی دەبن لە سازشی ماقوڵ یان هەوڵدان بۆ لابردنی سەرکوتکارانەی بەرژەوەندییەکانی لایەنی بەرامبەر. ئەقڵانی– بەو مانایەی کە من لەم زاراوەیەم دەوێ– کەسێکە کە لە جیاتی بەکارهێنانی توندوتیژیی هەوڵ دەدات لە ڕێگەی بەڵگەو دەلیلەوە لە هەندێ حاڵەتدا لە ڕێگەی سازشەوە بگاتە حوکمدانێك یان بڕیارێك. ئەقڵانی کەسێکە کە تەنانەت ئامادەیە شکست بێنێ لە ڕازی کردنی لایەنی بەرامبەردا لە ڕێگەی بەڵگەو دەلیلەوە، بەڵام پەنا بۆ توندوتیژی هەڕەشەو ترساندن و بەکارهێنانی فرت و فیڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ سەرکەوتن بەسەر بەرامبەردا، ئەبات. مەبەستی من لە (ڕوانینی ئەقڵانی) کاتێ باشتر هەستی پێ دەکرێ کە لە نێوان ڕازیکردنی کەسێك بە بەڵگەو دەلیل و ڕازیکردنی لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە جیاوازییەکی ئاشکرا بکەین.**

**جیاوازی تەنها لە بەڵگەهێنانەوەدا نیە، چونکە لە ڕاگەیاندنیشدا زۆر جار سوود لە بەڵگەهێنانەوە وەردەگیرێ. هەروەکو جیاوازی لەو باوەڕەی ئێمەدا نیە کە بەڵگەکانمان یەکلایی کەرەوەن و هەر کەسێکی هوشیار ڕا لەسەر یەکلایی کەرەوەیی ئەو بەڵگانە دەدات، زیاتر جیاوازییەکە لە *[نەبوونی]* بۆچوونی بەرامبەری گفتوگۆ یان دانوستاندنی *[فیکری]*دایە، لە ئامادەییدا بۆ ئەوەی نەك تەنها بمانەوێ لایەنی بەرامبەر ڕازی بکەین بەڵکو بەرامبەریش بتوانێ ئێمە قایل بکات. ئەوەی کە بە ڕوانینی ئەقڵی ناوی دەبەم، دەکرێ بەم شێوەیەی خوارەوە دەربڕدرێ.**

**"بە ڕاستی پێم وایە من لەسەر حەقم؛ بەڵام دەشێ من هەڵە بم و تۆ لەسەر حەق بیت. بەهەرحاڵ باشتر وایە لەم بارەیەوە ژیرانە گفتوگۆ بکەین نەك هەریەکە تەنها جەخت لەسەر ڕوانینی خۆی بکات، چونکە لەم ڕێگەیەوە ڕەنگە لە حەقیقەت نزیکتر بکەوینەوە".**

**ئاشکرایە، ئەم ڕوانینە کە بە ڕوانینی ئەقڵانی ناوی دەبەم پێویستی بە قبوڵ کردنی کەمێك تەوازعی ئەقڵی هەیە، ڕەنگە تەنها لەو کەسانە بوەشێتەوە کە هەندێ جار بزانن لەسەر حەق نین و بە پێی عادەت، هەڵەکانی خۆیان لەبیر نابەنەوە.**

تێڕوانینی ئەقڵانی لەسەر ئەو زانینە بنیات نراوە کە ئێمە لە هەموو کاروبارەکان نازانین و لە بەشی زۆری زانینەکانی خۆماندا قەرزاری کەسانی دیکەین. ئەم تێڕوانینە بە پێی توانا، دوو پرەنسیپی داوەریی حقوقی بۆ مەیدانی داوەریی گشتیش بەکێش دەکات: یەکەمیان ئەوەیە کە دەبێ هەمیشە گوێ بۆ هەر دوو لایەنی دەعواکە بگیرێ‌و دوەمیش ئەوەیە کە هەرکەسێك بەرژەوەندی لە کێشەکەدا هەبێ، داوەرێکی باش نابێت.

باوەڕم وایە کە تەنها کاتێ دەتوانین لە توندوتیژی دووربکەوینەوە کە لە بواری کۆمەڵایەتیشدا پابەندی تێڕوانینی ئەقڵی بین. هەر تێڕوانینێکی دیکە بە ئاسانی بە بەکارهێنانی توندوتیژی تەواو دەبێ، هەتا هەوڵی ئێمە کە بیەوێ ئەوانی دی بە نەرم و نیانی، *[بەلاّم یەکلایەنە]* قایل بکات و ئەوانی دی بە کۆمەکی بەڵگەو دەلیل بکاتە خاوەنی دووربینیەك کە خۆمان شانازی پێوە دەکەین و لە ڕاستی و دروستی دڵنیایین. هەموومان دەزانین چەند جەنگی پیرۆز لەبەر خاتری دینی (عەشق و چاکە) هەڵگیرسا و چەند مرۆڤ لە ئاگری جەنگدا سووتان، بەو نیازە خێرەوە کە ڕۆحیان لە ئاگری نەمری دۆزەخ ڕزگاربێ. تەنها کاتێك لە مەیدانی بیروباوەڕدا دەستبەرداری بۆچوونی دەسەلاّتخوازانە بین، تەنها کاتێك کە ملکەچی ڕوانینی بەرامبەری گفتوگۆو دانوستاندنی فکری بین، تەنها کاتێك کە ئامادە بین لە کەسانی دیکەوە فێربین، ئەوکاتە دەتوانین بەسەر بەکارهێنانی توندوتیژیدا زاڵ بین کە لە زهدو تەقواو ئەنجامدانی ئەرکەوە ئیلهامی وەرگرتوە.

دژوارییەکی زۆر لە ڕێگەی پەرەسەندنی خێرای ڕوانینی ئەقڵانیدا هەیە. یەکێك لە کێشە بنچینەییەکان ئەوەیە کە بۆ بەڕێکردنی دیالۆگی ئەقڵانی پێویست بە دوو لایەن دەکات (کە ڕەچاوی ڕوانینی ئەقڵانی بکەن) هەردوولا دەبێ ئامادەبن کە لە یەکترییەوە فێربن. لەگەڵ کەسێکدا کە پێی باشترە لە جیاتی ئەوەی لە دیالۆگدا لەگەڵت هەڵوێستی ئیجابی بێت بە گوللە داتگرێتەوە، دیالۆگی ئەقڵانی ناکرێ.

بەم پێیە ڕوانینی ئەقڵانی سنووری خۆی هەیە. ئەم خاڵە سەبارەت بە نەرم و نیانی یش ڕاستە. نابێ بێ کۆت و مەرج ئەم پرانسیپە بکەینە ڕابەری خۆمان و نەرم و نیانی لەگەڵ ئەوانەدا بنوێنین کە شایانی نین. چونکە لەم حاڵەتەدا نەك تەنها خۆمان بەڵکو نەرم و نیانی (مدارا)ش لەناو دەبەین (هەموو ئەم ئاماژانە بۆ ئەو دەستەواژەیە دەگەڕێتەوە کە ڕوانینی ئەقڵانی بە ڕوانینێك دەزانێ کە دەبێ کە لەسەر بەرامبەریی گفتوگۆ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا بنیات نرابی".

باوەڕم وایە کە تەنها کاتێ دەتوانین لە توندوتیژی دووربکەوینەوە کە لە بواری کۆمەڵایەتیشدا پابەندی تێڕوانینی ئەقڵی بین.

ئەنجامی گرنگ ئەمەیە کە نابێ بواری ئەوە بدرێ جیاوازی نێوان هێرش و بەرگری بسڕێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ تەئکید لەسەر ئەو جیاوازییە بکەینەوە و پشتیوانیلەو دەزگا کۆمەڵایەتیانە بکەین (ئایا نیشتمانی یان نێودەوڵەتی بن) کە ئەرکیان بریتیە لە دانانی جیاوازی ورد لە نێوان دەستدرێژی و بەرگری کردن لە بەردەم دەستدرێژیدا. ئومێدەوارم وەکو پێویست ئەوەم ڕوون کردبێتەوە کە مەبەستم لەوە چیە کە خۆم بە ئەقڵانی ناودەبەم. ئەقڵانیەتی من دۆگمایی نیە، بە ڕاشکاویی ئەوە قبوڵ دەکەم کە ناتوانم ئەقڵانیەت بە ڕێگەیەکی ئەقڵی بسەلمێنم بێ پەردە دان بەوەدا دەنیم کە لەو ڕووەوە ئەقڵانیەتم هەڵبژاردوە کە لە توندوتیژیی بیزارم و خۆم فریو نادەم کە ئەم بیزارییەم بنەمایەکی ئەقڵانی هەیە. بە واتایەکی دی، ئەقڵانیەتی من لەسەر خۆی بنیات نەنراوە. بەلکو لەسەر باوەری غەیرە ئەقلی بۆ ڕوانینی ئەقلی بنیات نراوە. بۆ دەربازبوون لەم کیشەیە چارەیەك نابینم. رەنگە بتوانرێ بگوترێ باوەری غەیرە ئەقڵانی بۆ مافی بەرامبەر و یەکسان کە بتوانین ئەوانی دی رازی بکەین و خۆشمان رازی بین، باوەرە بە ئەقلی مرۆڤ؛ یان بە دەربرینیکی سادەتر من باوەرم بە مرۆڤ هەیە.

کاتێ دەلێم باوەڕم بە مرۆڤ هەیە، مەبەستم لە مرۆڤە بەو شێوەیەی کە هەیەو هەڵبەتە دەزانم کە مرۆڤ بوونەوەریکی تەواو ئەقڵانی نیە.

کاتێ دەلیم باوەرم بە مرۆڤ هەیە، مەبەستم لە مرۆڤە بەو شیوەیەی کە هەیەو هەلبەتە دەزانم کە مرۆڤ بوونەوەریکی تەواو ئەقڵانی نیە. پیم وا نیە پرسیاریکی لەو جۆرە کە مرۆڤ زیاتر پاشکۆی ئەقلە یان سۆز (یان بە پیچەوانەوە) هیندە مانای هەبێ؛ باشترە لە بنچینەدا پرسیار وا نەکەین، چونکە تاوتویکردن و هەلسەنگاندنی ئەم جۆرە کاروبارانە کاری کردە نیە. ئارەزووی من زیاتر ئەوەیە کە لە دژی جەختی لە رادەبەدەر لەسەر لایەنی دژە ئەقلی مرۆڤ و کۆمەلگە (کە لە بە جەماوەری کردنی دەرونشیکارییەوە سەرچاوەی گرتوە) نارەزایی دەربرم. نەك تەنها ئاگاداری توانای سۆزم لە ژیانی مرۆڤدا، بەلکو ئاگاداری بەهاکەشیم. هەرگیز خوازیاری ئەوە نیم کە دەبێ بە دەست هینانی تیروانینی ئەقڵانی بکەینە ئامانجی بالای خۆمان تەنها دەمەوێ هەرگیز نابێ بلیم تیروانینی ئەقڵانی بە فەرامۆشی بسپیررێ– هەتا لە پەیوەندیەکی وەکو عەشقیشدا کە پرە لە شەوق و سۆزی فراوان.

تیروانینی من دەربارەی مەسەلەی ئەقل و سەرکوتکردن، دەبێ ئیستا روون بووبیتەوەو ئومیدەوارم لەم تیروانینەدا لەگەڵ هەندێ لە خوینەرانمدا و لەگەڵ زۆربەی

ئینسانه‌كاندا هاورابم. هه‌نووكه ده‌مه‌وێ له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌م بیروبۆچوونانه قسه له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌ی یۆتۆپیاخوازی (یوتوپیاگه‌رایی– *Utopismus*) بكه‌م.

تا ئه‌و شوینه‌ی كه ده‌زانم، یۆتۆپیاخوازی ئه‌نجامی شیوه بیركردنه‌وه‌یه‌كه كه زۆر كه‌س لایه‌نگرین و پییان سه‌یر ده‌بێ ئه‌گه‌ر ببیستن كه ئه‌م شیوه بیركردنه‌وه‌یه به رووكه‌ش ناچاری، به‌دیهیه، چه‌ند ئه‌نجامیكی خه‌یالی و یۆتۆپیای لیده‌كه‌ویته‌وه. ئه‌م شیوه به رووكه‌ش ئاراسته‌كه‌ره، ره‌نگه بتوانرێ به‌م شیوه‌یه‌ی خواره‌وه وینه بكرێ.

ئه‌وه تیروانینی ئه‌قلانیه كه بۆ گه‌یشتن به ئامانجیكی دیاریكراو، بتوانێ به باشترین شیوه ته‌واوی هۆكاره‌كانی به‌رده‌ست به‌كاربینێ. ده‌بێ ئه‌وه قبول بكرێ كه ره‌نگه نه‌توانرێ خودی ئامانجه‌كه به شیوه‌یه‌كی ئه‌قلانی دیاری بكرێ. ته‌نها كاتیك ده‌توانرێ سه‌باره‌ت به ئامانجیكی دیاریكراو تیروانینیك به ئه‌قلانی و گونجاو بزانرێ كه ئامانجیكمان له‌به‌ر ده‌ستدا هه‌بێ و ته‌نها سه‌باره‌ت به‌و ئامانجه ده‌توانین بلیین به شیوه‌یه‌كی ئه‌قلانی ره‌فتار ده‌كه‌ین. ئیستا با بیین و ئه‌م به‌لگه‌هینانه‌وه‌یه له بواری سیاسه‌تدا به‌كاربینین. هه‌ر سیاسه‌تیك له كۆمه‌لی هه‌نگاو پیكدیت. هه‌ركاریك ته‌نها كاتیك ئه‌قلانی ده‌بیت كه رووی له ئامانجیك بیت. ئامانجی كاری سیاسی كه‌سیك ره‌نگه زیادكردنی ده‌سه‌لات یان سامانی تایبه‌تی یان ره‌نگه ئامانجی چاكردنی یاساكان یان گۆرینی بونیادی ده‌وله‌ت یان كۆمه‌لگا بیت. له دوا حاله‌تدا كاری سیاسی ته‌نها كاتیك ئه‌قلانی ده‌بیت كه پیشتر ئامانجی ئه‌و گۆرانكاریانه‌مان دیاری كردبێ كه نیازی ئه‌نجامدانیمان هه‌یه: كرداری (سیاسی) ته‌نها كاتیك ژیرانه ده‌بێ كه سه‌باره‌ت به چه‌ند ئه‌ندیشه‌یه‌كی دیاریكراو بێ؛ ئه‌و ئه‌ندیشانه‌ی كه ئه‌وه نیشان بده‌ن كه ده‌وله‌ت و كۆمه‌لگا ده‌بێ چۆن بن. به‌م پییه وا دیاره پیش مه‌رجی هه‌ر كاریكی سیاسی ئه‌وه بێ كه تا راده‌ی مومكین له سه‌ره‌تادا سه‌باره‌ت به دوا ئامانجه سیاسیه‌كانمان، بۆ نمونه بونیادی ده‌وله‌ت یان ئه‌و كۆمه‌لگایه‌ی كه به رای ئیمه باشترینه، ته‌سه‌وریكی رۆشنمان هه‌بیت. ته‌نها دوای ئه‌وه‌ی ئامانجمان روونبۆوه، ده‌توانین ده‌رباره‌ی گونجاوترین هۆكاره‌كانی به‌دیهاتنی ئه‌و ئامانجه یان به‌لای كه‌مه‌وه نزیك بوونه‌وه‌ی به‌ره‌به‌ره لیی بیر بكه‌ینه‌وه. ئه‌مه‌ش له حاله‌تیكدایه كه ئیمه به چاوی ئامانجی یه‌ك ره‌وتی میژووییه‌وه له ئامانجی سیاسی خۆمان ده‌روانین (ره‌وتی میژووییه‌ك) كه ده‌توانین تا راده‌یه‌ك كاری تیبكه‌ین یا به‌ره‌و ئه‌و ئامانجه مه‌به‌ستمانه رینمایی بكه‌ین. ریك ئه‌م ده‌رك و تیروانینه به یۆتۆپیاخوازی ناوده‌نیم. هاوریك له‌گه‌ل ئه‌م تیروانینه‌دا، ئیمه ده‌بێ به‌ر له هه‌ر كاریكی ئه‌قلانی و ناخۆپه‌رستانه، ئامانجه‌كانی

كۆتـایی خۆمـان دیـاری بكـەین نـەك ئامـانجی جوزئـی یـان مامنـاوەندی، كـە چـەند هەنگاویكن لە ریگەی ئامانجی كۆتاییدا و لەم روەوە دەبێ بە چاوی هۆ تەماشایان بكەین نەك بە چاوی ئامانج.

لـەم روەوە هـەنگاوی سیاسـی و لـە هـەمان كـاتدا ئـەقلانی (هـاوریك لەگـەڵ ئـەم تیروانینـەدا) دەبێ لەسـەر نەخشـەو وەسـفی كـەم و زۆر رۆشـن و شـەرحی دەولـەتی یۆتۆپیای ئیمە بنیات نرابێ و بە تەرح و نەخشەی ریگەی میژوویی ئەوە نیشان بدات كە چۆن بگەینە ئەو ئامانجە.

من ئەم دەرك و تیروانینە یۆتۆپیخوازیە بە تیۆریكی سەرنجراكیش –بەلی زۆر سەرنج راكیش– دەزانم، چونكە تیۆریكە ترسناك و فاسدكەرە، تەنانەت بە رای من ئەم تیۆرەیە دەبیتە مایەی شكستی خۆی و دەبیتە هۆی زاڵ بوونی توندوتیژیی. هۆی ئەوەی كە ئەم تیۆرە دەبیتە دوژمنی خۆی لەو روەوەیە كە بە شیوەیەكی زانستی ناتوانین ئامانج دیاری بكەین. هیچ میتۆدیكی زانستی لە ئارادا نیە كە بە هۆیەوە بتوانرێ لە نیوان دوو ئامانجدا (لەسەر یەكیكیان) بریار بدرێ. رەنگە هەندێ كەس ستایشكەری زۆر و توندوتیژی بن و ژیان بەبێ زۆرو توندوتیژی بە لایانەوە، بێ رۆح و بێ مانا بیت. هەندیكی تر كە منیش یەكیكم لەوان لە توندوتیژی بیزارن. لیرەدا ناكۆكی لەسەر ئامانجەو ناتوانرێ لە رووی زانستیەوە دەربارەی بریار بدرێ، بەڵام كاتیك بەلگە لە دژی توندوتیژی دەهینینەوە، هەمیشە مانای ئەمە نیە كە بیهوودە كات بە فیرۆ دەدەین، بەلكو تەنها بەو مانایەیە كە جاری وایە ناشێ لەگەڵ ستایشكەری توندوتیژی دیالۆگ و وتوویژ بكەین و بەلگە بهینینەوە. چونكە ئەو توانایەی هەیە كە ئەگەر هەرەشەی بە هەمان رادە لی نەكەی، بە گوللە وەلامی بەلگەكانت بداتەوە. بەڵام ئەگەر ئامادە بوو گویێ بۆ بەلگەكانت شل بكات بەبێ ئەوەی دەست بۆ چەك بەریت. لەم حالەتەدا بەلای كەمەوە ئەقلانیەتی تۆ كاری تیكردوەو رەنگە بتوانرێ قەناعەتی پیبكرێ. بەم پییە بەلگەهینانەوە بە هیچ جۆرێ كات بە فیرۆدان نیە، بەلای كەمەوە تا ئەو كاتەی كە لایەنی بەرامبەر ئامادەی گویگرتنە لە قسەكانت. بەڵام بە كۆمەكی بەلگەهینانەوە ناتوانرێ هیچ كەسێ ناچار بكرێ كە گوێ بۆ بەلگەكان بگرێ بە كۆمەكی بەلگەهینانەوە ناتوانرێ بۆچوونی ئەو كەسانە بگۆررێ كە بەرامبەر بە هەموو بەلگەكان بەدگومانن و ئەو بریارانەیان پێ باشترە كە لەسەر توندوتیژی بنیات نراوە،

لەو بڕیارانەی کە لەسەر ئەقڵ بنیات نراوە ناتوانرێ ئەوەیان بۆ بسەلمینرێ کە ئەوان لەسەر حەق نین.

بەڵام ئەمە تەنها حالەتیکی تایبەتە کە دەتوانرێ بەم شیوەیە تەعمیم بکرێ: دەربارەی هیچ ئامانجیك ناتوانرێ بە هۆکاری ئەقلی یان زانستیی رووت بریار بدرێ. لەگەڵ ئەمەشدا رەنگە هەندێ جار بەلگەهینانەوە زۆر بە کەلك بێ و بە کۆمەکی ئەو بەلگەهینانەوەیە بتوانرێ بریار لەسەر ئامانج بدرێ.

ئیستا ئەگەر هەموو ئەمانە سەبارەت بە یۆتۆپیاخوازی بەکاربینین، دەبێ تەواو ئاگاداری ئەو خالە بین کە ئەم مەسەلەیە واتە دارشتنی نەخشەیەکی یۆتۆپیایی ناکرێ تەنها بە هۆی زانستەوە چارەسەر بکرێ. بەرلەوەی زانا دەست بە دارشتنی نەخشەکە بکات دەبێ بەلای کەمەوە ئامانجەکانی بدریتێ. لە زانستە سروشتیەکانیشدا بارەکە هەر بەو شیوەیەیە، زانستی فیزیا بە زانا نالیت کاری راست ئەوەیە کە هەوجار دروست بکات یان فرۆکەیان بۆمبای ئەتۆم. پیشان دەبێ ئامانجەکانی بدریتێ یان خۆی هەلیان بژیرێ و تەواوی ئەوەی کە ئەو وەکو زانایەك دەتوانێ ئەنجامی بدات ئەوەیە کە چەند ئامیریك دروست بکات کە بتوانێ بە یارمەتی ئەو ئامیرانە ئامانجەکان بکاتە شتیکی عەمەلی.

(کاتیك جەخت لەو کیشانە دەکەمەوە کە لە ریی بەلگەهینانەوەی ئەقلیەوە لە بریاری کەمالخوازییە یۆتۆپیاییە جۆراوجۆرەکانەوە سەرچاوەیان گرتوە) مەبەستم ئەوە نیە کە ئەو هەستە پەرەپیبدەم کە مەیدانیکی وەکو مەیدانی ئامانج هەیە کە لە دەرەوەی هیزی هەلسەنگاندن و رەخنەلیگرتنی ئەقلانیەوەیە (هەرچەندە بە دلنیاییەوە دەتوانم بلیم بەشی زۆر مەیدانی ئامانج لەودیو هیزی بەلگەهینانەوەی زانستیەوەیە) چونکە ئیستا بۆ خۆم هەول دەدەم دەربارەی هەمان بوار، بەلگەو دەلیل بهینمەوە، و ئەگەر ئامارە بۆ ئەو کیشانە دەکەم کە دەرئەنجامی بریاردانە لە نەخشە یۆتۆپییە رکەبەرەکاندا، مەبەستم ئەوەیە کە بە هۆیەوە لە دژی دارشتنی ئامانجگەلیکی یۆتۆپی لەو شیوەیە بە ریگەیەکی ئەقلانی بەلگە بهینمەوە. بە ریگەیەکی هاوشیوە دەتوانرێ ئەوە نیشان بدرێ کە ئەم کیشانە بە ئاسانی دەتوانن بە بەکارهینانی توندوتیژی بگەن، بۆ خۆی هەولیکە بە ئاراستەی بەلگە هینانەوەی ئەقلانی، هەتا ئەگەر رووی قسەکە تەنها لەو کەسانەش بیت کە لە توندوتیژی بیزارن.

ئەو ئیدیعایەی کە شیوازی یۆتۆپی، واتە ئەو شیوازەی کە دامەزراندنی کۆمەلگەیەکی نمونەیی کردوە بە ئامانجی خۆی و دەبێ هەموو کارە سیاسیەکانمان لە

خزمەتی ئەوەدا بیت، بە ئاسانی دەبیتە هۆی بەکارهینانی توندوتیژی، دەتوانرێ ئەمە بە وینە بسەلمینرێ:

لەو روانگەیەوە کە ناتوانین ئامانجی کۆتایی کارە سیاسیەکانمان بە میتۆدی زانستی یان بە میتۆدی ئەقلی رووت دیاری بکەین، کەوابوو جیاوازیی بیروبۆچوونەکان سەبارەت بەو مەسەلەیەی کۆمەلگای نمونەیی ئیمە دەبێ چ شیوەیەکی هەبێ، هەمیشە ناتوانرێ بە میتۆدی بەلگەهینانەوە لابەلابکرێ. بەلای کەمەوە هەندێ لەو جیاوازیانە خەسلەتی جیاوازیی ئاینیان هەیە. ئەستەمە لە نیوان دینە یۆتۆپیە جۆراوجۆرەکاندا شتیکی وەك لیك بوردن و نەرمونیانی بدۆزریتەوە. چونکە ئامانجە یۆتۆپیەکان وەکو بنچینەیەك بۆ خزمەتی باس و کاری ئەقلانی سیاسیدا لەبەرچاو گیراون. وا دیارە کاریکی وا تەنها ئەو کاتە مەیسەرە کە دەربارەی ئەو ئامانجانە بریاری بی چەندو چۆنی خۆمان دابێ. لەم روەوە یۆتۆپیاخواز دەبێ هەولی ئەوە بدات ئەو نەیارانە رازی بکات کە ئامانجەکانی ئەو قبول ناکەن و ناچنە سەر دینی یۆتۆپی ئەو و هەر کاتێ لەم کارەدا سەرکەتوو نەبێ، پەنا بۆ توندوتیژی دەبات، بەلام ئەو دەبێ کاریکی لەمە زیاتر بکات، دەبێ هەموو بیروباوەرە دژەکان و ئیلحادیەکان لە رەگەوە هەلبکەنێو لەناویان ببات. چونکە ریگای ئامانجی یۆتۆپیایی زۆر دریژە. ئەقلانیەتی کاری سیاسی یۆتۆپیاخواز داوای ئەوەی لیدەکات کە بۆ سەقامگیریی ئامانج لە ماوەیەکی دوورو دریژدا کۆمەلێ هەنگاو هەلبگرێ، بەلام کاریکی ئاوا بە مەرجیك دەکرێ کە دینە یۆتۆپیە نەیارەکان نەك تەنها سەرکوت بکریت، بەلکو تا رادەی مومکین هیچ یادەوەریەکیشیان لێ نەمینیتەوە. تەنانەت بەکارهینانی شیوازی سەرکوتکەرانە بۆ سەرکوتکردنی ئامانجەکانی نەیار لەوەش پیویست تر دەبێ، ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە ماوەی بنیات نانی (کۆمەلگای) یۆتۆپی لەوانەیە زەمانیك بیت کە گۆرانە کۆمەلایەتیەکانی تیدا روودەدات. بەلام لەو زەمانانەشدا ئەندیشەکانیش دەگۆرین، ئەوەی لە زەمەنی بریاردانی نەخشەی یۆتۆپیدا مومکین بوو بۆ زۆر کەس پیویست بێ، لە زەمانی دوای ئەوەدا رەنگە زۆریش پیویست نەیەتە بەرچاو. ئەگەر وایە، کەواتە هەنگاوی یۆتۆپی لە بەردەم مەترسی شکستدا دەبێ. چونکە ئەگەر دوا ئامانجە سیاسیەکانی خۆمان لە کاتیکدا کە بەرەو روویان دەچین بگۆرین، ئەوکاتە بە خیرایی هەست بەوە دەکەین کە لە بازنەیەکی داخراودا سەرگەردانین. ئەو شیوازەی کە سەرەتا ئامانجی کۆتایی سیاسی

خۆمان دیاری بكەین و پاشان هەول بدەین لیی نزیك بینەوە، لە كاتیكدا كە خودی ئامانجە كە لە كاتی رەوتی بەدیهاتنیدا رەنگە بگۆرێ، شیوازیكی تەواو سست و بێ پایەیە. رەنگە بە سادەیی ئەو هەنگاوانەی كە تا ئیستا بریومانە، ئیمەی لە ئامانجی كۆتایی تازەمان دورخستبیتەوەو ئەگەر ریرەوی خۆمان هاوریك لەگەڵ ئامانجە تازەكان خۆماندا بگۆرین، خۆمان خستۆتە بەردەم مەترسیەكی لەو جۆرەوە. سەرەرای تەحەمول كردنی هەموو جۆرە فیداركاریەك بۆ بە دەست هینانی دلنیایی لە كردەوەی ئەقلانی، رەنگە ریگاكە بەرەو (ناشوین) بەرین، هەرچەندە ئەم (ناشوینە) هەمان (ناشوین) نیە كە لە یۆتۆپیادا (المدینه الفاضلیة) دەردەكەویت.

جاریكی تر پیدەچێ تەنها ئامرازیك كە دەتوانیت ریگر بێ لە بەردەم گۆرانكاریەك لە دیاریكردنی ئامانجدا، بەكارهینانی توندوتیژیی یان بە دەربرینیكی دیكە بریتیە لە بەكارهینانی پروپاگەندە ریگرتن لە رەخنەو سەركوت كردن و تاساندنی نەیاران لە لایەكەوەو پاراستنی ژیری و پیشبینی نەخشەكیشان و ئەندازیارانی یۆتۆپایە لە لایەكی ترەوە كە نەخشەی یۆتۆپیان دارشتوە و پیادەی دەكەن. بەم شیوەیە ئەندازیارانی یۆتۆپیا دەبنە خاوەن دەسەلاتی رەهاو دانای هەموو كاروبارەكان و جیگەی خودا دەگرنەوە. و چیتر نابێ خودایەك لە تەنیشت ئەوانەوە بوونی هەبێ.

بەم پییە ئەقلانیەتی یۆتۆپی دوژمنی خۆیەتی. چەند ئامانجەكانیشی خیرخوازانە بیت، خۆشبەختی ناهینیت، بەلكو تەنها بەدبەختی ژیان لە حكومەتیكی دیكتاتۆردا كە بە چاكی پیی ئاشناین، بەرهەمەكەیەتی. تیگەیشتنی دروست لەم رەخنەكاریە، كاریكی گرنگە. من رەخنە لە بنچینەی ئەم ئایدیالە سیاسیە ناگرم، هەتا لافی ئەوەش لینادەم كە ئایدیا سیاسیەكان هەرگیز بەدی نایەن، چونكە لەم حالەتەدا رەخنەكەی من كەموكورتی تیدایە. زۆر ئایدیال بە كردەوە بەدی هاتن كە خەلك سەردەمانیك بە دەمارگرژییەوە بە ناواقیعیان دەزانین؛ وەكو دامەزراندنی دامودەزگای كارامەو دیموكراتی بۆ زامن كردنی ئاسایشی هاوولاتیان یان بە دەربرینیكی تر بۆ رووبەرووبوونەوەی تاوان لەناو خاكی ولاتدا. هۆیەك نابینم بۆ ئەوەی كە دادگاو هیزی پۆلیسی نیودەولەتی لە رووبەرووبوونەوەی تاوانە نیودەولەتەكان و رووبەرووبوونەوەی دەستدریژی و بەدرەفتاریی لەگەڵ كەمایەتیەكانداو هەتا لەگەڵ زۆرینەكانی ولاتیكدا، سەركەوتنی لەو جۆرەی بەدەست نەهینابێ. رەخنەم لەو هەولانە نیە كە بۆ ئەم ئایدیایە، دراون.

کەواتە جیاوازی نێوان نەخشە یۆتۆپییە خێرخوازەکان، کە نارەزایی من لە بەرامبەریاندا لەو ڕووەوەیە کە بە زۆرو توندوتیژیی تەواو دەبن، لەگەڵ ئەو ریفۆرمە گرنگ و دوورە سیاسیانەی کە من پێشنیازیان دەکەم لە کوێدایە؟ ئەگەر بمەوێ فۆرمۆلیکی سادەو نوسخەیەك بۆ دەربڕینی جیاوازیی لە نێوان ئەو ڕێ و شوێنانەی قابیلی قبول کردنن بە مەبەستی ریفۆرمی کۆمەڵایەتی و ئەو نەخشە یۆتۆپیانەی کە قابیلی قبول نین بخەمە ڕوو، دەڵێم: "زیاتر بۆ چاککردنی خەوشە دیارەکان هەوڵ بدە، نەك بۆ بەدیهاتنی ئایدیالە رووتەکان. هەوڵ مەدە بە هۆکارە سیاسییەکان ئینسانەکان خۆشبەخت بکەی، بەلکو هێزی خۆت بۆ لەناوبردنی بەدبەختییە دیارەکان بەکاربێنە".

ڕووی پراکتیکی تری ئەم قسەیە بەم شێوەیە بە ئامرازی ڕاستەوخۆ خەبات بۆ لەناوبردنی هەژاریی بکە –بۆ نموونە زامن کردنی لایەنی کەمی ماف بۆ هەر کەسێك– بە دروست کردنی نەخۆشخانەو مەلبەندی ڕاهێنانی تەندروستی لە دژی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی خەبات بکە. لە دژی نەزانین بە هەمان شێوە خەبات بکە کە لە دژی تاوان دەیکەی. بەڵام هەموو ئەم کارانە بە ئامرازی ڕاستەوخۆ ئەنجام بدە. تەماشابکە لەو کۆمەڵگایەی تیایدا دەژیت چ شتێك خراپترینە، هەوڵ بدە بە هێواشی قەناعەت بە خەڵکی بکەی کە دەتوانن لە شەڕی ئەو شتە خراپە ڕزگار بن. بەڵام هەوڵ مەدە ئەم ئامانجانە بە شێوەی ناڕاستەوخۆو بە دارشتنی نەخشەیەکی ئایدیالی دوورو کۆمەڵایەتی تا ڕادەی کەمال بەدی بێنی. هەرچەندە لە خەیاڵدا خۆت بە پابەندی ئیلهام بەخشی ئەو ئایدیالە بزانی، گومانم نیە کە ئەرکی تۆیە لە پێناوی بەدی هاتنیدا تێبکۆشی یان ئەرکی سەرشانی تۆیە لە ئاستی جوانی ئەو ئایدیالەدا چاوی کەسانی دی بکەیتەوە. ڕێگە بە خەونەکانی جیهانی جوانت مەدە بەدبەختی واقیعی ئەو خەڵکانەی ئێستا لەنێو ئێمەدا ئازار دەچێژن نەبینی. هەموو مرۆڤەکان مافیان هەیە کە داوای یارمەتیمان لێ بکەن، هیچ نەوەیەك نابێ ببێتە قوربانی بۆ نەوەی داهاتوو، قوربانییەکی ئایدیالی کە ڕەنگە هەرگیز نەتوانین پێی بگەین. بە کورتی: پێشنیازی ئەوەیە کە ئازارو ژانی ئینسانی کە قابیلی خۆلێلادانە، دەبێ وەکو پێویست ترین مەسەلەی سیاسەتی گشتی ئەقڵانی بناسرێ. ئەمەش لە کاتێکدایە کە داخوازی خۆشبەختی نابێ وە کو مەسەلەیەکی سیاسی لێ بێت: گەڕان بە دوای خۆشبەختیدا بخەرە ئەستۆی داهێنانە تایبەتیەکانمانەوە.

واقیع ئەوەیەو نابێ پیمان سەیربێ، کە ئەوەندەش سەخت نیە کە سەبارەت بە تەحەمول نەکراوترین خراپی کۆمەلگاکەمان و ئەوەی کام ریفۆرمی کۆمەلایەتی لە هەموو ئەوانی دی پیویست ترە، بە دیالۆگ پیك بیین.

گەیشتن بە پیکهاتنیکی لەو جۆرە لە گەیشتن بە پیکهاتنیك دەربارەی شیوەی ئایدیالی ژیانی کۆمەلایەتی ئاسانترە. چونکە خراپی لیرەو ئەمرۆ لەنیو خۆماندا دەبینین و زۆر جار لەبەرچاون، دەتوانین ئەمانە تاقی بکەینەوە. رۆژانە خەلکیکی زۆر لە ئەنجامی هەژاری و بیکاری و ستەمی میللی و جەنگ و نەخۆشیدا دەچنە پەراویزی هەژاری و بیچارەییەوە، هەست بەو وەزعە دەکەن. ئەو کەسەی کە بۆ خۆی دوچاری ئەم کیشانە نەبوە، رۆژانە رووبەرووی ئەو کەسانە دەبیتەوە کە دەتوانن لە بارەی ئەو هەژارو نەدارانەوە قسەی بۆ بکەن. ئەم دیاردانەن کە سەبەبکاری هەژاری و بیچارەیی دیاریکراون، ئەمە بۆ خۆی بەلگەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەگەر لە بارەیەوە قسەوباس بکەین، دەتوانین بگەینە پیکهاتنیك و سوود لە روانینی ئەقلی وەربگرین. ئیمە لە ریگەی گوێ گرتنەوە لە خواستە تایبەتیەکان و هەولی پشوودریژانەوە بۆ هەلسەنگاندنی دادپەروەرانەو بێ لایەنانە ئەوەندەی لە توانامان دا بێ، فیردەبین و دەتوانین بە شوین ئەو ریگەو هۆکارانەدا بگەریین کە پیویستترین داخوازییەکان جیبەجێ دەکات، بەبێ ئەوەی خۆمان ببینە هۆی خراپتر بوونی بارودۆخەکان.

بەلام مەسەلەکان سەبارەت بە خیری ئایدیال بە تەواوی جیاوازە، خیری ئایدیال و رەها، ئەبستراکتە: لە ریگەی خەونەکانی خۆمان و خەونەکانی شاعیران و پەیامبەرانەوە پیی ئاشناین. ئایدیالی لەم جۆرە ناکرێ دیالۆگی لەسەر بکرێ، بەلکو تەنها دەبێ بە رەسمی رابگەیەنرین. ئەم ئایدیالانە ناکەونە ژیر روانینی رەخنەگرانەو ئەقلی داوەرانی بیلایەنەوە، بەلکو پیویستیان بە روانینی عاتفی ئامۆژگاریکارانی پر جۆش و خرۆشە.

بەم شیوەیە روانینی یۆتۆپیانە خالی بەرامبەری روانینی ئەقلانیە. یۆتۆپیاخوازی، هەتا ئەگەر بچیتە قالبی ئەقلانیەتیشەوە، شتیك نیە جگە لە ئەقلانیەتیکی درۆزنانە.

کەوابوو هەلەی ئەو بەرگهینانەوە بە روکەش ئەقلیانە لە کویدایە لە بارەی یۆتۆپیاوە، من هەندیك نمونەم خستەروو؟ ئەوەم قبولە کە ئەقلانیە کاریك تەنها لەسەر بنەمای ئامانج یان مەبەستی دیاریکراوی ئەو کارە دەتوانرێ هەلسەنگینرێ. بەلام ئەوە بەو مانایە نیە کە دەربارەی ئەقلانیەتی کاری سیاسی بە سەرنجدان لە دوا ئامانجی پۆزەتیڤی میژوویی، هەلسەنگاندن بکرێ. بە حساب کردن بۆ ئامانجی

رۆژانە خەلکیکی زۆر لە ئەنجامی هەژاری و بیکاری و ستەمی میللی و جەنگ و نەخۆشیدا دەچنە پەراویزی هەژاری و بیچارەییەوە

ئیجابی میژوویی. بیگومان مەعنای ئەوە نیە کە هەر باریکی کۆمەلایەتی یان سیاسی تەنها دەبێ لە روانگەی ئایدیالی میژوویی لە پیشدا وینا کراویان لە روانگەی ئامانجی کۆتایی بریار لەسەر دراوی پەرەپیدانی میژووییەوە تەماشا بکرێ؟) بە پیچەوانەوە ئەگەر ئامانج و مەبەستمان بە جۆریك لەگەل خۆشبەختی یان بەدبەختی ئینسانەکاندا پەیوەست بێ، ئەوکاتە نابێ کارەکانمان تەنها لەسەر بنەمای ئەوەی کە لە ئایندەی دووردا لە خۆشبەختی یان بەدبەختی مرۆڤەکاندا چ پشکیکی هەیە، داوەری بکرێ بەلکو دەبێ کاریگەرییە راستەخۆکانی ئەوانە لە حالی حازریشدا بخریتە بەر سەرنج و داوەرییەوە)؟!.

هەرگیز نابێ فلان باری کۆمەلایەتی تەنها وەکو هۆکاریکی رووت لە ریگەی گەیشتن بە ئامانجی کۆتاییدا لیك بدەینەوەو بەهانەمان ئەوە بێ کە ئەو بارە میژووییە تیپەر دەبێ؛ چونکە هەموو بارودۆخەکان تیپەر دەبن. هەروەکو نابێ وا بیربکریتەوە کە ئازارو ژانی نەوەیەك دەتوانرێ وەکو وەسیلەیەکی رووت بە مەبەستی دابین کردنی خۆشبەختی نەوەی دوای ئەو (یان نەوەکانی دوایی) لیك بدریتەوە، ئەم بەلگەهینانەوەیە نە دەتوانرێ بە رادەی بالای خۆشبەختی بەلین پیدراوو نە بە زۆر بوونی ژمارەی نەوە خۆشبەختەکانی ئایندە باشتر بکرێ. هەموو نەوەکان رەوتەنین. هەموو نەوەکان مافی یەکسانیان هەیە کە بایەخیان پێ بدرێ. بەلام ئەرکی خیرای ئیمە بیگومان بایەخدانە بە نەوەی ئیستاو ئایندە. سەرەرای ئەمە نابێ هیچ کاتێ هەول بدەین بەدبەختی نەوەیەك بە خۆشبەختی نەوەیەکی تر پاداشت بدەینەوە.

بەم شیوەیە بەلگە بە رووکەش ئەقلیەکانی یۆتۆپیاخوازی بێ بایەخ دەبێ، کۆشش و ئەفسونگەریی ئەو ئایندەیە کە یۆتۆپیاخوازی وینە دەکات، هیچ ئاشنایەتیەکی لەگەل دووربینی ئەقلانیدا نیە، لەم روانگەیەوە زالبوونی ئەو توندوتیژییەی لە یۆتۆپیاخوازیەوە سەرچاوەی گرتوە زیاتر لە شیتی فەلسەفەی کامل گەرایانەی میژوو، میژووگەری شیت ئامیز دەچێ بە پیی ئەوەی دەبێ حالی حازر بکریتە قوربانی شکۆو گەورەیی ئایندە؛ و دەرك بەو واقیعە ناکەین کە پرانسیپیکی لەو جۆرە بۆ ئەو شوینەمان دەبات کە یەك بە یەکی مساوەکانی ئایندەش بکەینە قوربانی ماوەی دوای خۆی و لەو راستیە سادەیە بیئاگایە کە سەرئەنجام هەر مرۆڤیك- چارەنووسی هەرچیەك بیت- لە کۆتاییدا جگە لە مەرگ و خامۆشی شتیکی دیکە نیە.

جازیبەی یۆتۆپیاخوازی لەو غەفلەتەوە سەرچاوە دەگریت کە بە روونی نازانین، کە ناتوانین لەسەر پانتایی زەمین بەهەشت بخولقینین. ئەوەی کە بە چاو دەتوانرێ ئەنجام بدرێ کەم کردنەوەی ئازار و عادیلانە کردنی ژیانی هەر نەوەیەکە. بەم شیوەیە زۆری ئەو کارانەی کە دەتوانرێ ئەنجام بدرێ و زۆری ئەو کارانەی کە لەم دوا سەدەیەدا ئەنجام دراون و رەنگە نەوەی ئیمەش دەسکەوتی زیاتر بە دەست بینێ. زۆر مەسەلە دەمیننەوە کە دەبێ بەلای کەمەوە بەشیکیان چارەسەر بکرین، وەکو یارمەتی دانی پەککەوتەو نەخۆشەکان و ئەوانەی کە گرفتاری ناعەدالەتی و ستەمن. لەناوبردنی بیکاری و فەراهەم کردنی ئیمکاناتی بەرامبەرو ریگەگرتن لە تاوانی نیودەولەتی، وەکو باج خوازی و جەنگ کە راهینەری مرۆڤە خودا شیوەکان و پیشەوایانی قەدەری دەسەلات و هەموو شتیك زانە. هەموو ئەم ئامانجانە دەتوانرێ بە دەست بهینرین. ئەگەر لە خەوی ئایدیالە دوورو دریژەکان بیداربینەوەو دەست لە کیشەو ململانێ لەسەر نەخشە یۆتۆپیەکان بۆ جیهان و مرۆڤ هەلبگرین. ئەوانەی کە باوەریان بە مرۆڤ هەیە بەو شیوەیەی کە هەیەو لەو روەوە ئومیدی لەناوبردنی توندوتیژی و نائەقلانیان لە دەست نەداوە، دەبێ بخوازن هەرکەسێ مافی هەبێ بە دلی خۆی ژیانی خۆی ریك بخات، بەو مەرجەی لەگەڵ یەکسانیی مافی کەسانی دی بسازێ. لیرەدا دەتوانرێ ئەوە بەدی بکرێ کە مەسەلەی ئەقلانیەتی راستەقینەو درۆینە بەشیکە لە مەسەلەیەکی گەورەتر؛ لە کۆتاییدا کیشەکە لەسەر روانینی ئەقلانی و تەندروستە سەبارەت بە وجودی خودو سنوورەکانی ریك ئەمە هەمان کیشەیە کە ئیستا بەناو وجودیەکان کە بانگەشەکاری ئیلاهیاتی بێ خودان، ئەو هەموو جەختەی لی دەکەنەوە، بەرای من رەگەزیکی دەمارگرژ و رەنگە شیتی ئامیز لەم تەئکیدە پر لە زیادە رەویەدا لەسەر تەنیایی بنچینەیی مرۆڤ لە جیهانی بێ خوداو پر لە پیکادان لە نیوان (من) و جیهان)ی بەرهەمی ئەوەدا خۆی حەشار داوە.

گومانم نیە ئەم شیتیە لەگەڵ رۆمانسیەتی یۆتۆپیو ئەخلاقی قارەمان پەرستیدا تیکچرژاوە؛ لەگەڵ ئەخلاقیك تیکچرژاوە کە دەرك کردنی لە ژیاندا لە دروشمی (ژیان ببە بە ئاغا، یان کۆیلەبە) کورت دەکریتەوە. گومانم نیە لەوەی نهینی بەهیزی جازیبەی ئەم ئەخلاقە خۆی لەم شیتییەدا حەشارداوە. هەتا لە بواری ئایندا کە بە رووکەش زۆر لە ئەقلانیەتەوە دوورە– دەتوانرێ وینەی هەمان رووبەڕووبوونەوەی ئەقلانیەتی راستەقینەو درۆینە بەدی بکرێ و ئەمەش بۆ خۆی ئەوە نیشان دەدات کە مەسەلەی ئیمە بەشیکە لە مەسەلەیەکی گەورەتر. بیریارانی مەسیحی بەلای کەمەوە بە

دوو شێوەی تەواو جیاواز گوزارشتیان لە پەیوەندی نیوان مرۆڤ و خودا کردوە. گوزارشتی تەندروست دەتوانرێ بەم شێوەیەی خوارەوە بخریتە روو "ئەوە لە یاد مەکە کە مرۆڤ خودا نیە بەڵام پزیسکی خودایی لە وجودی ئەودا هەیە" دەربرینی تر دەربارەی پەیوەندی نیوان مرۆڤ و خودا دەکەویتە خانەی زیدەرۆییەوە. هەم لە خاکەسەری و زەبوونی مرۆڤدا زیدەرەوی دەکات و هەم لە چەند پلەیەکدا کە مرۆڤ دەتوانیت دەستی پییان بگات، ئەخلاقی (ئاغاو کۆیلە) بەرەو پەیوەندی نیوان مرۆڤ و خودا دەبات. نازانم رەنگە خەونەکانی هەست و نەستی خودایی و دەسەڵاتی باڵا بنەمای ئەم روانینە بیت بەڵام ناتوانرێ ئەوە نادیدە بگیرێ کە جەخت لە رادەبەدەر لەسەر پیکادانی نیوان مرۆڤ و خودا لە روانینی ناهاوسەنگ و ناکامل بۆ مەسەلەی دەسەڵات قوت بۆتەوە.

ئەم روانینە ناهاوسەنگ و ناکاملە، شەیدای مەسەلەی دەسەڵاتە، نەك تەنها شەیدای مەسەلەی دەسەڵاتە بەسەر سەراپای خەلکدا، بەلکو شەیدای مەسەلەی دەسەڵاتە بەسەر سروشت و ژینگەی ئیمەشدا. ئەم "باوەرە درۆینە" (کە بە بەراورد لەگەڵ (ئەقڵانیەتی درۆینەدا) ئەو ناوەی لی دەنیم، نەك تەنها سەرسامی دەسەڵاتی خودایە بەسەر مرۆڤدا، بەلکو شەیدای دەسەڵاتی خۆشیەتی تا جیهانیکی (ئایدیالی) بخولقینێ.

ئەقڵانیەتی درۆینەش بە شیوەیەکی هاوشیوە لە دووی ئەو خەیالەیە کە ماشینی زەبەلاح و کۆمەلکاری یۆتۆپی بخولقینێ.

دروشمەکەی بیکون کە دەلیت (زانست دەسەڵاتە) و دروشمی ئەفلاتونی (حکومەتی حەکیمان) تەنها گوزارشتی جۆراوجۆری ئەم روانینەن کە بنەمای ئیدیعا یان دەسەڵات و هۆشمەندی زیاترە. بەڵام ئەقڵانی واقیعی هەمیشە دەزانیت کە چەند کەم دەزانیت و هەروەها ئاشنای ئەم واقیعە سادەیەیە کە هەرچی ئەقلیکی هەیە، قەرزاری ئالوگۆری ئەندیشەیە لەگەڵ تەواوی ئینسانەکاندا لە رووی مافەوە بە یەکسانی بزانێ و ئەقلی مرۆڤ بە هیلیك بزانیت کە مرۆڤەکان پیکەوە دەبەستێ و دەیانکات بە یەك جەستە. ئەقل بەلای ئەوەوە راست دژی ئامرازی دەسەڵات و بەکارهینانی توندوتیژییە؛ ئەقل بە وەسیلەیەك دەزانیت کە دەتوانرێ توندوتیژیی و سەرکوت کردنی پێ رام بکرێ.

**سەرچاوە:** گۆڤاری (کیان) ژمارە (٤٥)

تورستێن تورێن (Torsten Thuren)

# تیۆری زانستی بۆ خوێندکاری نوێ*



مارکس

و. لە سویدیەوە: مەهاباد قەرەداغی

### ١-بیرکردنەوەی زانستییانە:

هەندێ جار دەوترێ لەم سەردەمەی ئێمەدا زانست جێگەو ڕۆڵی ئاینی گرتۆتەوە، ئەوەی زانست دەیڵێت مرۆ باوەڕی پێدەکات وەك ئەوەی جاران باوەڕ بە وشەکانی خودا دەکرا. بەلام لەم ساڵانەی دواییدا زۆر کەس دەستی بەوە کردوە وەکو کارێکی شەیتانی لە زانست بڕوانێ. ئەوە زانستە کە چارەنووسی زەمینی لە بەردەم شەڕی ئەتۆمیدا داناوە، ئەوە زانستە کە لە پشت ژەهراویبوونی ژینگەوە ڕادەوەستێ، بەلام یان ئێمە ئاواتەخواز دەبین زانست فریادڕەسمان بێت، یان دەترسێین کە بەرەو مەترسی گەورەمان ڕاپێچێ. ئێمە وەکو بەهایەکی گەورە لە زانست دەڕوانین. وەکو شتێ کە لە سەرەوەی کێشەکانی ڕۆژانەوە خۆی دەنوێنێ.

به‌ باوه‌ڕی من ده‌بوایه‌ بمانتوانیبا ڕۆڵی دراماتیكیانه‌ی زانست نه‌هێڵین و تێڕوانینی هه‌ستیاری ئاینیانه‌ له‌ زانست دووربخه‌ینه‌وه‌. من وایده‌بینم -كه‌ بۆ خۆشم هاوده‌می ئه‌م تێڕوانینه‌م- كه‌ جیاوازیه‌كی پرنسیپی له‌ نێوان بیركردنه‌وه‌ی زانستی‌و بیركردنه‌وه‌ی ڕۆژانه‌دا نیه‌، پرسه‌كه‌ پرسی پله‌ی جیاوازیه‌ نه‌ك جۆری جیاوازی.

هه‌ر لێپرسراوێكی كاروباری كۆمه‌لایه‌تی كه‌ كار له‌سه‌ر لاده‌رو ئه‌لكهولیسته‌كان (مه‌یخۆره‌كان) ده‌كات ده‌بێ ئه‌و پرسیاره‌ بكات، چی ده‌بێته‌ هۆی ڕاهاتن به‌ مه‌ی‌و ماده‌ سڕكره‌كان، له‌وێوه‌ بناغه‌یه‌ك دابنێت بۆ چۆنێتی بنبڕكردنی ئه‌و دیارده‌یه‌. ئه‌مانه‌ پرسیارگه‌لێكی قورس و ناكۆكن و كه‌ لێكۆڵه‌ره‌وه‌كان له‌ بابه‌تگه‌لێكی زۆردا ململانێیانه‌ له‌ سه‌ری.

هه‌ر ڕۆژنامه‌وانێك كه‌ ڕووداوێكی سیاسی داده‌ڕێژێت، به‌شداری له‌ نووسینه‌وه‌ی مێژوو یان به‌شداری شیرۆڤه‌ی زانستی ده‌وڵه‌تداری ده‌كات، هه‌ر فه‌رمانداریك له‌سه‌ر تاوانێك بڕیار له‌سه‌ر تاوانباربوون یان تاوانبارنه‌بوونی یه‌كێك ده‌رده‌كات، به‌ پرنسیپ هه‌مان شێوازی بیركردنه‌وه‌ به‌كارده‌بات وه‌ك مێژوونووسێك به‌كاریده‌بات. هه‌ردووكیان هه‌وڵی دووباره‌ نواندنه‌وه‌ی قۆناغه‌كانی ڕووداوێكی ڕابردوو ده‌ده‌ن.

هه‌ر مامۆستایه‌ك -هه‌موو دایك و باوكێك- له‌ كاتی وانه‌وتنه‌وه‌و په‌روه‌رده‌كردندا ده‌روونناسی پراكتیك ده‌كه‌ن. وه‌كو هه‌لبژێره‌ریك ناچارین هه‌موو ئه‌و پرسانه‌ تاوتوێ بكه‌ین، بۆ نمونه‌ مانای باج بۆ هاوسه‌نگ كردنی ده‌رهاته‌كان، ته‌واوی به‌رهه‌می نه‌ته‌وه‌یی‌و كاره‌كانی‌و هه‌موو پرسه‌كانی كه‌ په‌یوه‌ندییان به‌ ئابووری نه‌ته‌وه‌ییه‌وه‌ هه‌یه‌، ده‌گریته‌وه‌.

وه‌ك هاوگه‌ردوونییه‌كیش هه‌ریه‌ك له‌ ئیمه‌ بیه‌وی یان نه‌یه‌وی ئه‌و كیشانه‌ی كه‌ په‌یوه‌ندییان به‌ ژینگه‌وه‌ هه‌یه‌ وه‌كو فیزك و كیمیاو بیۆلۆژی سه‌رقالی ده‌كه‌ن.

كه‌وابوو پرسیاری زانستییانه‌ له‌ ژیانی ئیمه‌، چ وه‌ك كارمه‌ندیك و چ وه‌ك هاولاتییه‌ك، له‌ هه‌موو شوینیكدا ئاماده‌یه‌، هه‌روه‌ها میتۆده‌ زانستییه‌كان -له‌ ئاستی نزم یان به‌رزدا- له‌ هه‌موو شوینیكدا پیویستن، زۆر ناسه‌ركه‌وتوانه‌و كاری نه‌كرده‌ ده‌بوو ئه‌گه‌ر بواری لیكۆله‌رو پسپۆڕه‌كانمان بدابایه‌ له‌ هه‌موو پرسیكدا له‌ جیگه‌ی ئیمه‌ گفتوگۆیان بكردایه‌، بۆیه‌ هه‌موو مرۆڤیك پیویستی به‌ كه‌مێ شاره‌زایی له‌ بیركردنه‌وه‌ی زانستییانه‌و رامان له‌سه‌ر زانست و تیۆری زانستی، هه‌یه‌، به‌لام كه‌ بیركردنه‌وه‌ی زانستی پیویسته‌ بۆ هه‌موان، مانای ئه‌وه‌ نیه‌ كه‌ شتیكی ئاسانه‌،

پرسیاری زانستییانه له ژیانی ئیمه، چ وه‌ك كارمه‌ندیك و چ وه‌ك هاولاتییه‌ك، له هه‌موو شوینیكدا ئاماده‌یه، هه‌روه‌ها میتۆده زانستییه‌كان -له ئاستی نزم یان به‌رزدا- له هه‌موو شوینیكدا پیویستن

بە پێچەوانەوە، كێشە گەورەكە ئەوەیە، وەك دەبێ بیزانین، كە واقیع ڕەنگە زۆر ئالۆزتر بێت لەوەی كە زانستێكی وردبینانە بتوانێ ڕاست بۆی چووبێت و شیبكاتەوە.

ئەم نووسراوە بۆ ئەوەیە كە وەك سەرەتایەك بۆ شێوازی بیركردنەوەی زانستی ببینرێت. من هەوڵی ئەوەم داوە نمونەكانم وەك چۆن لەناو زانستەوە. ئاوهاش لەناو ژیانی ڕۆژانەوە هەڵبژێرم. ئەو زانستانەی كە من بە پلەی یەكەم مامەڵەم لەگەڵ كردوون. كۆمەڵناسیو زانستە مرۆڤایەتیەكانە، ئەوانەی كە بۆ بیركردنەوەی ڕۆژانە نزیكترن لێمانەوە. هەندێ جار دێمە ناو زانستی سروشتیشەوە. دەمەوێ جەخت لەسەر ئەوەش بكەم كە جیاوازی نێوان زانستی سروشتیو ئەو زانستانەی كە پەیوەندیان بە مرۆڤ و هەلومەرجەكانی مرۆڤەوە هەیە زۆرە. لێرەدا وەك وترا بە شێوەیەكی سەرەكی لە بارەی زانستە مرۆڤایەتیەكانەوەیە.

پێش ئەوەی بە تەواوی دەست بە ڕاڤە بكەم، پێویستە ئاگاداریەك بدەم. ئەمە پرسی سەرنجدانێكی دژوارە لە لقێكی سەخت. دەكرێ ڕەخنە ئاراستەی هەموو ئەوانەی من وتومن بكرێو بوترێ ئەمە تێڕوانینێكی نوێ نیەو ئاسان وتراوە. بەڵام {دەبێ لە شوێنێكەوە دەستپێبكرێ}. هیوادارم ئەم لاپەڕانە یارمەتیدەر بن لە كاتێكدا كە خوێندنەوەیەك یان گفتوگۆیەك لە بارەی بابەتێكی ڕۆژنامەیی، پڕوپاگەندەیەكی سیاسی، كتێبی بابەتە جیاوازەكان و.. هتد دەخوێنیتەوە، هەروەها لە كاتێكدا كە خۆت دەتەوێ لێكۆڵینەوەیەك لەسەر بناغەی بۆچوونەكانی خۆت لەسەر پرسە جیاوازەكان بنووسی.

ئەم نووسراوە بۆ ئەوەیە كە وەك سەرەتایەك بۆ شێوازی بیركردنەوەی زانستی ببینرێت.

### ٢-گەڕان بە دوای ڕاستیدا:

تیۆری زانستی، لە ڕاستیدا گرنگترین شتێكە كە مرۆ خۆی بۆ تەرخان بكات. لە سەرووی هەموو شتێكەوەو بناغەی هەموو گفتوگۆیەكە، پرسی گەورەو فراوان دەتوانرێ بەم شێوەیە فۆرمۆلە بكرێ: ئایا ئێمە لە سەرووی هەموو شتێكەوە دەتوانین شتێك بزانین، یان هەموو ئەو شتانەی كە پێیان دەوترێ ڕاستی ڕێژەیین؟

هەر مرۆڤێك كە ژیانی بە جیدی وەرگرتبێ لەم پرسیارە خۆی نابوێرێ، ئەمە سەبارەت بەوەیە كە من تا چ ڕادەیەك بتوانم گفتوگۆ لەسەر ئەو پرسانە بكەم كە پێم وایە گرنگن، سیاسی، كۆمەڵایەتی، مرۆڤایەتی، ئەمە پەیوەندیدارە بە زانستەوە بە هەردوو بارەكەیدا، هەم بە مانای ڕاستییەكەیو هەمیش كەم و زۆر بە ماناو ناوەڕۆكە

ڕۆژانەکەی. بەردەوامی ئەم کتێبە سەبارەت بەوە دەبێ کە چۆن بە شێوازی جیاواز کێشەیەك تاوتوێ بکرێت.

پرسی تیۆری زانستی دەتوانرێ بە دوو بەڵگەنەویست کە پێکەوە دژە بۆچوونێك پێکدەهێنن کورتبکرێتەوە:

*زانست بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێت.

*زانست بە بێ وەستان بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت.

زانست بە دوای ڕاستیدا دەگەڕێ. بەڵگەنەویستێکە کە پێویستی بە گفتوگۆ نیە، ئەمەیە بێگومان کە زانست لێی هەڵدەهێنجێ: ئەوەی کە بڕوانێ لە واقیعدا چۆن دەنوێنێ. لە هەمان کاتدا جەخت کردن لەسەر زانست ئەوەیە کە هەمیشە بەرەو پێشەوە دەڕوات. یان لای کەم گۆڕانی بەسەردا دێت –بە جیاوازی لەگەڵ ئاین کە لایەنگری ڕاستی ڕەهایە. گۆڕانکاریش ئەوە ناگەیەنێ کە تەنها هەندی ڕاستی بخرێتە سەر باڵەخانەی زانست. مەرجی گەشەسەندنی زانست فڕێدانی بۆچوونە کۆنەکانیشە.

تێڕوانینی ئێمە بۆ ستاتووی مرۆڤ لە سروشتدا تێڕوانینێکی تەواو جیاوازە لەوەی لە پێش چاڕلس داروینداهەبوو. کە ئێمەی مرۆڤ لە ئەنجامی هەڵبژاردەیەك لە باوباپیری شێوە مەیموون گەشەمان کردووە لە کاتی خۆیدا زاراوەیەکی ڕاچڵەکێنەر بوو. ئەمڕۆ فێربوون لە بارەی گەشەسەندنەوە دەچێتە خانەی زانیاری گشتییەوە.

تێڕوانینمان دەربارەی دەروونی مرۆڤ لە ئەمڕۆدا بە تەواوی تێڕوانینێکی ترە لەوەی لە پێش سیگمۆند فرۆیددا هەبوە. کە دەوترێ مرۆڤ لە ئەنجامی ڕەمەکە نائاگاییەکانەوە بەڕێوەدەچێت لە سەرەتای سەدەی بیستدا وەك ئابڕووچوونێك دەبینرا. ئەمڕۆ هەر ڕۆمانەو لەسەر بناغەی شیکاری دەروونی بیرەکانی داڕێژراوە.

تێڕوانینمان بۆ دروستبوونی گەردوون ئەمڕۆ تەواو تێڕوانینێکی ترە لەوەی پێش ئەنیشتاین. کە کات ڕێژەییەو شوێن چەماوەیە پێشتر وەك نەگونجاوەکان دەبینرا. ئەمڕۆ بەسەرهاتە زانستیەکان و فیلمە بەناوبانگەکان لەو بابەتانە دەدوێن.

ئەم ناکۆکییەیە کە ئێمە دەربارەی زانست هەمانە: ئەگەر زانست بە بەردەوامی بەرەو پێشەوە دەڕوات، کەواتە هەرگیز ناتوانین شتێك بە دڵنیاییەوە بزانین. ئەگەر ڕاستیەکانی دوێنێ ناڕاستیەکانی ئەمڕۆ بێت، هەر بەو جۆرەش ڕاستیەکانی ئەمڕۆ دەتوانێ ببێتە ناڕاستیەکانی سبەینێ. بە واتایەکی تر، ڕاستیە زانستیەکان کاتین، دوو شێوەی گوزارەکردن لەم ناکۆکیە زانستیە هەیە کە من پێم وایە

ئەم ناکۆکییەیە کە ئێمە دەربارەی زانست هەمانە: ئەگەر زانست بە بەردەوامی بەرەو پێشەوە دەڕوات، کەواتە هەرگیز ناتوانین شتێك بە دڵنیاییەوە بزانین

هـەردووكیان نـاتوانن قایلكـەر بـن، مـن ناویـان دەنێـم دۆگمـاتیزم (وشـكەبڕوایی)و، ڕیاڵەتیڤیزم (ڕێژەیی).

وشكەبڕواكان خاترجەمن، ئەوان دەزانن چی ڕاستیە، ڕۆشناییان دیوە، پێغەمبەری گەورە ئەو پرنسیپەی تاقانە ڕاستی دۆزیوەتەوە.

باوەڕەكـان بە بـازاڕی ئـازاد باوەڕیـان وایـە هـەر كـە بـەر بـە هێزەكـانی بـازاڕ ئـاوەڵا بكرێ، هەموو كێشەكان لە خۆیانەوە چارەسەر دەبن.

باوەڕەكان بە ماركسیست هەموو شتێ بە چاویلكەی ماركسیستی دەخوێننەوەو هەڵەیەك لە بیروباوەڕی باوكە فێركارەكەیان نابیننەوە.

بیۆلۆژێك كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی وەكو بەرهەمێك لە بەرهەمەكانی ژێنەتیكی مرۆڤ دەبینێ، دەروونناسێك مێژووی مرۆڤایەتی وەك دەرەنجامێكی ئەزموونەكانی منداڵی سیاسەتمەداران دەبینێ‌و، هتد.

بە داخەوە، بوون هێندەش سانا نیە، هەمیشە شتێك هەیە كە لەگەڵ ئەم تیۆریە قەشەنگ و وروژێنەرە ناگونجێ، ئێمە لە درێژەی ئەم باسانەدا گفتوگۆ لەسەر شێوازی جیاوازی تاوتوێكردنی ئەم نەگونجاوانە دەكەین، چارەسەری وشكەبڕواكان ئەوەیە كە نەگونجاوەكان ڕەتدەكەنەوەو نایگرنە خۆیان، ئەو وا لێكی دەداتەوە: "بێگومان هەندێ ڕاستی دژی ئەوەیە كە من بۆی چووم، بەڵام ئەو ڕاستیانە ناشێ ڕاست بن، بۆیـان نیـە ڕاسـت بن، هـەموو جیهانبینیەكەی مـن هـەرەس دێنـێ ئەگـەر ئـەوان ڕاسـت بـن، بۆیـە نامەوێ باوەڕیان پێبكەم". بەم شێوەیە وشكەبڕواكان یەكلا دەبینن و ڕوناكی ناخەنە سەر ئەوانەی بیرێكی جیاواز لە هی ئەوان دەردەبڕن.

بەو شێوەیە دەكەوێتە نێو بیابانی دۆگماتیزم، دابڕاو لـەو پەیوەندیـە زینـدوەی كە بۆچوونەكانی تری جیاواز لە هی خۆی پێكیدەهێنن. بـەڵام ئـەو ڕۆژە دێـت كـە ڕەنگـە ئەوە ئاشـكرا بكات كە ئـەو پرنسیپە گەورەیـە پێوەرەكـان هـەڵناگرێ‌و نـاتوانرێ چیتر نكۆڵی لەو ناماقوڵیە بكرێت، بۆیـە وشـكەبڕوا تووشـی ئەفسـوس دەبێـت و ڕەنگـە ڕێك پیچەوانـەی خالـە بناغەییـەكان بوەسـتیتەوە. ئەمـە ریـك وەكـو ئەوەیـە كـە مرۆڤیكـی ئاینپەروەر بروای خۆی لە دەستدەدات.

چارەسەریكی تر پەیرەویكەرانی ریژەییـە (ریلـەتیڤیزم). ریژەییـە ئەوپـەرە گرەكـان بە روونی هەموو بارودۆخەكانی ژیان دەبینن. ئەو بروا بە راستییەكی رەها ناكات. بۆ ئـەو راسـتییەكی گـەورە بوونـی نیـە، بەلكـە راسـتی بچـوك بچـوك هەیـە. ئـەو لـەلای پییـەكانی پیغەمبـەرەوە دانانیشێ، بەلكـە بـۆ خـۆی هـەندیك لـە ماركسـیزم، هـەندیك

من خۆم بە هاورای یەکیك لە فەیلەسوفە گەورەکان دەزانم، کارل پۆپەری نەمساوی، کە نووسیویەتی "نە بەلگە لۆژیکییەکان و نە ئەزموونەکان، ناتوانن راستی باری عەقلانیەت بخەنە روو"

لیبرالیزمی بازار، شتیك لە شیکاری دەروونی، تۆزیك لە ئاکارناسی، هەندیك لە بونیادگەری –(ستروکتورالیزم) یان دوای بونیادگەری– (پۆست سترکتورالیزم)، یان یەکیکی تر لە ئاراستە نوییەکان بۆ خۆی هەلدەبژیریۆو کۆدەکاتەوە. ئەوانە بۆ خۆی تیکەلدەکات و تیزیك لەو ئاویتەیە بۆ خۆی پیك دەهینیۆ. بەلاّم خۆی باوەری وا نیە کە یەکیك لەو تیۆریانە لەوی تریان راسترە. ئەو دەلیۆ: "شتیك نیە بەناوی راستیەوە، ئەگەر هەشبیۆ ئیمە ناتوانین پیی بگەین، مرۆ دەتوانیۆ وا واقیع ببینیۆ کە هەیەو دەشبیۆ وای ببینیۆ. ئەوە رۆل نابینی کە کامیانە". ئەو دەلیۆ: بەبیۆ سەعیکردن و پەشیمانی، بەلکە بە هیمنی و تیرکراوی.

ئەم حالەتە پیی دەوتریۆ عەقلانیەتی مرۆڤانە، کە من دەبیۆ بلیم ئەمە بە شیوەیەك لە شیوەکان عەقلانیە، ئیمە تازە بەوە گەیشتین کە هەموو راستیەك کاتیەو هیدی هیدی بە راستی تر جیگەکەیان دەگیریتەوە، وەك وترا لەناو هەریەك لەم زانستانەش دژەبۆچوون و تیۆری هەیە کە هەریەکەو بۆ خۆی نوینەرو ناسینەری هەیە، ئەمە سەبارەت بە کۆمەلناسەکان، مرۆڤناسەکان و هەروەها سروشتناسەکان، چۆن بتوانم لەناو ئەمانە هەلببژیرم؟ ئەمە لە هەموو قوتابخانە دژبەیەکە دەروونناسیەکان بپرسە، ئەوانەی کە خۆپەرستی مرۆڤ بە شیوەی جۆراوجۆر لیکدەدەنەوە، یان چۆن بتوانم هەلویست وەرگرم کاتیۆ لیکۆلەریك دەلیت زەوی لە هەرەشەی گۆرانکاریەکی تەواوی کەش و هەوادایە بە هۆی ویرانبوونی ژینگەوە، لە کاتیکدا یەکیکی تر دیت و بە هەمان دەربرینی پوختەوە نکولی لەوە دەکات کە خەتەری لەو جۆرە هەبیۆ.

هیشتاش ناتوانم زانستی ریژەیی قبول بکەم، من پیم وایە ئەگەر مرۆڤ بیت و نەگاتە راستیە رەهاکان، لای کەم دەبیۆ بگاتە ئەو بناغانەی کە کەم و زۆر باوەرپیکراون. گومانی تیدا نیە کە بە راستی هەنگاوی بەرەو پیشەوە هەیە، راستە ئەو زانیارییانەی ئەمرۆ هەمانە گەورەترن لەوانەی پیش پەنجا سالّ یان سەد سالّ پیشتر هەمانبوون. من باوەرم بەوانە هەیە، بەلاّم بە داخەوە ئەم باوەرە تەواو وەك باوەری مرۆڤە دۆگماییەکانە کە هەر ئیستا رەخنەم لیگرتن: باوەرم وایە ئیمە دەتوانین زانیاری راستەقینە بەدەست بهینین، چونکە من دەمەویۆ باوەر بەوە بکەم.

من خۆم بە هاورای یەکیك لە فەیلەسوفە گەورەکان دەزانم، کارل پۆپەری نەمساوی، کە نووسیویەتی "نە بەلگە لۆژیکییەکان و نە ئەزموونەکان، ناتوانن راستی باری عەقلانیەت بخەنە روو". نەخیر، پۆپەر دەلیۆ، ئەمە مەسەلەی {بروایەکی

پیشبینینەکراوە بە عەقل)، لەگەڵ ئەمەدا ئیمە لە بەردەم هەلبژاردنیکی ئازاددا دەوەستین، دەتوانین شیوازیك لە پیشبینی نەکراوەکان هەلبژیرین، بەلام ئازادی ئەوەشمان هەیە ئاراستەیەکی رەخنەگرانەی عەقلانیەت -راشونالیزم هەلبژیرین.. ئەمە بریاردانیکی ئەخلاقیە". (*کارل پۆپەر- کۆمەلگەی کراوەو دوژمنەکانی- بەشی دووەم*).

هەر ئەمە، کە مەسەلەی راستی، لە بناغەو ناخەوە مەسەلەیەکی ئەخلاقیە، کە زەوی ئەمرۆ لە بەردەم هەرەشەی شەر، ویرانبوونی ژینگەو برسیتیدا دەبینریت، گەورەترین کیشەی واقیعیە کە ناتوانریّ پشتگویّ بخریت، ئەمە بە بۆچوونی من بە ئاسانی هەستی پیدەکریت، بۆ ئەوەی نەوتریّ نائەخلاقیە، کە خەمی ئەوەی نەبیّ چۆن لەگەڵ شتومەکەکاندا دەمینیتەوە، ریلەتیڤیزم بە باوەری من بۆچوونیکی رازاوەیە کە مرۆ لە کاتی هەستکردنی بە دلنیایی یان باوەری بە هەبوونی دلنیایی دەریدەبریّ، بۆ ئەوەی مرۆڤ سەرکەوتوو بیّ لە مامەلەکردنیدا لەگەڵ ئەو پرسە بەرزو کۆنکریتانەی کە مرۆڤایەتی رووبەروویان دەبیتەوە، دەبیّ مرۆڤ هەولبدات وینەیەکی واقیعی لە واقیع پیشان بدات و بیکات بە بنچینە بۆ بابەتەکانی، دەنا خەتەری ئەوە هەیە تووشی کارەساتی مەترسیدار بین، ئەمە من وەکو کیشەیەکی گەورە دەیبینم: کە بارودۆخەکانی واقیع ببینریت و لەگەڵ ئەوەشدا خۆی خەریك بکات و نەگاتە مرۆڤپەروەری. ئەمە بۆ ئەوەیە کە ریگەی سییەم لە نیوان دۆگماتیزم و ریلەتیڤیزم بدۆزریتەوە.

### ٣-پۆزەتیڤیزم:

گەران بە دوای زانیاری رەهادا:

هەر ئیستا وتم کە یەکیك لە هیلەکانی جیاوازی تیۆریەکانی زانست لە نیوان دۆگماتیزم و ریلەتیڤیزمدا رەتدەبیت، لە نیوان ئەوانەی کە بروایان وایە دەگەنە راستی رەهاو ئەوانەی کە پییان وایە هەموو بۆچوونەکان وەك یەك باشن یان خراپن. بیگومان ئەمە ئاسانکردنەوەیەکی زۆرە. لە راستیدا زۆر شیوەی تاوتویکردنی کیشە هەیە. زۆربەی ئەوانەی کە خراونەتە بەردەست، خۆیان لە نیوان خالە توندرەوتەکانی هەموو بەشەکە دەبیننەوە.

مرۆڤ، فیرە کە باس لە دوو ئاراستەی سەرەکی زانست بکات، پۆزەتیڤیزم و هیرمەنیۆتیك، رەسەنی پۆزەتیڤیزم لەناو زانستی سروشتدایە، بەلام میتۆدو

تیروانینەکانی لەناو زانستەکانی تریشدا بڵاو بۆتەوە، بەڵام هیرمەنیۆتیك ئاراستەی مرۆڤایەتی بۆ خۆی داناوە، پۆزەتیڤیستەکان دەیانەوێ باوەر بە زانیاری رەها بکەن، لە کاتیکدا هیرمەنیۆتیکەکان زیاتر باوەریان بە بیرۆکەی ریژەیی هەیە، بەڵام بەتیبینی ئەوەی کە پۆزەتیڤیستەکان ئەوانە نین کە بە دۆگمایی (وشکەباوەر) ناومبردن، هیرمەنیۆتیکەکانیش وەکو ئەوانە نین کە پەیرەوکەرانی زانیاری ریژەیین، لیکۆلەرە نویگەرەکان بە گشتی، ئەوانەی کە لەسەر بناغەی پۆزەتیڤیزم بابەتەکانیان بنیات دەنین، تەواو کیشەکە دەناسن، بەوەی گەیشتوون بە زانیاری دلنیا، لەم بەشەو لە سێ بەشی داهاتوودا باس و گفتوگۆ لەسەر پۆزەتیڤیزم و میتۆدەکانی دەکەم، هەروەها ئەو رەخنانەی ئاراستەی دەبیتەوەو چەند پرسیارو کیشەیەکی کە بە زانستی پۆزەتیڤی دەخریتەروو. دوای ئەوەش دیمە سەر هیرمەنیۆتیك.

پۆزەتیڤیزم، یان نەریتی پۆزەتیڤی، لە بیرکردنەوەی رۆژئاوادا لەمیژە هەیە. خودی وشەکە، وەك دەزانرێ، یەکەم جار لە سالی ١٨٠٠ لە لایەن کۆمەلناسی فەرەنسەوی (ئاوگوست کۆمت ١٧٩٨–١٨٥٧)ەوە بەکاربرا. ئامانجی ئەوەیە کە مرۆ لەسەر بناغەی پۆزەتیڤ راکانی بنیات بنیت، واتە لەسەر زانیاری دلنیا، بەڵام شیوازی پۆزەتیڤی لە بیرکردنەوەدا دەگەریتەوە بۆ سەردەمی باوەری عەقڵانی سەدەی حەڤدەیەم ١٧٠٠ و لە سەردەمی پیشکەوتنی زانستی سروشت لە سەدەی شانزەیەم ١٦٠٠دا، بەلێ، وەکو نەریتە گرنگەکانی تری رۆژئاوا، پۆزەتیڤیزم رەگی لە یۆنانی کۆندایە، کاتێ من باسی پۆزەتیڤیزم دەکەم مەبەستم لە مانا فراوانەکەیەتی، مەبەستم لە نەریتیکی سەرەکی بیری رۆژئاواییە، نەك تەنها ئاراستە فەلسەفیەکانی کە لە دنیای مۆدیرندا پیی دەوترێ پۆزەتیڤی.

چارەسەری پۆزەتیڤیزم بۆ مەسەلەی راستی بە کورتی ئەمەیە: ئەگەر مرۆ هەموو ئەو شتانەی کە پیی وایە دەیزانێ و لە راستیدا نایزانێ لە لای خۆی بکوژینیتەوە، ئەوسا ناوکیك لە زانیاری دلنیای لا دەمینیتەوە، "زانیاری وشك". لەسەر ئەو بناغە دلنیاییە زانستەکەی دادەریژێ. هەموو "زانیارییەك" کە لە کتیبە پیرۆزەکانەوە دەهینرین، لە پەیامە ئاینییەکاندا، بە تیگەیشتنی راستەوخۆ یان بیرکردنەوەی ئازادو فەنتازیا، لای پۆزەتیڤیستەکان بێ نرخن. فەیلەسوفی سکۆتلەندی سەدەی حەڤدەیەم، داڤید هیوم بەم شیوەیە رون و ئاشکرا گوزارەی لە چەمکی پۆزەتیڤیزم کردوە:

چارەسەری پۆزەتیڤیزم بۆ مەسەلەی راستی بە کورتی ئەمەیە: ئەگەر مرۆ هەموو ئەو شتانەی کە پێی وایە دەیزانێ و لە راستیدا نایزانێ لە لای خۆی بکوژێنێتەوە، ئەوسا ناوکێك لە زانیاری دڵنیای لا دەمێنێتەوە

*کاتێ ئیمە هەر کتیبیك دەگرینە دەستمان.. با بپرسین. ئایا ئەم کتیبە شیکردنەوەی روونە لەسەر چەندو جۆر؟ نەخیر. ئایا راڤەیەکی ئەزمونگەرانەیە لەسەر پەیوەندیە راستیەکان و بوون؟ نەخیر. کەواتە فریی بدەرە نیو پشکۆکانەوە، چونکە شتیکی تری تیدا نیە جگە لە سۆفیگەری، یان ویناکردن.*

هیوم مەبەستی لە شتیکی ناوەندییانە بوو، بە پیی پۆزەتیڤیستەکان ئیمە تەنهاو تەنها دوو سەرچاوەمان هەیە بۆ زانیاری، ئەوەی بە هەستەکانمان تاقیدەکەینەوەو ئەوەی کە دەتوانین بە لۆژیکی خۆمان بیژمیرین، نابێ باوەر بە نەرتیەکان و پسپۆرەکان بکەین، نابێ خاوەنی بیرکردنەوەی رەهای زانستیانە بین، نەهیلین هەستەکان کارمان تیبکەن. لە جیاتی ئەوە رەخنەگرانە لە هەموو وتەو ئەزموونیك بکۆلینەوە و تەنها پشت بەو فاکتانە (راستیانە) ببەستین کە دەتوانین دلنیا بین کە گونجاوو باوەرپیکراون. ئەو فاکتانەی کە دەبێ لە دواییدا بە شیوەیەکی لۆژیکییانە شیبکەینەوە تا بتوانین لە ئەنجامی ئەوەوە دەرەنجامی لیکۆلینەوەکان بدەین بە دەستەوە. هەروەها لەبەرئەوەی کە ماتماتیکیش لە ریزی لۆژیکەکان دەژمیرری، دەبێ هیندەی دەتوانین چەندیتی فاکتەکان لەبەرچاو بگرین، ئەژماری لەسەر بکەین، تا بتوانین دەرەنجامی گشتی لی هەلبهینجین.

نەریتی پۆزەتیڤی خزمایەتی نزیکی لەگەڵ زانستی سروشتدا هەیە، لە سەدەی هەژدەدا ١٨٠٠، مرۆڤ فیزیکی وەکو ئەو نمونەیە دەبینی کە هەموو زانستەکانی تر پیویست بوو هەنگاوی لەگەڵ بنین. دوایی میتۆدەکانی پۆزەتیڤیزم پەلی هاویشتە نیو زانستە کۆمەلایەتیەکانەوە، بەلام پرنسیپە بنچینەیەکانی کە من بە پرنسیپی پۆزەتیڤیانە ناوم بردن، کۆنترۆلی فاکتەو لۆژیکەکان دەکات و لەنیو بابەتەکانی زانستە مرۆییەکانیشدا دەردەکەوێ. لە کۆتایی سەدەی هەژدەدا ١٨٠٠، لە زانستی میژوودا لە بەرامبەر پۆزەتیڤیزمی زانستی سروشت و زانستی کۆمەلایەتی، رەخنەی سەرچاوەی میژوویی هاتەئاراوە، لەو بابەتەدا مرۆ ئەژمار بەکارناهینێ، بەلام رەخنەگرانە هەموو وتەکان هەلدەسەنگینێ و هەموو ئەوانەی کە هەلناگیرێ فریی دەدات، لە سەدەی هەژدەدا بۆ نموونە کتیبەکانی میژوو پربوو لە داستانی سەیرو سەمەرەی پاشاو پیاوە گەورەکان -تورگنی لاگمان، پاشا ناچاری راوەستان لە دادگا دەکات، سەرەرۆییەکانی گۆستاف ڤاسا لە گەشتەکەی بۆ دالەرنە، ئیریکی چواردەیەم بە شلەی فاسۆلیا دەرمانخوارد دەکرێ، و هتد. میژوونووسە رەخنەگرەکان ئەو داستان و بەسەرهاتانەیان توور هەلدایە دەرەوەو وەکو پروپاگەندە بۆ پاشاکان، کە

هیچ هۆکاریك بۆ باوەڕپێکردنیان نیە ، بەم شێوەیە مێژوو وشکتر بەڵام باوەڕ پێکراوتر بۆوە.

## تاقیکردنەوەو لۆژیك

کەواتە پۆزەتیڤیزم دوو جۆر سەرچاوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، لەبەرچاو دەگرێ، تاقیکردنەوەو لۆژیك. تاقیکردنەوەکان ئەو زانیاریە ئەزموونگەرییانەن کە ئیمە لە ریگەی پێنج هەستەکەمانەوە وەریان دەگرین. بە یارمەتی ئەوان وەك فاکتە پۆلینیان دەکەین. ئەمە واناگەیەنێ کە هەموو شتێ کە دەیبینێ یان دەیبیستێ دەیکاتە فاکتە، پۆزەتیڤیستێك هەلویستێکی رەخنەگرانەی هەیە بۆ جیهانی دەوروبەری خۆی. بەڵام ئەو هەندێ لەو ئەزموونانە وەکو ناماقول پیشاندەدات. ئەگەر پۆزەتیڤیستیکی راستی کەشتیەکی فەزایی ببینێ کە پیرەمێردی بچووك بچووکی سەوزی تێدایە، وەکو دردۆنگیەك (وهم) لیکی ناداتەوە، ئەو دیاردەکە دەپشکنێت، بە هەموو بارودۆخەکانی دەوروبەری ئەزمونەکەدا دەچیتەوەو ئینجا سەبارەت بەوەی کە ئەوە سەردانییەك بوە لە دەرەوەی ئاسمانەوە یان نا، بۆچوونی خۆی دەردەبرێ.

یەکیك لە پالەوانانی پۆزەتیڤیزم گالیلۆ گالیلی بوو، کە بە پێی بەسەرهاتەکەی کە تازە دەردەکەوێ تەلەسکۆپی (دووربین) بۆ پیاوانی کلیسا دۆزیبووەوە، ئەو دووربینەکەی ئاراستەی رووبەری گرنج گرنجی مانگ کردبوو، تاقیکردنەوەی لەسەر ئەنجام دەدا. بەڵام پیاوانی کە پیشتر ئەرستۆتالیسیان خویندبۆوە، دەیانزانی کە رووبەری مانگ تەختە، بۆیە نەیاندەویست تەماشای دووربینەکەی بکەن، لای ئەوان هەلزنین بەرەو مانگ بە قەد ئەوە ناماقول بوو کە لەویوە میوان سەردانی ئیمە بکات، پۆزەتیڤیستیك وا ناکات، تەماشای دووربینەکە دەکات، بەڵام ئەو گریمانەش دادەنیت کە رەنگە روانگەکەی هەلە بیت.

راستیە لۆژیکیەکان بە تەواوی کارەکتەریکی جیاوازتریان هەیە لەوانەی ئەزموونگەرەکان. ئەوان شتیکیان سەبارەت بە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی واقیع نیە، بەلکە تەنها لە ریگەی رۆشنبیریو چۆنیتی بەکارهێنانی زمانەوە دەریان دەبرن، ئەمە راستیەکی ئەزموونگەرانەیە کە مرۆڤێ خۆی لە شوینیکی دیاریکراودا دەبینیتەوە، بەڵام ئەوە راستییەکی لۆژیکییە کە ئەو مرۆڤە ناتوانێ هاوکات خۆی لە دوو شویندا ببینیتەوە. کە باج بەرز دەکریتەوە راستییەکی ئەزمونگەریە، بەڵام کە شالیاری دارایی

پۆزەتیڤیزم دوو جۆر سەرچاوە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، لەبەرچاو دەگرێ، تاقیکردنەوەو لۆژیك.

لە لایەن راپۆرتدەریکەوە فشاری دەخریتەسەرو وایلیدەکات کە بە یەکجار بری باج بەرزبکاتەوە ئەوە ناراستییەکی لۆژیکیە، ئەگەر ئەو وشەکانی {باج} و {بەرزکردن} بە دریژایی کات بە یەك مانا بەکاربهینێ، شالیاری دارایی دەکەویتە حالەتی دژەوتنەوە لەگەڵ خۆی. ئەمە دەتوانرێ بسەلمنیرێ کاتێ قسەکانی شالیاری دارایی تاوتوێ بکرێ بیئەوەی بزانرێ لە بارەی باجەوە چیکراوە.

نموونەی دیار بۆ راستیە لۆژیکییەکان لە جەبردا هەیە، کە هاوکیشە جەبرییەکان لەسەر کۆمەلێ بەلگەنەویست داریژراون. لەوانەوە مرۆڤ بە شیوەیەکی تەواو لۆژیکی دەتوانێ ریگە بگریتەبەر، هەموو دەستەواژە جەبریەکان لۆژیکی بکاتەوە، مرۆڤ پیویستی بەوە نیە واقیع بخوینیتەوە تا بگاتە دەستەواژەیەك یان بەلگەنەویستیك، هیچ خەتەریکی تیدا نیە ئەگەر مرۆڤ لە شوینیك لە شوینەکانی گەردوون سیگۆشەیەکی گۆشەوەستاو بدۆزیتەوە، کە کۆی دووجای گۆشەکانی بە گۆشەپیو نەکاتە کۆی ژیی سیگۆشەکە، مرۆڤ دەتوانێ بە هەموو شوینیکی گەردووندا بگەریت بیئەوەی بتوانێ یەك دانە سیگۆشەی چوارلا، رەبەنیکی هاوسەردار، یان کۆسەیەکی ریشن بدۆزیتەوە، یاخود لە هیچ جیگایەکی گەردوون کۆی دوو لەگەڵ دوودا شتیکی تر بیجگە لە چوار ناکات.

جیاوازی نیوان راستیە ئەزمونگەرییەکان و راستیە لۆژیکییەکان ئەوەیە کە مرۆڤ قەت ناتوانێ دلنیابێ لە راستییەکی ئەزموونگەری کە راست بیت. رەنگە پینج هەستەکان مرۆڤ بخاپینن، مرۆڤ دەتوانرێ هەلخەلەتینرێ، مرۆڤ دەکرێ دردۆنگی هەبێ، زۆر شیوەی تری لە دەستچوونی راستی هەیە، بەڵام ریساکانی لۆژیك هەمیشە باوەرپیکراون، یان مرۆڤ دەتوانێ باوەریان پیبکات؟

پرسیاریکی کلاسیکی کە لە سەدەکانی ناوەراستدا بەناوبانگ بوو ئەمە بوو: ئایا خودا دەتوانێ پەرچەمی کەچەلیك هەلکیشێ؟ ئەگەر خودا دەسەڵاتداری مەزنە دەبێ بتوانێ هەموو شتێ بکات، بەڵام پەرچەمی کەچەلیك هەلکیشێ ئەمە کاریکە کە نایتوانێ. ئەگەر مەبەست لە "هەلکیشان" راکیشانی قژ بیت و، لە "کەچەل" ئەو کەسە بیت کە مووی بەسەرەوە نیە، کەواتە ئەوە لۆژیکیە کە ناتوانرێ قژی کەچەلیك رابکیشریت، خودا دەتوانێ بە بێ هیچ سەختیەیك وابکات ئەو کەچەلە قژی بروێو دوای ئەوە قژی رابکیشێ، بەڵام ئەوسا ئەو کەسە کەچەل نیە.

ئەویش نەگونجاوە کە بە دەستێ چەپلە لیبدرێ، ئەگەر مرۆڤ لە "چەپلە" مەبەستی "دوو ناولەپ بە یەکدا دان" بیت، کەواتە هیچ کەسێ هەرچەندەش زیرەك بێ

نایتوانێ، لەناو {زەن}ی بوودابییەکاندا راهینانی وا هەیە کە وادەردەخات کە بە دەستێ چەپلە لیدەدات، بەلام ئەمە ریك مەبەستی دوورکەوتنەوەیە لە بیرکردنەوەی لۆژیکی و گەیشتنە بە ریگاکانی شیکردنەوە، زەنی بوودابییەکان بە تەواوی دژی فیربوونی پۆزەتیڤیزمە.

فەیلەسوفەکان هەموو شتێ دەخەنە ژیر پرسیارەوە، بەلام ئیمە لەبەر ئاسانکاری دەبێ بریاربدەین کە راستیە لۆژیکیەکان، کە ماتماتیکیشیان لەگەلدایە، هەر دەبێ راستی بن ئەگەر مرۆڤ وشەکە بە راستی بەکارببات و دوای ریساکانی لۆژیك بکەوێ، لەم بابەتەدا ریژەیی بوون رەواجیکی نیە، لە بەردەوامی باسەکەمدا باسی "راستیە لۆژیکیەکان" ناکەم، بەلکە باس لە ئەنجامە لۆژیکیەکان، یان دەرەنجامەکانی دەکەم، وشەی "راستی" لە باتی راستی لە ژیانی رۆژانەدا: هاورا لەگەل واقیعدا، بەکاردەبەم، ئەم جۆرە راستیانەش بە پلەیەکی بەرز کیشەیان لەگەلدایە.

### ٤–شیوەی جیاواز بۆ دەرهاویشتنی دەرەنجام:

دوو شیوەی جیاوازی، بۆ دەرهاویشتنی دەرەنجام هەن، دەرەنجامی ئەزموونگەری (ئیندەکشن– *Ibduktion* و، دەرەنجامی لۆژیکی (دیدەکشن– *Deduktion*). ئیندەکشن لەسەر بناغەی ئەزموونگەرییو دیدەکشن لەسەر بناغەی لۆژیك دادەنرێ، کاتێ لەگەل میتۆدی گریمانەیی یەکدەخرین ئەوسا دەکەنە میتۆدی پۆزەتیڤیزم، من ئیستا پیشانی دەدەم چۆن مرۆڤ بە ریی ئەو میتۆدانەدا دەکاتە دەرەنجامی جۆراوجۆر، بە تیبینی ئەوەی کە گفتوگۆ و تاوتویکردنی بابەتەکان پیی دەوترێ ریئەنجام و ئەوەش کە لە کۆتایی لیکۆلینەوەکەدا پیی دەگەین پیی دەوترێ دەرەنجام. ئەو دەستەواژانەش کە ریخۆشکەرن بۆ دەرئەنجام پییان دەوترێ مەرجەکان.

### ئیندەکشن *Induktion*

### دەرەنجامی ئەزموونگەری

ئیندەکشن ئەوەیە کە مرۆڤ دەرەنجامی گشتی لە راستیە ئەزموونگەریەکانەوە هەلینجابێ، چەندیتی مەرجی ئەم جۆرە دەرەنجامەیە، ئیندەکشن بەمجۆرە بەدەستدیت:

*مەرج: هەموو ئەو مرۆڤانەی کە لە میژووی هەموو جیهاندا ناسیمانن، مردن.*

*دەرنجام: کەواتە مرۆڤ هەمووی، بە منیشەوە، دەمرن.*

یان:

*مەرج: هەموو کیشە قوولە دەروونیەکان کە دەروونناس و شیکارە دەروونیەکان لە نەخۆشەکانیانەوە دیویانە نیشانی دەدات کە پەیوەندیان بە ئەزموونەکانی سەردەمی منداڵییانەوە هەبوە.*

*دەرەنجام: کەواتە هەموو کیشەیەکی دەروونی پەیوەندی بە ئەزموونەکانی سەردەمی منداڵییەوە هەیە.*

یان:

*مەرج: لە راپرسیەکماندا کە ئەنجاممان دا زۆربەیەکی روونی ئەو کەسانەی کە پرسیاریان لیکرا وتیان کە لە هەڵبژاردنی مانگی داهاتوودا دەنگ بۆ پارتی{س} دەدەن.*

*دەرەنجام: کەواتە پارتی {س} هەڵبژاردنەکە دەباتەوە.*

ئەوە گرنگە بوترێ کە هەرگیز سەدلەسەد ناتوانین لە ریئەنجامیکی ئەزموونگەرانە دلنیابین بۆ بەدەستهینانی دەرەنجامیك. چونکە پشت بە کەرەستەی ئەزموونگەری دەبەستیت کە ئەو کەرەستەیە بە دەگمەن دەتوانرێ بە تەواوی تەواو بژمیرریت. ئەنجامدەرە ئەزمونگەریەکان لەسەر بناغەی کەرەستەیەکی زۆر ئەنجام دەدرین کە رەنگە هەندیکیان دەرکەون کە ساختەن. ئەمە وا دەردەکەوێ کە لەگەڵ عەقلدا ناتەبا بیت، بۆیە باشترە کە من بەڵگەداری بکەم. سەرەتا دوو نموونەی میژوویی:

فینیقیەکان، زۆرترین دانیشتوانی، لە میژووی کۆندا دەریانشین و کەشتیدار بوون، دەگیرنەوە کە کەشتیەکی فینیقی زۆر لەمیژتر لەوەی میژوو دەستپیکردبێ بەرەو ئەفریقیا چوە. لەودەمەدا مرۆ زۆر بەسەرهات و داستانی بۆ قووت دەچوو، بەڵام کە داستانبیژ بیوتبایە لە بەشیکی گەشتەکەیدا خۆر لە باکوورەوە هەڵهاتوە. ئیدی هەموان دەیانزانی کە ئەمە دەبێ درۆ بیت، بەسەرهاتیکی تری کەشتیەوانی دەربارەی کەشتیەوانیکی گریکیە کە بەرەو باکوور گەشتیکی کردو گەیشتە سەهۆڵبەندانی {توولە}، کە هەرگیز لە هاویناندا خۆرئاوا نەدەبوو. هەرگیز لە زستانیشدا هەڵنەدەهات، بەڵام بەسەرهاتە ترسناکەکانی ئەویش باوەری لای خەلك دروست نەکرد. لە بارەی هەندێ راستیەوە کە لە میژووی کۆندا بە سەدلەسەد دەبینرا ئەوەبوو کە خۆر لە باشوور وەستاوە، بەیانیان هەڵدێ و ئیوارانیش ئاوادەبێ، بەڵام ئەوە راستی

هەرگیز سەدلەسەد ناتوانین لە ریئەنجامیکی ئەزموونگەرانە دلنیابین بۆ بەدەستهینانی دەرەنجامیك.

ئەزموونگەری بوو کە لەسەر بناغەی ئیندەکشن بنیات نرابوو، کە ئەمرۆ ئیمە وای دەبینین کە بە هیچ شیوەیەك راست نەبوون.

راستیەکی تری جۆری ئیندەکشن، کە لە میژە لە ئارادایەو لە هەموو کات و شوینکدایە، ئەوەیە کە مرۆ ئەگەر شتیك بەربداتەوە دەکەویتە خوارەوە، بەلام ئەمرۆ ئەوە دەزانین کە ئەو راستیە برەوی نامینێ ئەگەر لە شوینیك بێن قورسایی لە دەستبچێ، وەکو لەناو کەشتیە ئاسمانیەکاندا.

نمونەی داهاتوو لە فەیلەسوفی ئینگلستانی *(بەرتراند راسل)*ەوەیە کە من بە سویدیم کردوە (سویداندوومە)، راسل باسی قەلیك دەکات، کە من کردوومە بە بەراز، هۆیەکەشی لە دریژەی باسەکەدا دیتە پیشەوە.

بەرازەکە کە لایەنگریکی باوەرداری میتۆدی ئیندەکشنە، تاقیدەکاتەوە کە ئەو هەموو بایەنیەك کاتژمیر نۆ خواردنی دەدریتێ. بەلام وەك ئیندەکتیڤیستیکی باش دەرەنجامی خیرا بەدەست ناهینێ. ئەو چاوەرێ دەکات ژمارەیەکی زۆر تیبینی کۆبکاتەوە بۆ ئەوەی بیسەلمینێ کە هەموو رۆژانیك بە یەکشەمەشەوە، رۆژانی گەرم یان سارد. رۆژانی خۆر یان باران، بەهارو هاوین و زستان و پاییز، کاتژمیر نۆ خواردنی دەدریتێ. تا دەگاتە ئەوەی ئەو دەرەنجامە بدات بە دەستەوە: *"من هەمیشە کاتژمیر نۆی بەیانی خواردنم دەدریتێ"*. بەلام دوو رۆژیش ئیوارەی هەستانەوەی مەسیح خواردنی نادریتێ. لە جیاتی ئەوە دەبرێ بۆ قەسابخانە.

ئەم بەسەرهاتە بچووکەی بەرتراند راسل نابێ وەکو گالتەیەك وەربگیرێ. ئیمە هەموومان وەك ئەو بەرازە ئەزموونگەرە دەنوینین، پیش پاییزی ١٩٨٩ شتیك وەك ئەو ئەنجامە ئەزموونگەریە دەبینرا. کە نەخشەی سیاسی ئەوروپا داریژرا. تەنها شەریك دەیتوانی ئەو نەحشەیە بگۆرێ، ئەوروپا دابەشکرا بوو بەسەر رۆژهەلات و رۆژئاوادا. ئەوروپای رۆژهەلات لە لایەن حکومەتی کۆمۆنیستی لە مۆدیلی سۆڤیەت بەریوەدەبرا. ئەو سیستەمە چەندان دەیە بەو شیوە بەریوەدەچوو، لەناو گرژبوونەوەو خاوبوونەوەی سیاسیدا، لە بارودۆخی قەیرانی ئابووریو دەستئاوەلایی ئابووریدا، لە کاتی پەیوەندیە نەرم و نیانەکان و قەیرانە سیاسیەکاندا، هەموو سالیك تەواو دلنیاتر ئەوەی پیشاندەدا کە رژیمەکانی ئەوروپای رۆژهەلات سەقامگیرن و دەبێ هەروا بمیننەوە. بەلام سالی ١٩٨٩ رژیمەکان لە زنجیرەیەك لە ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات لە چەند هەفتەیەکدا رووخان، کاتێ ئەمە دەنوسرێ کەس نازانێ

ئـەنجامی شۆرشـەکان چـی دەبـێ، تەنـها شـتێك دلنیایـە: *ئـەوەی کـە دەردەکـەوت سەقامگیرە، وا نەبوو.*

یـان بـا هەلومـەرجی گەشەسـەندن و ژینگـە ببینـین. چـەندان دەیەیـە کـە ئیمـەی سـویدی خوومـان بـەوەوە گرتـوە کـە تـا دێ کەرەسـتەی باشـتر بـۆ هـەموو شـتێك بەکاربهێنین. نەشونمای تەواو وەکو یاساییەکی سروشتی دەبینرا، بەلام زەنگەکانی ئاگاداری بەو شیوەیە لییان دەدا، لیکۆلەرو پشکنەری جیاواز دەهاتنە پیشەوەو باسی کەمبوونـەوەی وزەو ویرانبوونـی ژینگـەیان دەکـرد، زۆربـەی جـار بـە بەلگـەوە دەریـاندەبری. "هـەتا ئیسـتا هـەموو زەنگەکان سـاختە دەرچوون. هـەر لـەو کاتـەی کـە شـەمەندەفەرە ئەلکترۆنیـەکان داهـاتن، ئەوان نیگـەران بوون، بـەلام هـەمووی بە باشـی چوە پیشێو ئیستا لە هەمو کاتیکی تر باشترین، ئەی بۆ لە داهاتووشدا باشتر نابێ؟" بەلام ئەمە "هەلویستی هەتا ئیستا– باش– رۆیشتووە" دەکرێ بە هـەمان پلـە هەلـە بێ وەك مەسەلەی بەرازەکە، ئەوەی بمینـێ دەیبینـێ، لـە ئیندەکشـندا مـرۆڤ دەتوانـێ بگاتـە شیوەی راسـتی گـەورە یـان بچووك، بـەلام قـەت ناتوانـێ بگاتـە زانینـی سـەد لـە سەدیی.

### جیی باوەری و برەوداری

لـە لیکۆلینـەوە ئەزموونگەریـە چەندیتییـەکاندا، پیویسـتە مـرۆڤ دوو شـتی گرنـگ لەبەرچاو بگرێ: جییباوەریو برەوداریی.

جییبـاوەریبوون، مانـای ئەوەیـە پیوانـەکان بـە ریـك و راسـتی ئـەنجام دراون، راپرسیەك پیویستە لەسەر سێ هەلبژاردەی نوینەری جیاواز ئەنجام بدرێ، بۆ ئەوەی ریکەوت کاریگەری لەسەر نەبیت، دانانی کۆد بۆ –با بلیین– بۆچوونی رۆژنامەیەك لە بارەی پرسیکی سیاسیەوە دەبێ لە چەند سالیکدا بە شیوەیەك بێ کە مرۆ بتوانێ هۆکارەکـانی ریکـەوت دوور بخاتـەوە، ئەگـەر چـەندان لیکۆلـەری جیـاواز هەمان دەرەنجامیان بەدەستهینا، ئەوە ئەو دەرەنجامە جیی باوەرییەکەی لە پلەیەکی بەرزدا دەبێ.

ئەمە پرنسیپیکی گرنگە لە لیکۆلینەوەی پۆزەتیڤیستانە، کە هەمان میتۆد بتوانرێ لە لایەن چەندان کەسەوە پیادەبکرێ، بە هەمان ماتریال، ئەگەر ئەو کەسانە هەموویان گەشتنە هەمان ئەنجام، ئـەوە ئـەو ئەنجامـە ئـەنجامیکی شـایان بـە ئـەزموونی خودییـە،

مرۆ دەتوانێ جیاوازیەکانی نیوان کەسایەتی لیکۆلەرە جیاوازەکان بخاتە لاوە، بەو شیوەیە جیبباوەریی لیکۆلینەوەکە زیاتر دەبیتەوە.

برەوداریی مانای ئەوەیە کە مرۆ بە کردەوە تەنها ئەو بابەتەی کە دەیەوێ و هیچی تر، لیی کۆلیبیتەوەو ئەنجامی دابێ، دەتوانین لە بارەی پیشبینی کەشوهەوا تویژینەوەیەك بکەین، لە ریی ئەوەوەی کە بزانین پەرەسیلکەکان چەند بەرز فریوون. پەرەسیلکەکان دەژمیرین، مەودای بەرزەفرییان لە رووبەری زەویەوە دەپیوین، ناوەندی بەرزیی دەردەهینین و کە پیوەری کەش ناوەندی بەرزەفری پەرەسیلکەکانە، ئەگەر هەموو ئەو پیوانانە بە تەواوی ئەنجامدران، ئەوە برەوداریتی تویژینەوەکە لە پلەیەکی بەرزدایە، لەبەرئەوە پیشبینی دەکەین کە کەشی سبەینێ خۆرەتاوە، بەلام ئایا بە راستی سبەینێ خۆرەتاوە ئەگەر پەرەسیلکەکان بەرز بفرن؟ ئەگەر وابێ ئەوە تویژینەوەکەمان لە پلەیەکی بەرزدا برەوی هەیە. ئەگەر برەودار نەبێ، ئەوە تویژینەوەکەمان نرخیکی نابێ ئەگەرچی پیوانەکانمان بە تەواوی بەکارهینابێ.

کاتێ لە سەدەی هەژدەیەمدا ١٨٠٠، ژیری مرۆڤ لە ریگەی پیوانەکردنی کەللەسەریەوە دەپیورا، پیوانەکان دلنیاو باوەرپیکراو بوون. مرۆڤ بە تەواوی کەللەسەرەکانی دەپیواو دەیتوانی بەراوردیش لە نیوان کەللەسەری مرۆڤی جیاوازدا بکات. بۆ نمونە دەیتوانی پلەی کارایی مرۆڤ بە کەللەسەری دریژ یان کورت دەستنیشان بکات، بە شیوەیەکی تر بوترێ، لیکۆلینەوەکان باوەرپیکراو بوون، بەلام ئیستا ئیمە دەزانین کە شیوەی کەللەسەر هیچ پەیوەندیەکی بە ژیرییەوە نیە، لیکۆلینەوەکان بیمانا بوون و برەویان نەبوو.

نموونەکانی کە دین سەختترن، بەلام تەواو ناواقیعی نین، دەمانەوێ پرۆژەی چارەسەری نەخۆشیە دەروونیەکان بنرخینین، نەخۆشەکان چاوپیکەوتنیکی بنچینەییان لە پیش و لە پاش چارەسەرکردن لەگەڵ دەکرێ، ئاکارەکانیان لە پیش چارەسەر، لە کاتی چارەسەرو لە پاش چارەسەر، بە وردی دەخوینریتەوە و هەموو ئەو فاکتەرانە کە دەکرێ بیریان لی بکریتەوە تیبینی دەکرین. نرخاندنەکە لە پلەیەکی بەرزدا جیی باوەرییە، هەموان یەکران لە سەری، ئەنجامی لیکۆلینەوەکە پیشانی دەدات نەخۆشەکان تەواو هیمنترن. کەمتر شەپۆلی خەمۆکی هیرشیان بۆ دینێ، باشتر ژیانی رۆژانە بەسەر دەبەن، بەلام لە هەمان کاتدا، کەمجوولەتر (پاسیڤ تر) بوونە، کەمتر ئارەزوویان هەیە، زۆرجار خەمۆکی یەخەیان دەگرێ، ئایا پرۆژەی

چارەسەرییەكە سەركەوتنی بەدەستهینا یان نا؟ ئەمە پەیوەندی بەوەوە هەیە چۆن پرسەكە هەلدەسەنگینین. چ ئامانجگەلیكمان هەن، ئەگەر ئامانجمان ئەوەیە ئەندیشەی نەخۆشەكان كەم بكەینەوەو بیان هینینە ناو كۆمەلەوە، ئەوە پرۆژەكە سەركەوتوە. بەلاّم ئەگەر مەبەستمان ئەوە بێ كە نەخۆشەكان ژیانیكی باشتر، كاراتر (ئەكتیڤ تر)، بەنرختر بژین، ئەوە پرۆژەكە سەرنەكەوتوە. كەواتە بە هاورابوون لەسەر باوەرپیكراویی‌و برەوداریی هاوكاتی لیكۆلینەوەكە، كەسانی جیاواز بە شیوەی جیاواز هەلی دەسەنگینن.

### دیدەكشن (دەرەنجامی لۆژیكی)

دیدەكشن دەرەنجامیكی لۆژیكیە، كە ئەگەر ناوەرۆكەكەشی لۆژیكی بیت بە برەودار دەژمیردریت. بەرامبەر بەوە مەرجیش نیە كە راستی بیت و لەگەلّ واقیعدا بگونجێ، وەكو ئەم بەرەنجامە لۆژیكییەی خوارەوە:

*مەرج: مرۆڤ هەمووی دەمرێ.*

*مەرج: من مرۆڤم*

*دەرەنجام: كەواتە من دەمرم*

جیاوازی چی هەیە لە نیوان ئەم دەرەنجامە لۆژیكیەو ئەو دەرئەنجامە ئەزمونگەریەی كە لەسەر مردنی مرۆڤ، ئیستا باسمكرد؟ لە هەردوو حالەتدا مرۆ دەگاتە هەمان دەرەنجامی لە ناكاو، جیاوازیەكە ئەوەیە كە لە حالەتی یەكەمدا سەرەرای هەموو شتێ تواناكارییەكی تیۆری هەیە كە ناوەرۆكەكە بە ئەزموونەكەشەوە دەپوكینیتەوە.

بە پیی ئاینی كرستیان (مەسیحی)، تەنها مرۆڤیك هەیە كە نەمرە، بەرامبەر بەمە جیی رامان نیە كە ئەو مرۆڤە نەمرە من بم یان یەكیكی تر. ئەگەر هەموو مرۆڤێ دەمرێ‌و، ئەگەر من خۆم مرۆڤم، كەواتە دەبێ ئەمە دژە وتنیكی تیدابیت. بەلاّم تیبینی ئەوە بكە كە ئەم دەرەنجامە لۆژیكییە برەوی هەیە:

*مەرج: هەموو مرۆڤێ چوار دەستی هەیە.*

*مەرج: من مرۆڤم.*

*دەرەنجام: كەواتە من چواردەستم هەیە.*

هەلبەتە ئەمە لەگەلّ واقیعدا ناتەبایە، بەلاّم برەوداریی دەرەنجامی لۆژیكی پەیوەندی نیە بەوەی مەرجەكان راستن یان نا.

ئایا جیاوازی نیوان دەرەنجامی لۆژیکی (دیدەکشن) و دەرەنجامی ئەزمونگەری (ئیندەکشن) رۆلیکی پراکتیکی دەبینیٚ؟ بەلی دەیبینیٚ. من بە نموونە دەیخەمەروو:

پزیشك نەخۆشیکی پشکنیو گەیشتە ئەوەی کە نەخۆشەکە بە وردی پشکنراوەو هیچ هەلەیەکی ئۆرگانیکی تیدا شك نابریٚ. لەگەلٚ ئەوەشدا ئازاری زگی هەیە، لەبەرئەوە پرسیکی دەروونیە". لە پشت ئەم بیرۆکەیەدا ریئەنجامیکی لۆژیکیانەی وا دەبینریٚ:

*مەرج: هەموو مرۆڤیٚ کە ئازاری هەیە بەبیٚ ئەوەی هەلەیەکی ئۆرگانیکی تیدابیٚ، نەخۆشیەکی دەروونی هەیە.*

*مەرج: ئەم نەخۆشە ئازاری هەیە بیئەوەی هەلەیەکی ئۆرگانیکی هەبیٚ.*

*دەرەنجام: کەواتە نەخۆشەکە نەخۆشییەکی دەروونی هەیە.*

ریئەنجامەکە بە تەواوی لۆژیکیەو هەموو بۆچوونیکی جیاواز لەمە بیدەنگ دەکات، بەلاٚم دەشیٚ وا رووبدات کە مەرجەکان لەگەلٚ واقیعدا ریکنەکەون. بۆ نمونە نەخۆشەکە دەکریٚ هەلەیەکی ئۆرگانیکی تیدابیت کە پزیشکەکە سەرەرای پشکنینی ورد، نەیدۆزیبیتەوە. ئەم پزیشکە لۆژیکیە بۆ خۆی براندوویەتیەوەو هەموو بۆچوونیکی جیاواز بیدەنگ دەکات کە رەنگە بۆ نەخۆشەکە ئەنجامی زۆر ناخۆشی هەبیت. لەبەرئەوە رەنگە باش بیت هەندیٚ بە گومانەوە بروانریتە گفتوگۆی لۆژیکی، چونکە رەنگە پشکنینی مەرجەکان لەبیر بچیتەوە کە رەنگبیٚ لەگەلٚ واقیعدا ریك نەبن.

## میتۆدی گریمانەیی لۆژیکئامیز:

لە میتۆدی گریمانەیی لۆژیکئامیزدا مرۆ گریمانیك دەکات یان مەتەلیك وەکو مەرج دادەنیت، ئینجا ریئەنجامیکی لۆژیکی سازدەکات و لە کۆتاییدا تاقیدەکاتەوە ئایا ئەو مەرجانە لەگەلٚ واقیعدا دەگونجین یان نا، بەم شیوەیە مرۆ هەم ئەزموون و هەمیش لۆژیك بەکاردەهینیٚ، من نموونەیەکی کلاسیکی لە میژووی زانستەوە دەهینمەوە بۆ پیشاندانی میتۆدی گریمانەیی لۆژیکئامیز، نموونەیەکی زۆر جوانە، رەگی ئەم نمونەیە لەوکاتانەوەیە کە هیشتا وشەی "پۆزەتیڤیزم" و "میتۆدی گریمانەیی لۆژیکئامیز" نەهاتبوونە ئاراوە.

ئیگناز سیمیلڤایس *Ignaz Semmelweis* وەکو پزیشك لە سالاٚنی (١٨٤٤-٤٨) لە یەکیك لە دوو بەشی مندالبوون لە نەخۆشخانەیەکی گەورەی شاری ڤییەنا کاری

دەکرد. تۆماری کردبوو کە لە بەشەکەی ئەودا ریژەی مردن بە تای زەیستان بەرزترە لە بەشـەکەی تـرو بریـاری‌دا لـە هۆکارەکـانی بکۆلیتـەوە. ئەگـەر لـەوەدا سـەرکەوتنی بەدەسـتبهینابا دەیتوانـی هۆکـانی تـای زەیسـتان روون بکاتـەوەو تواناکـاری بـۆ قەلاچۆکردنی ئەو نەخۆشیە پیکبهینێ، کەواتە ئەوە پرسیکی گرنگ بوو.

سیمیلڤایس تەنها بەوە قایل نەبوو کە تەنها گریمانیك بکات، بەلکە هەموو ئەو گریمانانـەی کـە دەیتوانـی تـاقیکردەوە، بەشـیکیان گریمـانی نـەریتیو بەشـیکیان بۆچوونی خۆی بوو، نۆ گریمانی دانا.

١-کاریگەری ئەتمۆسفیر (کەشوهەوا)

٢-زۆری ژمارەی نەخۆش لە بەشەکەدا.

٣-بەدخۆراکی.

٤-کەمی سەرپەرشتی.

٥-دەستقورسی ژنەکان لە کاتی پشکنیندا.

٦-روونکردنەوەی دەروونی.

٧-هەلە لە باری مندالبووندا.

٨-گواستنەوەی ماددەی ژەهراوی لە مرۆڤە مردوەکانەوە.

٩-دابەشبوونی بەرهەمی سپینەی هیلکەی مرۆڤی مردوو یان زیندوو.

سیمیلڤایس دەستی بە پووچەلکردنەوەی گریمانەکانی کرد، تـا پیشـانی بـدات زۆرتریـن ژمـارەی گریمانـەکان پووچـەلن. بۆ ئـەوەی جیـاوازی نیـوان هـەردوو بەشـەکە دەربکـەوێ دەبوا گریمانەکان پووچـەل ببنـەوە، تا بەوەدا دەرکـەوێ کـە جیـاوازی لـە نیوان دوو بەشەکەدا نەبوە. ئەلتەرناتیڤی ئەوەش بۆ ئەوەی ئەو جیاوازیانە پشتگوێ بخات، بیئەوەی مردن بە تای زەیستان لەو بەشەدا گۆرانی بەسەردا بیت، بەم شیوەیە زۆربـەی ئەو گریمانانـە پووچـەل دەبیتـەوە. گریمـانی ژمـارە ١ هـەر یەکسـەر پوچـەل دەبیتـەوە، چونکـە کەشـوهەوا هـەمان جـۆر بـوو لـە هـەردوو بەشـەکەدا. هـەروەها پەیوەندییـەکان هـەمان شیوە بوون لـە بەشـەکاندا. بۆ نموونـە هـەمان جـۆری خـواردن پیشکەشـدەکرا، بـەلام بـاری مندالبوونـی ژنـەکان جیـاواز بـوو لـە هـەردوو بەشـەکەدا، سیمیلڤایس تاقیکردنـەوەی ئەنجام دا وایکرد کە ژنانی بەشـی ١ لەسـەر لا مندالیـان ببـێ، وەك لـە بەشـی ٢دا وابـوە، ریـژەی مـردن کـەم نـەبۆوە، کـەوابوو ئـەو گریمانـەش پووچەل بۆوە.

گریمانی ٦ ئەوەی روونکردەوە کە ژنەکان لە ئەنجامی تۆقینددا تووشی تای زەیستان هاتوون، هۆکارەکەشی ئەوە بوە کە کەشیشەکان کاتێ هاتن بۆ بەشی ١ بۆ دوا چەورکردنی ژنانی مردوو، بەناو ژوورەکانی تری بەشەکەدا رەتبوون و بەوجۆرە ژنەکان مردنی خۆیان بیرکەوتۆتەوە، لە بەشی ٢دا کەشیشەکان راستەوخۆ چوونە نیو ژووری ژنە مردوەکان. سیمیلڤایس ئەوەی تاقیکردەوەو داوای لە کەشیشەکان کرد کە بە دەرگای پشتەوەدا بینە ژوورەوە بیئەوەی نەخۆشەکان هەستیان پیبکەن، بەلام ریژەی مردن کەم نەبۆوە، لەویشدا گریمانیکی تریش پووچەل بووەوە، دەتوانین ئەنجامگیریەکە ئاوا شیوەبەند بکەین.

مەرج ١ (گریمان): ئەگەر جیاوازی لە ریژەی مردن پەیوەندی هەبێ بە تۆقینی ژنەکان لە کەشیشەکان، ئەو جیاوازییە نامینێ ئەگەر چیتر کەشیشەکان لە بەشەکەدا خۆیان نیشان نەدەن.

مەرج ٢ (تیبینی): کەشیشەکان چیتر لە بەشەکەدا خۆیان نیشان نادەن، بەلام ریژەی مردن هەر وەکو خۆیەتی.

دەرەنجام: کەواتە جیاوازیی ریژەی مردن پەیوەندی نیە بەوەی کە کەشیشەکان ژنەکانیان تۆقاندبێ.

ریئەنجامەکە لە رووی لۆژیکییەوە برەوداره. هەروەها چونکە مەرجی دوەمیش لەگەڵ واقیعدا ریکدەکەوێ، کەواتە گریمانەکە پووچەل دەبیتەوە.

گریمانی ئەوەی کە مادەیەك لە مرۆڤە مردوەکانەوە گواسترابیتەوە بۆ ژنە زەیستانەکان بۆچوونی سیمیلڤایس خۆی بوو. بیرۆکەکەی لەوەوە وەرگرت کە لە دوای شیکردنەوەی لاشەیی دەرکەوت هاوکاریکی بە هەمان نیشانەی نەخۆشی شیوەی تای زەیستان مرد.

سیملیڤایس بیری لەوە کردەوە کە لە بەشی یەکەمدا هەندێ خویندکاری دەرمانسازی هەن کە هەموو بەیانیەك بەشداری شیکردنەوەی لاشەکان دەکەن پیش ئەوەی ژنەکان بپشکنن، تاقیکردەوە کە بۆنی دەستی قوتابیەکان ناخۆشە کاتێ لە شیکردنەوەی لاشەکانەوە دینەوە. گریمانەکەی تاقیکردەوە بەوەی کە قوتابییەکان دوای پرۆسەی شیتەلکاری لاشەکان دەستەکانیان بە ئاوی کلۆر بشۆن. ریژەی مردن بە شیوەیەکی دیار نزم بوەوەو بە نزمی مایەوە تا کۆتایی سالی داهاتووش.

**تویژینەوەکەی سیمیلڤایس بە شیوەبەندی وا دەنوینیٚ:**

*مەرج ١ (گریمان): ئەگەر ریژەی مردن پەیوەندی بەوەوە هەبیٚ کە خویندکارەکان دوای شیتەلکاری لاشەکان مادەی ژەهراوی دەگوازنەوە، ئەوە ریژەی مردن بە دوورخستنەوەی ئەو ماددانە نزم دەبیتەوە.*

*مەرج٢ (یاریدەدەری گریمان): خویندکارەکان بە ئاوی کلۆر دەستیان دەشۆن، بۆ ئەوەی ئەو ماددە ژەهراوییانە نەمینن.*

*مەرج٣ (تیبینی): کە خویندکارەکان دەستیان دەشۆن ریژەی مردن کەم دەبیتەوە.*

*دەرئەنجام: کەواتە جیاوازی ریژەی مردن پەیوەندی هەیە بەو مادە ژەهراوییەی کە لە شیتەلکاری لاشەکانەوە دەگوازرینەوە.*

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم رینەنجامە لە رووی لۆژیکیەوە برەوی نیە. لە رووی لۆژیکیەوە دەشیٚ ریژەی مردن پەیوەندی هەبیٚ بە هۆکاریکی ترەوە کە بە ریکەوت لەگەڵ دەستشۆردنی قوتابیەکاندا هاتبیٚ، سەرەرای ئەوەش رینەنجامەکە لەسەر بناغەی یاریدەدەریکی گریمانەکە بنیاتنراوە کە ئاوی کلۆرەکە کاریگەر بوە. من لە بەشی نۆی کتیبەکەدا دیمەوە سەر ئەو مەسەلەیە.

بە وتەیەکی تر گریمانەکە جەختکەری کەمبوونەوەی ریژەیمردن نەبوو، بەلاٚم تا نمونە زۆرتر بیت لە پەیوەندی بە پاکوخاوینی و دابەزینی ریژەی مردن بە تای زەیستانی، زیاتر ئەگەری راستی گریمانەکە دیتە دەستەوە. کەواتە ئاسانترە گریمانیك پووچەل بکریتەوە وەك لەوەی جەختی لەسەر بکریت. ئەمە شتیکە کە زۆر بە تیۆریسینەکانی زانست ئالوگۆریان بەسەردا هیناوە، من لە بەشی نۆیەمدا دیمەوە سەری.

گریمانی ژمارە ٩ تەنها تەواوکەریکی گریمانی هەشتەم بوو. سیمیلڤایس بۆیە وای بۆ چووبوو کاتیٚ تیبینی کردبوو کە ژنیکی نەخۆش بە تای زەیستانی نەخۆشیەکەی گواستۆتەوە بۆ ژنانی تر. تاقیکردنەوەکانی سیمیلڤایس نمونەیەکی راستی قوتابخانەی زانستی بۆزەتیڤیزمە. رەنگە مرۆ پیی وابیٚ کە کەمیٚ ئاسانە، ئەمرۆ روون و رەوان دەرکەوتوە کە پەیوەندی لە نیوان پاکوخاوینیو ریژەی مردن هەیە، ئەوەی کە سیمیلڤایس و ریچکەشکینی تیداکرد. بەلاٚم ئەوە بە هیچ شیوەیەك لە سەردەمی سیمیلڤایسدا وا نەبوو، ئەوە وەهمیکی گیژانەیە کە گوایە زانستی ئەمرۆ بە روون و ئاشکرایی کاردەکات، سەرەرای ئەوەش ئارەزوو بۆ وەرگرتنی میتۆدە کۆنەکان

هەبوو، هەموو نەخۆشخانەکان بۆ نموونە بەو نیازەوە دروستدەکران کە نەخۆشەکان لە هەوای بۆگەن بپاریزن. سیمیلڤایس خۆی لە خۆیدا زۆر رەخنەی هاتە سەرو گالتەی پیکرا، چارەنووسی ئەو تراژیدی بوو، لە شیتخانەیەکدا مرد. رەنگە پەیوەندی هەبێ بەو کاردانەوانەی لە ئەنجامی دۆزینەوەکەیدا رووبەرووی بۆوە. بیست سالی خایاند تا بیرۆکەکانی ئەو جیگەیان گرت، کاتیك بوو کە ئەوەی پزیشکە کۆنەکان خانەنشین کران یان مردن و نەوەیەکی نویی پزیشك کە ویناکردنە کۆنەکانیان هەلنەدەگرت هاتنە مەیدان. وانەیەك لەم حالەتەی سیمیلڤایسەوە وەربگیریت ئەوەیە کە رەنگە ئیمەش ئەمرۆ بۆچوونی وامان هەبێ کە وەك ئاشکراو روون لیی تیبگەن کە ئیمە سەختە بۆمان چارەسەرییەکمان بۆ کیشەکان هەبێ کە رەنگە جاریك بە ریکەوت ئەو کیشەیە مندالانە ئاسان بیت.

پۆزەتیڤیزم هەمیشەو هەتا ئیستاش کیشەی لەسەرە، رەخنەکان هیندە توندن کە خودی وشەی "پۆزەتیڤیست" وەکو سووکایەتی دەبینریت، من ئیستا گفتوگۆ لەسەر جووتێ لەو تاوانبارکردنانە دەکەم کە رووبەرووی پۆزەتیڤیزم دەکرینەوە، تاوانبارکردن بە هەستساردیو بێ فەنتازیایی.

### ٥-زانست یان خەیالّ:

پۆزەتیڤیزم هەندی جار بە وشکیو بێ فەنتازیایی تاوانبار دەکریت، لیکۆلەرەوەیەکی نمونەیی پۆزەتیڤی فاکتە (راستی) کەلەکە دەکات، کاتێ بەشی خۆی فاکتەی کۆکردەوە ئەیانخاتە نیو کۆمپیوتەریکەوە، لەویوە ئەنجامی ئامادە لە شیوەی خشتەدا بەدەستدەهینێ، لە رووی بابەتەوە هەمووی تەواوە، بەلام بە باوەری مرۆ زۆر کەم سەرنج رادەکیشێ. هەندێ لە پۆزەتیڤیستەکان بە دلنیاییەوە تاوانبارن بەوەی کە ئەو وینە هەلەیە بلاوبۆتەوە، بەلام ئەو وینە هەلەیە هەروا ناشیرینیشە، هەر جۆریك لە لیکۆلینەوە داهینان و خەیالی دەوێ.

پۆزەتیڤیزم هەموو فەنتازیایەك دەرناهاویژیتە دەرەوە، بە پیچەوانەوە، ئەو دەلێ کە فەنتازیاو شیکردنەوەی رۆشنبیری دوو کارکردەیان هەیەو دەبێ جیا لەیەکتر وەربگیرین. فەنتازیا بۆ ئەوە بەکاردەبرێ کە بگاتە ئیدەیەك (بیرۆکەیەك)، گریمانیك، یان تیۆرییەك، رەنگە ریساگەلیك نەبێ بۆ ئەوەی پیشانی بدات چۆن مرۆڤ بگاتە بیرۆکەی نوێ، مرۆڤ لە ریگەی تویژینەوەی رۆشنبیریشەوە ناتوانێ پییان بگات. لە

جیاتی ئەوە، بیریکی نویٚ هەروەکو بروسکە لە ئاسمانیکی سامالەوە دیٚ، هەرچەندە زۆرجار دوای خۆگوشینیکی زۆر دیت. زانستی دەروونناسی یەکرابوو لەسەر ئەوەی کە فەنتازیاو دەرك بە ئازادی رۆل دەبینن لەوەی پیی دەوتریٚ "ناواخنی دۆزینەوەکان".

گریمانەکەی سیمیلڤایس لە بارەی هۆکاری مردن بە تای زەیستان، نموونەیەکی باشە بۆ فەنتازیاو توانای پیکەوە گریدان، ئەو دوو شتی جیاوازی پیکەوە بەستەوە، مردنی هاوکاریکی‌و بۆنی دەستی خویندکارەکان، لەو راستیانەوە کە پەیوەندی شیتەلکاری لاشەکان رەنگە لەگەلٚ تای زەیستانی هەبیٚ گریمانی کرد. بەسەرهاتی ئەوەی کە چۆن رەنگە ئەرخەمیدس پرنسیپەکەی خۆی دۆزیبیتەوە، بەلاٚم وەك زۆر بەسەرهاتی تر راستییەکی قولتری تیدایە، زۆر شت لە بارەی هەلومەرجی داهینانەوە دەوتریت.

پرنسیپەکەی ئەرخەمیدس وەك ناسراوە ئەوەیە کە ئەو تەنەی کە بەناو شلەیەکدا دادەبەزینریتە خوارەوە، کەمبوونەوەی کیشی ئەو تەنە بە قەد کیشی ئەو شلەیەیە کە پالنراوەتە خوارەوە. ئەرخەمیدس کە لە سەدەی ٢٠٠ پ. ز لە سیراکوسا دەژیا، یەکیك بوو لە پیشینترین زاناکان، بە پیی بەسەرهاتەکەی، پرنسیپەکەی رۆژیٚ بۆ هاتوە کە لە حەوزی گەرماوەکەدا پالکەوتبوو، هەر لە گەرماوەکە هەستا رایکردە مالەوە بەبیئەوەی کات بە خۆی بدات بۆ جل لەبەرکردن، لە کاتیکدا کە هاواری دەکرد "*Heureka!* واتە من دۆزیمەوە!

**٦-هەلسەنگاندن و نرخاندن:**

**نرخاندن چیە؟**

رۆمانی دەریاوانی ڤاری لارسن-ی جاك لەندەن، باس لە لاویکی نموونەیی دەکات کە لە ئەنجامی رووداویکەوە دەکەویتە ناو کەشتیەکەی کەشتیەوانیکی بەدکار بە ناوی ڤاری لارسن، رۆژیکیان ئەو وتویژە لە نیوان لاوەکەو کەشتیەوانەکە روودەدات.

*-ئەم پاش نیوەرۆیە ڤیزەون دەهاتنە بەرچاو، هۆی چی بوو..؟ بەم شیوەیە دەستییپیکرد.*

*-هۆی ئەوە بوو کە هاریسۆن بەدکارانە رەفتاری لەگەلدا کرا، بە پیکەنینیکی کورتەوە.*

-بە بڕوای من ئەمە بە تەواوی نەخۆشیەکی دەریاییە، هەندیك کەس تووشی دەبن و هەندێ کەسیش تووش نابن.

من بەرهەلستیم کردو وتم:

-نا، وا نەبوو، ئەو وتی:

-بەلێ، ریك وابوو، چۆن دەریا پڕە لە جولە، ئاواش زەوی پڕە لە بەدکاری، هەندێ مرۆڤ لەبەر بەدکاری نەخۆش دەبن، هەندیکی تر لە دەریاوە تووشدەبن، ئەمە تەنها هۆکاریکە.

-بەڵام ئیوە کە جگە لە خراپی، شتیکی دیکەتان بۆ مرۆڤ نیە، بە راستی هیچ نرخیك بۆ ژیان دادەنین؟

-نرخ، چ نرخێ؟ بەچی ئەو نرخە دەپیون؟ کێ نرخ لەسەر ژیان دادەنیت؟

وەڵامم دایەوە:

-من دایدەنیم.

-نا..؟ پیم بلی بزانم چ نرخیکت هەیە؟ مەبەستم ئەوەیە نرخی کەسیکی تر لای تۆ چیە؟ بلی بزانم نرخی چیە؟

-نرخی ژیان؟

چۆن بتوانم پیناسەیەکی لۆژیکی بکەم. من کە هەردەم باش دەمتوانی گوزارە لە خۆم بکەم، زۆرجار سەختیم هەبوو بۆ بەدەستهینانی وشە کە لەگەڵ ڤاری-لارسن دەدوام، من دوایی دیمە سەر دەرەنجامی ئەوەی کە بەشیکیان پەیوەندی بە کەسایەتی ئەو پیاوەوە هەبوو، بەڵام بەشی زۆری پەیوەندی هەبوو بە سەرجەم تیروانینی پیچەوانەیی ئەو بۆ ژیان، بە پیچەوانەی ماتریالیستەکانی ترەوە کە من دیبوومن و لای کەم هەندێ بۆچوونی هاوبەشم لەگەڵیاندا هەبوو، هیچ شتیکی هاوبەشم لەگەل ئەمدا نەبوو. رەنگە ئەو سروشتبوونە بناغەییەی لەودا هەبوو ئاوا منی بێ ئامانج دەکرد. ئەو زۆر راستەوخۆ دەچوە ناو ناوکی بابەتەکە. هەمیشە پرسیارەکانی بە دلنیاییەکی واوەو بەبێ وردەکاری‌و تویکل دەکرد کە من هەست بکەم لە قولایی ئاوەکەدام و هەولدەدەم و پییەکانم ناگەنە بنەوەی، نرخی ژیان؟ چۆن بتوانم بە چاوتروکانێ وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە؟ من وەکو بەلگەنەویستیك پیرۆزیی ژیانم قبول بوو، کە خۆی لە خۆیدا بەنرخە، ئەوە راستییەکی روون بوو کە هەرگیز

گومانم لیی نەبوو. بەڵام کاتێ کە ئەو، ئەو ڕاستیەی دەخستە ژیر پرسیارەوە، بی ئامانج دەبووم.

ئەو وتی:

–دوینێ باسی ئەو شتەمان کرد، لە پیشدا لە گەلتدا بووم کە ژیان وەکو هەوینیک وایە، وەکو هەلدەچێ، ئاواش دادەچێ، کە مرۆڤ دەتوانێ بژیو لە بارودۆخەکاندا خۆی ڕاگرێ، کە پەیوەندی هەیە بە ئارەزووی بۆ پیشەوەچوون، ئەگەر یاسای پیشاندان و داواکردن مانایەکی هەبێ ئەوەیە کە ژیان بی نرخترینە لەسەر زەوی، ئەوەندە، ئەوەندە زۆر ئاو هەیە، ئەوەندەو ئەوەندە زۆر زەوی هەیە، ئەوەندەو ئەوەندە با هەیە، بەڵام ژمارەی ئەو ژیانانەی کە دەیانەوێ بینە ناو جیهانەوە بیکۆتاییە، سروشت دەستبڵاوە. بیر لە ماسیەکان و ملیۆنان هیلکەماسی بکەنەوە. بە ڕاست هەر بیر لە خۆت و من بکەرەوە. لای ئیمە تواناکاری دروستبوونی ملیۆنان ژیان هەیە، ئەگەر تەنها بوارو کاتمان هەبوایە هەریەك لەو ژیانە لە دایکنەبوانەی خۆمان بینینە بەرهەم، ئەمانتوانی ببینە باوکی نەوەکان و کیشوەرەکان پربکەین لە دانیشتوان، ژیان؟ باه! ژیان نرخی نیە، لەناو هەموو شتە بی نرخەکاندا بیگومانم هەرزانترینە. لە هەموو شوینیکدا دەگەرێو سوالدەکات، سروشت بە دەستبڵاوی زولمی لیدەکات، کە شوین بۆ تەنها ژیانێ هەیە، هەزاری تیدەخزینێ، بۆیە هەر ژیانەو ئەویتر دەخوات، بە تەنها ئەو گوناح و تیرنەخۆرانە دەمیننەوە.

من وتم:

–ئیوە داروینتان خویندۆتەوە، بەڵام بە هەلە لیی تیگەیشتوون ئەگەر ئەو دەرەنجامەتان دەرهینابێ کە خەبات لە پیناوی مانەوەدا ئەو مافەتان دەداتێ کە بەبێ پیویستبوون ژیانێ ویران بکەن.

شانی هەلتەکاندو وتی:

–ئیوە کەوا دەلین باش دەزانن تەنها مەبەستتان لە ژیانی مرۆڤە، گۆشتی مەروماڵات و بالندەو ماسی هەر بە قەد من و کەسیکی تر ویران دەکەن، بە هیچ شیوەیەك ژیانی مرۆڤ جۆریکی تر نیە، بەڵام ئیوە وا هەست دەکەن، ئەگەر چەند هۆیەك بهیننەوە بۆ ئەوەی ژیانی مرۆڤ جۆریکی ترە من باوەرتان پیدەکەم، بۆچی من لەم ژیانە بینرخ و هەرزانە دەستی خۆم بگرم؟ کریکاری دەریایی تر زۆرن جگە لەمانەی سەر ئەم کەشتیە کە بەکرێ بگیرین، ئیوە کە لە لادیکاندا دەژین دەبێ لە هەموان باشتر بزانن کە هەژارەکانتان دەخزینە سارەنگویلکی شارەکانەوەو برسیتیو

*نەخۆشیان تیدا بڵاودەبیتەوەو هیشتاش زۆر هەزاری تریش هەن كە لە پەنای قەراغە نانیكدا یان پارچە گۆشتیكدا لە برسا دەمرن و ژیانیان ویران دەبێ، لەوەی كە بزانن چیان لەگەڵ خۆتاندا بۆ ببەن، ئایا بینیوتانە كریكارەكانی كەشتی لە لەندەن چۆن وەكو ئاژەلی كیوی بەشەر دین لەسەر فرسەتی كار وەرگرتن؟*

*دووركەوتەوە بەرەو پەیژەكان، بەڵام ئاوریكی دایەوە تا قسەیەكی تر بكات:*

*-ئیوە تیناگەن، تەنها نرخێ كە ژیان هەیبێ، ئەوەیە كە ژیان خۆی لەسەر خۆی دایدەنیت؟ لەبەرئەوەی پیویستە ژیان پراكتیكی بیت بۆ خۆی، سروشتیە نرخی بەرز بۆ خۆی دادەنیت. تەماشای ئەو كریكارە بكە كە لەوێ دانیشتوەو خۆی بە تایەكانەوە گرتوە. وەكو ئەوەی شتیكی زۆر بە نرخ بیت، باجیكی زۆر بەنرخن، لە ئەلماس و یاقووت بە نرختر، بۆ ئیوە، نا، بۆ من بە هیچ شیوەیەك وانیە، ئەی بۆ خۆی؟ بەلێ، بەڵام من بە نرخاندنەكەی ئەو قایل نیم، ئەو زیادەرۆیی دەكات كە نرخی ژیانی خۆی بە زۆر زانیوە، لافاویك لە ژیان دەیەوی بیتە ناو جیهانەوە، ئەگەر ئەو بكەوتایەتە خوارەوەو میشكی پان ببوایەتەوەو وەكو قالبی هەنگوین بەسەر تایەكەدا بچۆرایە، هیچ زیانیك لە دنیا نەدەكەوت، دەستكەوتی زیاتر بوو، ئەو تەنها بۆ خۆی ژیانی نرخدارە، بۆ ئەوەی بزانێ چۆنە، تەنها بیر لەوە بكەرەوە كە ئەو وەكو مردوویەك ئاگای لەوە نابێ كە ژیانی لەدەست داوە. ئەوە تەنها خۆی بوو كە ژیانی خۆی بەرزتر لە یاقووت و ئەلماس نرخاندبوو. ئەلماس و یاقووتەكانیش بۆ فریدانن، لەسەر تایەكانی ئاوی دەریاكان دایاندەمالن، ئەو نازانێ كە یاقووت و ئەلماسەكان توورهەلدران، هیچ زیانێ ناكات، هەتا خودی زیانیش زانینی ئەو زیانەی لەدەست دەچێ، دەبێ ئەمە بزانن، وەڵامتان چیە؟*

*-لای كەم ئیوە سەركەشن.*

*ئەمەم وت و بەردەوام بوومەوە لەسەر قاپ شتنەكان.*

**شتیكی تایبەت لەم گفتوگۆیەدا هەیە، مەبەستم لە خودی بۆچوونەكانی ڤاری - لارسن نیە، گومانی تیدا نیە كە ئەو لە هەموان بەدكارانەتر گوزارە لە خۆی دەكات، بەڵام ئایا بە دلنیاییەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ ئەو كەسەی كە لە بناغەو ناخەوە وەكو ئەو بیردەكاتەوە، نەخیر، سەرنجراكیش ئەوەیە كە هەر هیچ كۆپلەیەكی راستی لە قسەكانی ڤاری لارسن بەدی ناكرێ، هەرچی دژە -بەلگەیەك كە پالەوانە لاوەكەی نیو**

کتیبەکە دەیهینیتەوە دەکەویتە خوارەوە، بەڵام ئەمە لە لایەکی ترەوە کار لە ڤاری لارسن ناکات، قسەکانی هەردوکیان لە تەك یەکەوە دەروات، ئەمە بە چیەوە بەستراوەتەوە. بەوەوە کە ئەوان بە هیچ شیوەیەك باسی واقیع ناکەن، هەرچەند بە ریکەوتیش وابێ، ڤاری لارسن شتیکی بۆ کورە لاوەکە رۆشن نەکردەوە کە پیشتر نەیدەزانی، لە جیاتی ئەوە نرخاندنیکی دانا، هەلسەنگاندنیکی کرد.

لودی لوندگرین کەسێ بوو کە بە بەردەوامی هاتوچۆی کۆمەڵایەتی دەکرد. بە شیوەیەکی ئاسایی لەسەر کورسیەکە دادەنیشێو کە بەرپرسە کۆمەڵایەتیەکەی لە بارەی باری ژیانیەوە لیی دەپرسێ وا وەڵام دەداتەوە:

*–ئیستا زۆر نایەمە دەرەوە، من تەمەنم ٥٥ سالە، ژنەکەم بەجیی هیشتووم، من پیشوەخت خانەنشین کراوم و ٣٠ ساڵ مەیم هەلقوراندوە. من هیچ خۆشییەکم لە ژیاندا نیە، هیچ کەسیکیش دلی بە من خۆش نیە، بۆیە وا بیردەکەمەوە کە خۆم بکوژم، پیم مەلی خۆت هەلسینەرەوە، چونکە تۆ وەکو خۆم باش دەزانی کە ئەوە نامینێ، مەلی هەمووی ریك دەکەویتەوە، چونکە تۆ دەزانی کە وا نابێ.*

ئەمانەش دیسانەوە لەسەر راستی بنیات نەنراون، رەنگە بەرپرسە کۆمەڵایەتیەکە خۆی لە خۆیدا باوەری وا نەبێ کە لوودە بە راستی بێ. رەنگە هەرەشەی خۆکوشتنەکەی هاواریکی شاراوەبێ بۆ یارمەتی، کە لەو حالەتەدا ئەو دەتوانێ یارمەتی بدات، بەڵام ئەگەر لوودە بە راستی بیت و ئەگەر رەوشەکەی وا خراپ و بیهیوایانە بیت کە باسی دەکات، ئەوکاتە شتیکی ئەوتۆ نامینێ بوترێ، لە هەموو حالەتیکدا نابێ کار لە هۆشی ئەو بکرێ، لە ئاستی هەستەکانیدا، بۆ ئەو ویستی ژیانەی کە رەنگە تییدا مابێ، ئەمەش دیسان دەربارەی نرخاندنە، نەك دەربارەی فاکتە.

فەیلەسوفی فینلەند– سویدی جۆرج هینریك ڤوت رایت لە کتیبی (زانست و عەقل)دا وا دەنووسێ:

ویناکردنی کە من وای نابینم واقیعی نەبێ، ئەوەیە کە مرۆڤایەتی بەرەو لەناوچوون دەچێ وەکو جۆریکی ئاژەڵ /../ بەشبەحالی خۆم، ئەمە نامهەژینێ، جاریکیان هەر دەبێ مرۆڤ وەکو جۆر لە ناوبچێ، ئەگەر ئەمە لە چەند سەدهەزار سالیکدا رووبدات یان لە چەند سەد سالیکدا، ئەمە بە ویناکردنیکی گەردوونی ئەگاتە مژە جگەرەیەك. کاتێ مرۆ بیردەکاتەوە چەندەها جۆری تر بە دەستی مرۆڤ خۆی لەناو چوە، ئەم تۆلەسەندنەوە سروشتیە بە رەوا دەزانێ.

من پیم وا نیە ڤون رایت بە جیدی مەبەستی بێ کە ئارەزووی لە دوارۆژ نیە، ئەمە زیاتر لەوە دەچێ کە ئەو رقهەلسینێو هانبدات بۆ بیرکردنەوەی بناغەیی، بەڵام گریمان کە ئەو بە راستی مەبەستی ئەوەبێ کە وتوویەتی، چۆن مرۆڤ بتوانێ دژەبەلگەی بۆ بهینیتەوە؟ چۆن بەلگە دەهینیتەوە بۆ ئەو مرۆڤەی کە بۆ هەر بەلگەیەك لە بارەی جەنگی ئەتۆم، ژەهراویبوونی زەویو ئاو، گۆرانی کارەساتئامیزانەی کەش، تەنها وەڵامی ئەوەیە: "من هەقم بەسەریەوە نیە"؟ دژی مرۆڤێ کە بە تەواوی بیئارەزوە لەوەی بزانێ دوای مردنی ئەو خۆی، مرۆڤایەتی چی بەسەر دێ، ناکرێ هۆیەکی بۆ بهینریتەوە.

ئەو سێ نمونەیەی سەرەوە لە سێ جۆر نرخاندنی مرۆڤ دەدوێ. لە روونکردنەوەکانی *UN* سەبارەت بە مافی مرۆڤ لە سالی ١٩٤٨دا بەم جۆرە گوزارە لە پرنسیپی نرخی مرۆڤ کراوە: "هەموو مرۆڤێ بە ئازادی لەدایکبوە و هەمان نرخ و مافیان هەیە، ئەوان تەیارکراون بە عەقل و ویژدان و پیویستە بە رۆحیکی برایانەوە رەفتار لەگەڵ یەکتردا بکەن". بەڵام ئەمە بە ئاسانی دەتوانرێ بخریتەروو کە هەندێ مرۆڤ بە ئازادی لەدایك نابن، هەندێ کەس وا رەفتاریان لەگەڵ دەکرێ کە زۆر بە نرخ بن لە کاتیکدا هەندیکی تر وەکو زبل رەفتاریان لەگەڵ دەکرێ، کە هەندیك کەس مافی زۆری هەیەو هەندیکی تر هیچ مافیکی نیە، نمونەکەی لودە لوندگرین، ئەوە دەخاتەروو، کە ژیان هەندێ جار بۆ مرۆڤ خۆیشی نرخیکی نیە، ئەگەر تیگەیشتن لە نرخی مرۆڤ وەکو شتیکی راستی، شتیك کە لە واقیعدا هەیە بیت، کەواتە ڤاری لارسن راست دەکات، نرخی مرۆڤ قسەی پووچە.

بەڵام لە جیاتی ئەوە مرۆ دەتوانێ بلیت مرۆڤ پیویست بوو وا رەفتاری لەگەڵ بکرێ کە بەنرخە، ئەو کۆمەلگایەی کە ریز لە نرخی مرۆڤ دەگریت، کۆمەلگەیەکی باشە، ئەو کۆمەلگەیشی کە ڤاری لارسن و هاوچەشنەکانی بریاری تیدا دەدەن کۆمەلگەیەکی خراپە، ئەوسا مرۆڤ لە نرخی مرۆڤ وا تیناگات کە لە راستیدا هەیە. ئەوەیە نرخاندن.

بەو نمونانە دەمەوێ شتیکی جەوهەری دەربرم، نرخاندنەکان بە شیوەیەکی سەرەکی باسی ئەوە ناکەن کە لە واقیعدا هەیە، دەربارەی ئەوەن کە مرۆڤ چی بە باش و چی بە خراپ دەبینێ، چی بە راست و چی بە چەوت دەبینێ، چی بە جوان و چی بە

ناشیرین دەبینیٚ، دەربارەی ئەوەش کە دەبوایە چۆن بێت، یان چۆن نەبێت، مرۆ هەندیٚ جار سەبارەت بە جیاوازی نێوان {ببیٚ}و {پێویستە} دەدویٚ، هەڵسەنگاندنی واقیع ئەوەیە کە {ببیٚ}، نرخاندنیشی {پێویستە}. نرخاندنەکانی لەسەر بناغەی هەستەکان، ڕەوشت، هەستکردن بە جوانییەکانە، لە کاتێکدا کە هەڵسەنگاندنی واقیع لەسەر بناغەی ئەزموونەکانی واقیع و شیکردنەوەی ئەو ئەزمونانەیە.

وت و وێژە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان لەم دواییەدا دەگەڕێتەوە بۆ نرخاندنەکان، ئەمە چەند نمونەیەکە:

*ئایا دیموکراتی جۆرە بەڕیوەبردنیکی باشە؟ بەلیٚ، زۆر هەن پییان وایە دیموکراسی باشە، ئەگەرچی جۆری بەڕیوەبردنی نادیموکراسیانە وابخاتە روو کە کاراتر بیت و ئاستی ژیانیش بەرزتر بیت، ئەوە نرخی خودە کە مرۆڤ بتوانیٚ سەبارەت بە ژیانی خۆی بڕیار بدات.

*ئەگەر ناچاربم هەلبژیرم، ئایا پیم باشترە لە کۆمەلگەیەکدا بم ئازادی کەسایەتی زیاترو جیاوازی داهاتی زۆربیت، یان کۆمەلگەیەك کە ئازادی کەمتر، بەڵام یەکسانی زیاتر بیت.

*ئایا قایل دەبم کە سیاسەتمەداریٚ لەبەر بەرژەوەندی پارتەکەی یان بەرژەوەندی خۆی سیاسەتیٚ بەری بخات کە من وایدادەنیم لادانە لە یاسا؟

*ئایا پیویستە کۆمەلگە کەرەستەیەکی زۆر بۆ یارمەتیدانی راهاتوو بە مەیو بە ماددە سرکەرەکان و بیدەرەتانانی تر خەرج بکات، یان گوناهی خۆیان لە ئەستۆی خۆیان بیٚ؟

*ئایا راستە ئەشکەنجەی ئاژەل بدریٚ تا دەرمان بۆ رزگارکردنی ژیانی مرۆڤ بەدەست بهینریت؟

تاقیکردنەوەیەکی باش بۆ نرخاندنە بناغەییە جیاوازەکان ئەوەیە کە مرۆ بۆ هەر بەلگەیەك بتوانیٚ وەڵامی "ئەمە من هەقم بەسەریەوە نیە" یان "من پیم وانیە" بداتەوە بەبیٚ ئەوەی ببیتە ناماقول.

تیبینی ئەوە بکە کە وشەی "نرخاندن" بە شیوەیەکی تر بەکارهینرا وەك ئەوەی کە لە زمانی رۆژانەدا بەکار دەهینریت کە بە مانای "حوکمدان"، "مەحکومکردن" یان هاوشیوەی ئەمانە بەکاردەبریت، بۆ ئەوەی لە بەدحالیبوون دوور کەویتەوە ئەتوانریٚ بە وشەیەکی قورستر بەڵام تەواوتر "هەلسەنگاندن" بۆ نرخاندن بەکارببریت.

### واقعیبوون- و هەلسەنگاندن:

بۆچی گرنگە پەسنکردنەکانی نیوان واقعیبوون و هەلسەنگاندن لە یەکتر جیابکەینەوە؟ من وایدەبینم لای کەم دوو هۆکاری هەیە.

یەکەمیان: ئەگەر لە نرخاندنە جۆربەجۆرەکانەوە سەرچاوەی گرتبێ، گفتوگۆکان بەرەو حالەتی مردوویی دەبات، بەڵام ئەگەر مرۆ بروانێ ناکۆکیەکە بە چیەوە بەندە، لە واتەواتی بیبەرهەم دوور دەبیتەوە، ئەگەر بۆ نمونە لە بارەی پرسی ئایا لە قوتابخانەکاندا گەواهی ئەنجام (نمرە) دابنریت یان نا، بدویین.

یەکرانەبوونەکە برەوی دەبوو ئەگەر نمرەدانان پیشرەو بوایە بەرەو زانیاری باشتر. لایەنگرانی نمرەدانان دەلین تەنها شتیك کە منداڵان و لاوان وا لیدەکات بە راستیەوە ئەرك بکیشن و فیری شتیك بن، نمرەیە، بەبێ نمرە پالپیوەنەریکی راستەقینەیان نیە بۆ ئەرکەکانی قوتابخانە، دژە نمرەکانیش وەڵامیان دەدەنەوە کە نمرە پیشرەوی خویندنیکی بیبەرهەمە، ئەو زانیاریانەی کە خویندکار بەو ریگایە بە دەستی دەهینێ زوو لە بیریان دەکات. تەنها ئەگەر قوتابیەکان ئارەزوومەند بن و پییان وابێ کە زانیاریەکان بایەخدارن و ئەوەی فیری بوون دیتەوە بیریان، نمرە لە جیاتی ئەوەی یارمەتیدەری زانیارییەکان بێ، کاردانەوەی پیچەوانەی هەیە، لەم حالەتەدا هەردوو بەرەی گفتوگۆ، نرخاندنەکەیان بۆ گرنگی زانیاری، چوونیەکە، ئەوەی ناکۆکن لەسەری ئەوەیە کە چۆن دەبێ لە واقعیی ئەوە تیبگەین، ئایا سیستەمیك بە نمرەدانانەوە یان سیستەمیك بە بێ نمرەدانان دەبیتە هۆی بەدەستهینانی زانیاری باشتر.

بەڵام یەکرانەبوونەکە رەنگە بۆ هۆکاری تریش بگەریتەوە. لایەنگرانی نمرەدانان، قورسایی‌و گرنگی دەخەنە سەر زانیاریەکە، هەرچی دژە نمرەکانن دەلین لە نمرە گرنگتر پەروەردەکردنی کۆمەڵایەتی قوتابیە، قوتابی دەبێ بە شیوەیەك پەروەردە بکرین کە سەربەخۆبن و هاوئاهەنگ بن و بتوانن هاوکاری‌و دەستپیشخەری بکەن، ئەمە گرنگترە لە زانیاریە تیۆریەکان، لەم حالەتەدا هەردوو بەرەی گفتوگۆ، نرخاندنی جیاوازیان هەیە. یەکرانەبوونەکە دەربارەی ئەوە نیە کە ئەگەر بە دلنیاترین شیوە بگەنە هەمان ئامانج، بەلکە دەربارەی ئەوەیە کە مرۆڤ پیویستە کام ئامانجی هەبێ، لەم حالەتەدا کە ناکۆکیەکە سەبارەت بە یەکرانەبوونە لە ئامانجدانان، مرۆ دەلی کە قەیرانی ئامانج لە ئارادایە.

سەرچاوەیەکی باش بۆ جیاکردنەوەی واقیعیبوون و هەلسەنگاندن، ئەوەیە کە مرۆ نەکەویتە ناو دالانی پسپۆرەکانەوە

یان بلی دوو کەس یەکران لەسەر دانانی ئامانجی، کە کەمکردنەوەی بەکارهینانی مەیو مادده سرکەرەکانە، بەلام یەکیکیان پیی وایە کە زۆر بۆهینان، ریگاچارەیەکی کاریگەرە، ئەوی تریان پیی وایە کە زۆربۆهینان، چارە نیەو لە بەکارهینانی مەیو مادە سرکەرەکان کەم ناکاتەوە، لیرەدا یەکرانەبوونەکە لەسەر بابەتە (بابەتیە)، نەك لەسەر نرخاندنەکان.

گریمان هەردووکیان یەکرابوون لەسەر ئەوەی کە زۆربۆهینان، ریچارەیەکی کاریگەرە، بەلام یەکیکیان پیی وایە کە خۆهەلقورتاندن لە سەروەری مرۆڤ، گران لە سەرمان دەکەویَ بۆ کەمکردنەوەی دیاردەکە، بەرامبەر بەمە، ئەویتر پیی وایە مەسەلەی کۆنترۆلکردنی راهاتن بە مەیو مادە سرکەرەکان، ئەوەندە گرنگە کە دەکریَ لە سەروەری ببویرین، لیرەدا یەکرانەبوونەکە لە مەسەلەی نرخاندنەکانە.

سەرچاوەیەکی باش بۆ جیاکردنەوەی واقیعیبوون و هەلسەنگاندن، ئەوەیە کە مرۆ نەکەویتە ناو دالانی پسپۆرەکانەوە، ئەوە وادەکات کە مرۆ زۆرجار تەنانەت لە نرخاندنەکانیشدا داوای زانیاری باوەرپیکراو و بابەتی بکات، بەلام هیچ لیکۆلەرەوەیەك هەرچەند بە تواناش بیت ناتوانیَ بریار بۆ راستی یان هەلەی بارودۆخیك بدات کە پیویستە باسبکریت، لەم جۆرە بریارانەدا هەموو هاولاتیەك وەکو یەك پسپۆرن، ئەمەیە کە دیموکراسی لە بارەیەوە دەدویَ، خەلك لە هەلبژاردندا و نوینەرە هەلبژیرراوەکەیان دەبیَ لە بارەی ئەو پرسیارانەوە بریار بدەن، پسپۆرەکان تەنها بنچینە بۆ بریارەکان دادەنین.

با گریمانی ئەوە بکەین پرۆفیسۆری س کە ناودارە لە بواری ژینەتیك لە دەزگاکانی راگەیاندندا بە بەلگەوە دەیسەلمینیَ کە دەبیَ زیاتر بایەخ بە بواری تەکنەلۆژیای ژینەتیك بدریَ، لە دریژخایەندا دەتوانریَ بە تەواوی نەخۆشیە بۆماوەکان بنبر بکرین، بەلی هەتا دەتوانریَ هۆشیاری مرۆڤەکانیش زیادبکرین، یەکیَ لە بەلگە خۆشەویستەکانی پرۆفیسۆر س ئەوەیە کە کەسانی دژەرای ئەو، نازانستیانەو هەستیارانە راڤەکانیان دەکەن، خۆی نمانیندەی بیرکردنەوەی زانستیانەو عەقلانیە.

بەلام کەسانی دژەرای ئەو، نکولی لەوە ناکەن کە تەکنەلۆژیای ژینەتیك بایەخی دەرمانسازانەی گەورەی هەیە، بۆیە ئەوان لەوە دەترسین کە خراپ بەکاربهینریت. پرۆفیسۆر پیی وایە لەگەل هەبوونی ئەو خەتەرەشدا دەیهینیَ بایەخی پیبدریَ،

دژەراکانی ئەو پییان وانیە، کەواتە ئەمە مەسەلەی نرخاندنە، نەک مەسەلەیەکی زانستی.

پرۆفیسۆر (ش) چەندان ساڵ لە ژینگەو لە ویرانبوونی ژینگەی کۆلیوەتەوەو یەکیکە لە پسپۆرە پیشرەوەکانی جیهان لە بواری ناسینەوەی مادە خەوشاویەکانی با، راپۆرتیك بلاودەکاتەوەو تییدا دەلیت کە جیهان لە بەردەم هەرەشەی گۆرانی کەشدایە بەرەو خراپی، بە هۆی خەوشەکانی ناو باوە، ئەگەر دوای پەنجا ساڵ ئەو ئەنجامە کارەساتئامیزەی ئەو باسی دەکرد، بیتەدی، کتیبەکەی بەوە کۆتایی پیدەهینێ "ئیستا لە رووی زانستیەوە سەلمینرا کە گەشەی ئابووری لە ولاتە پیشەسازیەکاندا راستەوخۆ دەبێ بوەستینرێ".

بەلام ئەمە بە هیچ شیوەیەك نەسەلمینرا! گەلی مرۆڤ هەن، بە لیکۆلەرەوەی ناوداریشەوە کە گرنگی نادەن بەوەی دوای مردنی خۆیان مرۆڤ چی بەسەردیت، ئەمە بۆ کەسێ کە جۆریکی تر بیربکاتەوە سەختە لیی تیبگات، بەلام ئاسانە دەریخەی کە ئەوە هەروا دەمینیتەوە.

بۆ ئەوەی ناوەرۆکی باسەکە رۆشنتر بیتەوە، دەتوانرێ شیوەبەندیکی ریئەنجامانە بنیات بنریت، لەم حالەتەدا مرۆ دەبێ مەرجیکی نرخ دابنیت بۆ ئەوەی ریئەنجامەکەی لۆژیکیو برەودار بیت.

*مەرج: مرۆڤایەتی تووشی کارەسات دەبیت ئەگەر گەشەی ئابووری بەربەست نەکریت.*

*مەرجی نرخ: ئەم کارەساتە ئەبێ بەربەست بکریت.*

*دەرەنجام: کەواتە دەبێ بەر بە گەشەی ئابووری بگیرێ.*

ئەم ریئەنجامە لە رووی لۆژیکیەوە برەودارە، بەلام بەو مەرجەی کە مەرجی نرخەکەی لەگەلدابێ، بۆ ئەوەی ریئەنجامەکە باوەرپیکەر بیت، دەبێ لە لایەکەوە مەرجی یەکەم لەگەڵ واقیع دا ریکبکەویت، لە لایەکی ترەوە مەرجی نرخەکە قبول بکرێ.

لە زۆربەی تیکستە بەلگەدارەکان ئەوە دەکریتە مەرج کە مەرجی نرخەکان بە شیوەیەکی وا سروشتی بن کە دیار نەبن، ئەوان ئالۆزو ناروون گوزارە لیکراون، تەم و مژاوین، بەلام هەندێ جار لە رووی پراکتیکیەوە دەتوانرێ شیوەبەندیەکی (فۆرمۆلە)

وا بکریت، کە سروشتی بیتە بەرچاو وەك ئەو نمونەیەی سەرەوە، ئەوسا رەنگە نرخی مەرجەکە پیشانیبدات کە ئەوەندە روون نیە وەك لە سەرەتادا وابوو.

ئیستا کاتیّ کە من کۆششم کرد جیاوازی نیوان هەلسەنگاندنی نرخەکان و نرخە واقیعیەکان پیشانبدەم، دەبیّ من بکشیمەوەو رایگەیەنم کە هەندیّ جار سەختە، یان ناتوانریّ لە یەکتر جیابکریتەوە. وا بیردەکەمەوە کە نزیکترین وشەو گوزارەمان زۆربەی جار بە نرخاندنەکان شارژ کراون. هەمان کات کە شتیك دەلین دەربارەی واقیع- مانایەکی روونکەرەوەیان هەیە- گوزارە لە نرخاندنیك دەکەن- مانایەکی هەلسەنگینەریشیان هەیە.

ئەگەر من دەستەواژەی "ئابووری بازاری ئازاد" بەکاربهینم، یان "سەرمایەداری" ئەم دەستەواژانە هەمان مانایان هەیە، هاومانان، واتە هەمان سیستەمی ئابوریە کە من قسەی لەسەردەکەم، ئەگەر وشەکە زۆرجار مانایەکی لابەلایشی هەبیّ، واتە زۆرمانایە، ئابووری بازاری ئازاد مانایەکی پۆزەتیڤی نرخ شارژکردنە، بەلام کەپیتالیزم زۆرجار وەکو سوکایەتی بەکاردەبریت.

دەستەواژە زۆرماناکان لە کەسیکەوە بۆ کەسیکی ترو لە کاتیکەوە بۆ کاتیکی تر ماناکانیان دەگۆرین. وشەی {دیموراکسی} {بەریوەبردنی خەلك} دەتوانیّ زۆرمانا بگەیەنیّ، ئەمرۆ "دیموکراسی" وشەیەکی بەناوبانگە بە مانای نرخاندنیکی روونی پۆزەتیڤەوە، بەلام چەند سەد سالیّ پیش ئیستا پەیوەندیەکە پیچەوانەبوو، وشەکە نزیك بە مانای "بوغزاندن"، واتە بە نیگەتیڤ بەکاردەبرا.

ئەم ناوەرۆکەش، ئەم کۆنتیکستە، وشەیەکی تیدا بەکاردەبریت بە مانای شارژکردنی نرخاندنیکە، ئەتوانین ئەو نمونە کۆنە، بەسەرهاتی کریکارە دەریاییەکەی کە دەربارەی کەشتیەوانە بەدکارەکە دوا، بهینینەوە، یەکیکیان وتی:

*-ئەو نەفرەتلیکراوە!*

*ئەویتر زۆر بیری لیکردەوەو وەلامی دایەوە.*

*-ئا، تەواو وایە، بەلام شەیتانیشە.*

*"نەفرەتلیکراو" و "شەیتان" هەمان مانا دەدەن، شازادەی تاریکی.*

بەلام لە ناوەرۆکدا، واتە کۆنتیکستەکە، لە پیش هەموو شتیکدا وشەی {نەفرەتلیکراو} لەم حالەتەدا بە مانایەکی نیگیتیڤ شارژکراوەو، وشەی {شەیتان}یش بە مانایەکی پۆزەتیڤ.

## نرخاندن و زانست:

زانست بە گشتیو پۆزەتیڤیزم بە تایبەتی بە دەگمەن نیە كە تاوانبار دەكرین بە هەست ساردیو كەم دیقەتی، لیكۆلەرەوەی پۆزتیڤیستی، ئەو كەسەیە كە رۆبیكی سپی لەبەردایەو چەكی كوشندەو دەرمانی رزگاركەر بە هەمان هەستی سارد و بیلایەنانە دەهینێ، دكتۆر فرانكینشتاین یان دكتۆر سترانگەلۆڤ پۆزەتیڤیستن.

لە ئاستیكدا بۆ پۆزەتیڤیستێ ئاسانە رووبەرووی ئەم جۆرە ئەفسوسانە بیتەوە، بیگومان لیكۆلەرەوە هەروەكو خەلكانی تر نرخاندنی خۆی هەیەو دەتوانێ بیلیت، نرخاندنیكی ئەو وزەیەن، ئەو سوتەمەنیەن كە هەموو مرۆڤەكان بەریوەدەبەن، بە لیكۆلینەوەكانیشەوە، تۆ بلی دوو پزیشك كار بۆ ئەوە دەكەن شرینقەی ئایدز دابهینن، یەكەمیان مرۆڤدۆستەو دەیەوی مرۆڤ لەم خیوە رزگاربكات، دوەمیان دەیەوێ خەلاتی نۆبل وەربگرێ، هەردوكیان نرخاندنەكان بەریوەیان دەبەن، ئەتوانین پیمان وابێ نرخاندنێ جوانترە لەویتر، بەلام لە هەردوو حالەتدا هەر نرخاندنن، خۆپەرستی نرخاندنیكە، بە هەمان شیوەی خۆشەویستی مرۆڤ، زۆرداری بە هەمان شیوەی نرخاندنن. خۆپەرستی نرخاندنیكە، بە هەمان شیوەی خۆشەویستی مرۆڤ، زۆرداری بە هەمان شیوەی هاوئەشكەنجەیی، ئەم نرخاندنانە لە دەرەوەی زانستەكانە، دەربارەی هەستەكان و هاندەرەكانە نەك دەربارەی فاكتەو روونكردنەوەو خویندنەوەكان.

لە گۆشەنیگای زانستیەوە ئەوە رۆل نابینێ كە چ جۆرە نرخاندنیك، ئەو دوو لیكۆلەرەوەیەی ئایدز بەریوەدەبات، تەنها شتیكی گرنگ ئەوەیە كە نەهیلن نرخاندنەكانیان كار لە ئەنجامی لیكۆلینەوەكانیان بكات– ئەو ئەنجامانە بە دەستەوە نەدەن كە ئاواتەخوازین و خۆیان ناگرن.

میژوونووسێ بۆی هەیە نیشتمانی بێ، بەلام بۆی نیە لە ئەنجامی ئەوەوە بەریوەبەرانی ولاتی خۆی، وەكو قارەمان و دوژمنەكانی وەكو تاوانبار، پیشانبدات، لیكۆلەرەوەكانی بواری كۆمەلگە، با سۆسیالیست، لیبرال یان كۆنسیرڤاتیڤ بن، بەلام ئەگەر ئەنجامی لیكۆلینەوەكانی لەگەلَ هیلی پارتەكەی نەگونجا، بۆی نیە دەستكاریان بكات و بیانرازینیتەوە تا بیگونجینێ.. و هتد.

ئەمەیە و تەنها ئەمەیە مەبەست لەوەی کە لیکۆلینەوە دەبێ ئازادبێ لە نرخاندن، لیکۆلەرەوە بۆی نیە ساختەکاری بکات لە دەرئەنجامەکەی تا لەگەڵ نرخاندنەکانیدا بگونجێ.

ئەمە تا رادەیەك روونە. بەڵام ناکۆکی لەسەر ئازاری نرخاندنی زانست هیشتا بریاری لەسەر نەدراوە. زۆر لە دژەکانی میتۆدی پۆزەتیڤیستی پییان وایە کە شتیك لە خودی میتۆدی پۆزەتیڤیستی هەیە کە هەستساردیو بیئارەزوویەتی بۆ پیویستیەکانی مرۆ دەخەملینێ، گفتوگۆکە کە ئەتوانێ بۆی بروات وەك ئەوەی کە لە گەلیدا بێ. دژە پۆزەتیڤیستەکان: ئەتوانرێ بە باشی لە رووی تیۆریەوە ئازادی نرخاندن راڤەبکرێ، بەڵام بروانە لە پراکتیکدا چۆن دەنوینێ، لیکۆلەرەوەکان لە خزمەتی هەرکەسیکدا دەبن و کاری بۆ دەکەن، کە پارەیان دەداتێ، بروانە چەند لیکۆلەرەوە دەربارەی چەکی ئەتۆمی، چەکی کیمیاییو جۆرەها ئامرازی ویرانکەر داهینانیان کردوە. بروانە چۆن دەربارەی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە زەوی ژەهراوی دەکات تۆژینەوە دەکەن، بروانە چۆن پۆزەتیڤیزم وەکتر ویرانکەرانە خۆی ئاخنیوەتە نیو زانستە مرۆڤایەتیەکانی وەکو دەروونناسیەوە، بروانە ئاکارناسی، ئەو زانستەی کە تەنها دەربارەی ئاکاری مرۆڤەو وا دەردەخات کە مرۆڤ ژیانی رۆحی نیە، ئەمە ئەنجامیکی سروشتی پۆزەتیڤیزمە. ئەو لیکۆلەرەوانەی کە راهاتوون بەوەی مرۆڤ وەکو مشکیکی لابوور تەماشابکەن ریزیان بۆ نرخی مرۆڤ نیە.

پۆزەتیڤیستەکان: بیگومان لیکۆلەرەوەی وا هەیە لەناو نەریتی پۆزەتیڤیستیدا کە بۆ دەسەڵات ئەرك دەکیشن، بەڵام زۆر زۆری تریش لیکۆلەرەوەی پۆزەتیڤییستی هەیە کە لە بەرەی ئۆپۆزیسیۆنی ئەوان راوەستاون و رادەوەستن، بۆ نمونە یەکێ لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی ئەم چەرخەی ئیمە، بەرتراند راسل، خۆی تەرخانکرد بۆ ئەوەی بە میتۆدیکی نمونەیی پۆزەتیڤانە هەولبدات زمانی مرۆڤایەتی لە شیوەبەندیکی زماندا گیر بکات. بەڵام راسل سیاسەتمەداریکی رادیکالیش بوو لە هەموو ژیانی خۆیدا. لە کاتی شەری یەکەمی جیهانیدا بە تاوانی پاسیڤیزم لە زینداندا بوو، لە کاتی شەری ڤیتنامیشدا شتیکی بەناوی دادگای راسلەوە داناو تیایدا ئەمەریکای بە شەرانگیزی مەحکوم کرد، مرۆ چی لە راسل دەوێ، ئەو بۆ دەسەڵات ئەرکی نەکیشا.

ئەو تاقانە نەبوو، بە پیچەوانەوە لیکۆلەرەوەکانی پەیرەوکەری نەریتی پۆزەتیڤیستی، هەمیشە دژ بە دەسەڵات وەستاون، بروانە یەکێ لە گەورەترین

پیشرەوەکانی پۆزەتیڤیزم، گالیلۆ گالیلی، کە ئیوەی هومانیست خۆشیتان لیی نایە. کە لە لایەن دەسەلاتدارانی سەردەمەکەی خۆیەوە فریدرایە زیندان. بروانە فەیلەسوفەکانی سەردەمی رۆشنگەری لە سەدەی حەڤدەدا، چۆن دژی چەوساندنەوەو زۆرداریو بەگایەتی، خەباتیان کردو ریگەیان بۆ شۆرشی فەرەنسا خۆشکرد، بروانە چۆن لە سەدەی هەژدەیەمدا لیبرالەکان و سۆسیالیستەکان لە زانستی سروشتەوە بەلگەیان دەهنایەوەو بە خەباتی خۆیان دژ بە کۆمەلگەی وەستاو، بروانە چۆن رەخنەگری سەرچاوەی میژووییەکان ئەفسانە ناسیۆنالیستیەکانی دەسەلاتدارەکانیان بنبرکرد، بروانە چۆن پۆزەتیڤیستەکانی نیوان دوو شەری جیهانی یەکسەر لە دژی گەشەسەندنی فاشیزم و نازیزم وەستان.

نا، لە رووی نەریتەوە ئیوەی هومانیست و رۆمانتیکەکان، نزیکن لە زۆرداریەرستیو بە هەست بیرکردنەوە، کە لە خزمەتی دەسەلاتداراندایە. ئەوە ریك ئەو هیمایانەن کە نازیستەکان چەپلەی بۆ لیدەدەن.

دژە پۆزەتیڤیستەکان رەنگە لە رابردوودا نەریتی پۆزەتیڤیستی لە دژی دەسەلات وەستابن، بەلام ئەوە ئیستا برەوی نیە، لە دوای شەری دوەمی جیهانی، لیکۆلەرەوە پیشرەوەکان خۆیان بۆ دروستکردنی بۆمبی ئەتۆم تەرخانکرد، سروشتناسەکان و لیکۆلەرەوەی تر ئەنجامگیرییان کردو بۆ دروستکردنی چەکی ویرانکەر بەکارهینرا، ئەوانە بۆ ئەوە بەکارهینران کە تواناکاری سازبکەن بۆ هونەرئەندازی ژینەتیك کە ئاکامی یەکجار گەورەی دەبێ، ئەوان یارمەتیدەر بوون بۆ ویرانکردنی ژینگە، گەران بە دوای زانستدا هەموو شتیکی رەوا کرد.

بۆزەتیڤیستەکان: زانست بیلایەنە، ئەوە پراکتیکەکەیەتی کە ئازاردەرە، ئەوە ئیمە نین بەلکو سیاسەتمەدارەکانن کە بریار بۆ چەکی ئەتۆم، وزەی ئەتۆم و ساختەکاری لە ژینەتیدا دەکەن.

دژە پۆزەتیڤیستەکان: زانستی وا هەیە پیویست ناکا هەمانبێ، کە تواناکاری دروستکردنی چەك لە ئارادا بێ، ئیستا یان درەنگتر کەسێ دێ دروستیان بکات، ئەوسا ئەو لیکۆلەرەوانەی کە ئەو تواناکارییانە دادەهینن بەرپرسیارن، بیانەوی یان نا ئەوان بەرپرسیارن.

ئەوەی ماوەتەوە ئەو وینەیەیە کە بروا بکرێ کە لیکۆلەرەوە دەتوانێ لە رووی نرخاندنەوە بیلایەن بێ، لیکۆلەرەوە بیەوێ یان نا، نرخاندنەکانی کار لە

دەرەنجامەکانی دەکات، با لە سەرەتادا یان لە کۆتاییدا بێ، باشترە دانی پیدا بنیت. ئاوا گفتوگۆکە خیرا دەروا، دەربارەی پرسی پەیوەندی لیکۆلەرەوە بە نرخاندنەکانەوەو بە رەوشتەوە، دەربارەی بەرپرسیاریتی لیکۆلەر سەبارەت بە ئەنجامی لیکۆلینەوەکانی، دەربارەی ئازادی لیکۆلەر، هەموو ئەمانە پرسیاری قورسن کە وەڵامیکی روونیان نەدراوەتەوە.

**پەراویز:**

*(بیرکردنەوەم بۆ وەرگیرانی ئەم کتیبە لەبەر گرنگی بابەتی تیۆری زانستییە بە تایبەت بۆ خویندکارانی زانکۆ، بەشەکانی زانستە مرڤایەتیەکان، لە سوید ئەم کتیبە لە بەشەکانی ئابووری، پەروەردە، دەروونناسیو کۆمەلناسی وەك دەستپیکردن بۆ فیربوونی میتۆدە جۆراوجۆرەکانی خویندنەوەی رووداوو دیاردەکان یان نووسینەوەو لیکۆلینەوە لەسەر ئەو بابەتانە بەکاردەهینریت. نووسەری ئەم کتیبە سویدیەو بۆ خۆی مامۆستایە لە بەشی رۆژنامەوانی، میدیاو کۆمۆنیگاسیۆن لە زانکۆی ستۆکهۆلم. ئەم وەرگیرانە پیشکەش دەکەم بە قوتابیەکانی زانکۆکانی کوردستان و بەو هیوایەی بەشەکانی ئەم کتیبە کە لیردا بلاودەبیتەوە لای خۆیان کۆکەنەوەو سودی لیوەربگرن، بیگومان لە داهاتوودا وەکو کتیبیش چاپیدەکەم).

## ئومبێرتۆ ئیکۆ

# پەراوێزێك لەسەر (ناوی گوڵ)



لە عەرەبییەوە: حەسەن یاسین

## میکانیزمەکانی نووسین لای ئومبێرتۆ ئیکۆ

### پێشەکیی وەرگێڕی عەرەبی:

چەند ساڵێك پێش ئێستا (١٩٨٠)[1] ئیکۆ ڕۆمانەکەی خۆی (ناوی گوڵ)ی دەرکرد. سێ ساڵ دوای ئەوە لە پەراوێزی ئەم ڕۆمانەو وەك درێژەدانێك بە ڕۆمانەکە، نامیلکەیەك بە ناونیشانی "پەراوێزێك لەسەر ناوی گوڵ" (١٩٨٣)[2] دەنووسێ، کە کۆمەڵێك سەرنجی تایبەت بە "ڕێڕەوی دانان و دروستکردن" و "بنیاتنانی گەردوونی ڕۆمان و کەل و پەل بۆ ئامادەکردنی" تیادا باس کردووە. هەروا تیایدا قسەی لەسەر

"میتافیزیای پۆلیسی" و "رۆمانی میژوویی" کردووە و، هەروەها تیایدا لە بارەی "دەرون" و "دەمامك" و "پانکردنەوە" و "مۆدیرنیتە و پۆست مۆدیرنیتە" دواوە. ئەمە ئەو نامیلکەیەیە کە دەیخەینە بەردەستتان.

## ئەدی لە بارەی ئەم دەقەوە؟

لەم پیشەکیەدا لە بارەی ناوەرۆکی کتیبەکە و رستەکانی و ئەو رایانەی تیایدا هاتوون، قسە ناکەین، قسەش لە بارەی رۆمانەکە و رووداوەکانی و کەسیتیەکانی و چنینەکەشیەوە ناکەین. دەقەکە هەیە و ناوبانگی رۆمانەکەش هەموو لایەکی گرتۆتەوەو، مافی خوینەریشە کە خۆی بە تەنها ئەم ناوەرۆکانە ئاشکرا بکات بەبێ ئەوەی لەلایەن کەسەوە ئاراستە بکریێ. ئیمە لەم دەقەدا لە بارەی ئەو شتانە ناکۆلینەوە کە بەبێ هیچ نیوانکاریك دراون، بەلکو ئامانجمان ئەو شتانەیە کە دەقەکە نەیگوتون، یان دەقەکە لە غەفلەتی وشەکان و نیازە راشکاوەکانیەوە دەیلیت.

دەشێ هەموو ئەوانەی ئیکۆ لەم دەقەدا یان لە هی تردا دەیلیت (بۆ نمونە تەماشای کتیبەکەی التأویل بین السیمیائیات و التفکیکیة بکە) تایبەت بێ بە تەنیا ئەزمونی خۆی و ناکرێ بە گشتی بکرێ و بەسەر ئەزمونی دیکەدا پیرەو بکرێ کە لە هەمان سروشت نین و هەمان ئامانجیشیان نیە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەقەکە لە خودی خۆیدا چەند ناردەیەکی گەردوونی (ارسالیات کونیة) لەخۆ گرتووە، کە بۆ هەموو رۆمانەکان گرنگن و بۆ هەموو ئەزموونەکان پەسەندن. ئەوەی لە دەقەکەی ئیکۆدا بنچینەییە نە بۆ خودی ئەم ئەزموونە دەگەریتەوە، نە بۆ کەرەسەی رۆمانەکە و ناوەرۆکەکانی و لیکدانەوە شیاو و مەحالەکانیشی. ئەوەی بنچینەییە دەگەریتەوە بۆ ئەو بۆچوونە داهینەرانەیەی کە دەق دەکات بە لە خەم رەخسانیکی مەعریفی بێ کۆتایی، یان مەعریفە وەردەگۆرێ بۆ چەند بارودۆخیکی مرۆڤایەتیی سەرووی تاکرەوی و تەجاوزی چرکەساتی سەرپیی و لەناوچوو دەکات..

رەنگە هەر ئەوەش ببیتە هۆی لیکدانەوەی ئەوەی کە ئیمە لە دەقەکەی ئیکۆدا ئەو کلیلانە نادۆزینەوە کە بەسوودن بۆ تیگەیشتن لە رۆمانەکەو راڤە کردنی ئەوانەی کە قفڵ دراون، وەکو ناونیشانی کتیبەکە ئەمە دەبەخشیت. هەروەها خویندنەوەیەکی تایبەت یان (لیکدانەوەیەکی راست و تاقانە) بۆ گەرانەوە دوور و نزیکەکانی رۆمانەکە پیشکەش ناکات، چونکە ئەمە مەسەلەیەکی درێوە. لەبەرئەوەی لیکدانەوە ئیشی داهینەر نیە، کە لە هەموو باریکدا مەسەلەیەکە نووسەرە ناشیەکان و تازە دەستەکان

ڕەتی دەکەنەوە، جا چۆن سیمیاییەك پێی قایلە کە پیشەکەی لێکدانەوەو نهێنیەکانیەتی. ڕۆمان، وەکو هەر دەقێکی دیکەی داهێنەرانە، "ئامڕازێکە لێکدانەوە بەرهەم دێنێت، بۆیە ڕۆماننووس لەسەریەتی بمرێت بۆ ئەوەی چارەنووسی دەقەکەی نەشێوێنێت" لەبەرئەوە، ئەم نامیلکەیە ناکرێ مشەخۆریەکی داهێنەرەکە بێت لەسەر جیهانی لێکدانەوەو ئاڕاستەکردنی خوێنەر لە پێناوی بەرهەمهێنانی خودی خوێندنەوەیەك، بەڵکو گێڕانەوەی ڕێڕەوی کارێکی داهێنەرانەیە، کە جگە لە ڕووخسارە بەدیهاتووەکەی، شتێکی دیکەی لێ نازانین.

ئەو لێکی ناداتەوەو ڕاڤەی ناکا و تەفسیری ناکا، بەڵکو بە درێژایی نۆهەت لاپەڕە بە "گێڕانەوەی ڕێڕەوەکە" واتە پێشکەشکردنی ڕامانێکی تایبەت لە بینای ڕۆمانەکە ئیکتیفا دەکا: بیرۆکەی ڕۆمانەکە لە کوێوە هات و چۆن گەشەی سەند و لقی لێ بوەوە و گەردوونێکی مەزنی قووت کردەوە کە پڕ بوو لە بوونەوەر و ڕووداوەکان و حەواڵە کولتورییە جۆراو جۆرەکانی هەندێ جار پڕ لە ڕەمز و هەندێ جاری دیکەش نغرۆ بوو لە خاکەڕای خودی واقیعێکی مێژوویی. ئەو لە ڕێگای ئەو گێڕانەوەیەوە، هەوڵی دەستنیشانکردنی ڕێڕەوەکە دەدات لە گۆشەی پێکهاتن و دروستبوونەوە، لە هەمان کاتیشدا هەموو ئەوانەی پێوەندارن بە وەرگر (متلقی)ەوە دووردەخاتەوە، کە ئەمەش مەسەلەیەکی دیکەیە.

ڕاستە لەوانەیە هەردوو مەسەلەکە تێك بچرژێن، کە ئەمەش بارێکە دەکرێ ببێ و شیاویشە، لەوانەشە ڕەوتی یەکەم، کار لە هی دووەم بکا و ئاڕاستەی بکات، کەچی داڕشتنەوەی یەکجارەکی وەك نەریتێك هەڵدێرەکانی گەڕان بە دوای سەرەتا یان پەیوەندییەك یان دەستنیشانکردنی شوێنی قەوارەیەك لە قەوارەیەکی دیکە، یان شتێك لە شتێکی دیکە دەشارێتەوە، کەواتە ڕۆمان "ڕووداوێکی کۆسمۆلۆجی"یە، ئەوەی بنچینەییە تیایدا وشەکان نین، بەڵکو چۆنیەتی بنیاتنانی جیهانەکە و ئامادەکردنی کەل و پەلەکانیەتی. "ئەوەی گرنگە دامەزراندنی جیهانێکە، هەرچی ووشەکانن، ئەوە پاشان دێن".

لە ڕێگەی ئەم ڕەوتەوە، خوێنەر زۆر ڕاستی ئاشکرا دەکا. ئەوە ئاشکرا دەکا کە "گێڕانەوە بیرکردنەوەیە بە پەنجەکان" ئەوەی پەنجەکان نەخشەی بۆ دەکێشا باس لە چەند بارودۆخێکی هەڵگری هەڵچوون لە هەموو ڕەنگێك دەکات. دەرکیش بەوە دەکات کە "هونەر بریتییە لە دەرباز بوون لە هەڵچوونە شەخسیەکان"، چونکە نابێ ڕۆمانێك

ئەوەی ئەم دەقە جەختی لەسەر دەکا و دەقەکانی دیکەی ئیکۆش جەختی لەسەر دەکەن(٣) ئەوەیە کە ڕۆمان مەعریفەیە

بنووسین کە (اقتحام)ی مێژوو بکات بە پشت بەستن بە رق ئەستوورییە گچکە و هەڵچوونە دروستکراوەکان. چونکە ووزەی هەڵچوونیی (الطاقة الانفعالية) ناکرێ ببێ بە داهێنانێکی مرۆڤایەتیانەی بەرز تا لە شەخسی و ڕووکەش و دروستکراو دەربازی نەبێ.

ئەوەی ئەم دەقە جەختی لەسەر دەکا و دەقەکانی دیکەی ئیکۆش جەختی لەسەر دەکەن[٣] ئەوەیە کە ڕۆمان مەعریفەیە، بەڵام مەعریفەیەکە بەشێوەیەکی هیچ و پوچ لەسەر زمانی کەسەکان دانانرێ، لە ڕێگەی گفتوگۆکانیشەوە یان بەدواداچوونەکانی قسەخوان یان دەنگێکی دیکەوە ئاڵووێری پێ ناکرێ. ڕۆمان دیدێکە تایبەتە بە چنینی پێوەندیە مرۆڤایەتیەکان و شتەکان و تایبەتە بە دارشتنی بارودۆخەکان و جۆری وێناکردنیان. بە دەستەواژەیەکی دیکە، ڕۆمان بەرجەستەکردنێکی فەزایی و زەمانیی مانایە. مانا بە ڕووتی ناخرێتە سەر لێوی بوونەوەرەکان، بەڵام لە ڕێگەی ئەوەی کە کەل و پەل بۆ گەردوون ئامادە دەکا، لەدایك دەبێت. بۆیە مەعریفە لەسەر شێوەی چەند قاڵبێك و چەند ناوێك و چەند گەڕانەوەیەك بۆ سەر کتێب و تیۆرەکانەوە ناچێتە نێو جیهانی ڕۆمانەوە، بەڵکو لە ڕێگەی سەرنج دەربڕین لەسەر ڕووداو و وێنەگرتنی شت و ڕێگایەك بۆ تێڕوانین و وەسفکردنی و ئاڵووێرکردنی پێدزە دەکات. مەعریفە ئەو کەرەستەیەیە کە لە ڕێگەوە خەیاڵ دادەڕێژرێت و ڕاستەڕێ دەکرێت، هەروەها لە ڕێگەی ئەوەوە پێوەندییە مرۆڤایەتییەکان دیاری دەکرێن و بەرجەستە دەبن.

ئیکۆ کە ڕەوتەکەی دەگێڕێتەوە لە لای لێکدانەوە یان تەفسیری ڕووداوێك ناوەستێ، بەڵام ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لە پشت ڕووداوەکەیەو لە دەوروبەریەتی و پاساوی بۆ دەهێنێتەوەو مانایەکی پێ دەبەخشێت: پاڵنەرەکانی هەڵبژاردنی ئەم ماوە مێژووییە جیا لە ماوەی دیکە، پاڵنەرەکانی هەڵبژاردنی لێکۆڵەرەکە، حەواڵەکانی بۆ خوێندنەوەی (الامارات: هێماکان)، ململانێی نێوان باڵەکانی کڵێسە، ملهوڕیی پشکنینی کڵێسەیی.. هتد، ئەو لە هەموو ئەمانەشدا سروشتی ئەوە نادات کە دەیەوێ مەعریفەیەکی "زانایانە" بۆ دەقەکەی مسۆگەر بکات، بەڵام ئەو، مەعریفە لە نێو ڕووداو و شت و کەسایەتیدا پەخش دەکات.

لە نێوان ئەو مەعریفەیەی لە گوتارێکی زانستی و لە نێوان ئەو مەعریفەیەی کە لە ڕێگەی نووسینی داهێنەرانەوە پێمان دەگات، کەلێنێکی گەورە هەیە. چونکە "مەعریفە لە گوتاری زانستیدا لەفزکراوە، کەچی لە نووسیندا لەفز دەکرێ" (بارت).

حالەتی یەکەم و دووەمیش ئاسمان و ریسمانیان جیایە. چونکە لەفزکراو بەرهەم هینراوە، قەوارەیەکی ووشکەلاٌنی بێ گیانە، هەرچی لەفزکردنە، ئەوە ریگایەك و بۆچوونیکە لە بەرهەمهینان، لەفزکردن هەلچوونیکی مرۆڤانەیە، یان دەست پیوەگرتنی حالەتەکانی خود و دلخۆشبوونی بە خودی خۆی و دەوروبەرەکەیەتی، بۆیە نووسین مەعریفە وەردەگۆرێ بۆ ئاهەنگیکی هەمیشەیی" (بارت)، و رووکەش و لەناوچوو دەکات بە چرکەیەکی نەمر لە میژووی مرۆڤایەتی.

خوینەر لە ریگەی ئەم دەقەوە، دەرك بەوە دەکات کە داهینانی رۆماننووسی کۆشش و دەولەمەندکردنەو، هەلویستەکانیش ویناکردنی سروشتەکان و دەربرینیکی قوولی حالەتە مرۆڤایەتیەکانن. دەرك بەوە دەکات کە شۆرش ئاشکراکردنی راستیەکانی ژیانە کە خۆیان لە پشت شتە بچووکەکانی رۆژانەو مەئلوفەوە حەشار دەدەن.

رۆماننووسی راستەقینە نە (ئاژاوە دەگیرێ) و نە (لاساری دەکا) و (دەقی فیلبازانە)ش نانووسێ، بەلاٌم ئەو رۆمانانەمان پیشکەش دەکات کە میژوو بۆ ماوەیەکی دریژ باسیان دەکات.

د. سەعید بەنەکراد

کۆلیژی ئەدەبیات و زانستە مرۆڤایەتیەکان مەکناس

بەریوەبەری گۆڤاری (علامات)

## پەراویزیک لەسەر ناوی گوڵ

**١) ناونیشان و مانا:-**

دوای ئەوەی ناوی گولم نووسی، نامەیەکی زۆر گەیشتن کە تیکرایان ئەو پرسیارانەیان لە خۆ گرتبوو کە لە بارەی دەلالەتی ئەو بەیتە شیعرە(١) بوون کە بە زمانی لاتینی نووسراوەو رۆمانەکەی پێ دوایی هینراوە، هەروەها لە بارەی چۆنیەتی لییەوە سەرهەلدانی ناونیشانەکەوە بوون؟ هەمیشە وەلاٌمم وا دەدایەوە کە مەسەلەکە پەیوەستە بە بەیتیکی شیعری کە لە کتیبیکی بەرنار دۆمۆرلیکس "لە بارەی شتە لەرزۆکەکانی ژیان"ەوە وەرگیراوە. ئەو "دۆمۆرلیکس"ە رەبەنیکی سەدەی

رۆماننووسی راستەقینە نە (ئاژاوە دەگیرێ) و نە (لاساری دەکا) و (دەقی فیلبازانە)ش نانووسێ، بەلاٌم ئەو رۆمانانەمان پیشکەش دەکات کە میژوو بۆ ماوەیەکی دریژ باسیان دەکات.

دوازدەهەمی زایینیە و چەند بەیتیكی هۆنیەوە كە لە بابەتی "حەسرەت كیشان بۆ ئەوانەی بزر بوون" سەرچاوەی گرتبوو. پاشان "بەلام بەفری رۆژگاری رابردوو بۆ كوێ چوو"ی فیلانم[٢] لەوەوە دروست كرد. بەم كارەشی ئەو بیرۆكەیەی كە دەلێ (ئەگەر هەموو شتەكان بەرەو لەناوچوون بن، ئەوا ئیمە لە نیویاندا چەند ناویكی پوخت تییدا دەپاریزین)ی خستە سەر بابەتە ناسراوەكان (وەك "مەزنەكانی پیشینان"، "شارە دیرینەكان"، "شازادە جوانەكان"، "عەدەم كە هەموو شتیك دەپوكیتەوە").

هەروەها لە بیرمە ئەبیلار ئەو پەندەی بەكارهینا كە لە لەفزی "هیچ گولیك لە ئارادا نیە" *nulla rosa* دا هاتووە بۆ ئەوەی دەری بخات كە تا چ رادەیەك زمانێك دەتوانێ بە هیزەوە لە بارەی شتە پوكاوەكانەوەو لە بارەی ئەو شتانەوە كە هەن، قسە بكات، بۆیە من ئازادی بە خوینەر دەدەم لە پوختەكانی، چونكە قسەخوان، بەرای من، ناچار نیە لیكدانەوە بۆ كارەكەی بكات، ئەگەر نا، نووسینی رۆمان پیویستی نەدەكرد، چونكە رۆمانەكان، لە بناغەدا چەند ئامرازیكی بەرهەمهینەری لیكدانەوەكانن.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەو وشە هەنگوینیانە دەمانبەنە سەر پەرژینیك كە ناتوانریت بەسەریدا بازبدرێ: دەبێ رۆمان ناونیشانیكی هەبێ.

بەهەرحاڵ ناونیشان، یەكیكە لە كلیلەكانی لیكدانەوە، كە ئیمە داخیشی بۆ هەلدەكیشین. چونكە ئیمە ناتوانین دەربازبین لەو ئیحایانەی كە چەند ناونیشانیك ئاماژەی بۆ دەكەن، وەك "جەنگ و ئاشتی"، "سوور و رەش". وروژینەرترین ناونیشان بۆ ریزگرتن لە خوینەر ئەوەیە كە چر دەكریتەوە لە ناویكدا كە دەلالەت لە پالەوان دەكات: "داڤیدكۆپەرڤیلد" یان "رۆبنسۆن كرۆزۆ". تەنانەت لەم بارەشدا ئەوا ناو/ ناونیشان دەشێ وا لیك بدریتەوە كە دەست تیوەردانیكی زیادەرەوانەیە لەلایەن دانەرەوە. بۆ نمونە ناونیشانی "باوەگۆریۆ" پێ دادەگرێ لەسەر وینەی باوە پیرەكە، لە كاتیكدا رۆمانەكەش داستانی راستینیاك یان فوتران ئەلیاس كلۆلینە. رەنگە لەسەریشمان بیت كە چاوچنۆك بین بە شیوەیەكی پاك، هەروەك دۆماس لە "*las Toris Mougutaires*" وای كرد، كە لە واقیعدا بەسەرهاتی چواركەسە. بەلام مەسەلەكە لیرەدا جگە لە خۆشگوزەرانیەكی دەگمەن، كە بە شیوەیەكی نائاسایی نەبیت دانەر ئەنجامی نادات، شتیكی تر نیە.

راستیەكەی رۆمانەكەی من ناونیشانیكی دیكەی هەبوو: دیری تاوان. ئەو ناونیشانەم وەلانا، چونكە پیی لەسەر قولاییەكی پۆلیسی دادەگرت. لە تواناشدا

راستیەکەی رۆمانەکەی من ناونیشانێکی دیکەی هەبوو: دێری تاوان. ئەو ناونیشانەم وەلانا، چونکە پێی لەسەر قوڵاییەکی پۆلیسی دادەگرت.

هیچ شتێك دڵی دانەری ڕۆمانێك ناداتەوە جگە لە پەیڕەوی بەو خوێندنەوانەی كە خوێنەران پێشنیازی دەكەن و ئەو بە خەیالیدا نەهاتوون.

هەبوو ئەم ناونیشانە خولیاداران و دۆستانی چیرۆكی پۆلیسی وا لیبكات كە بە پەرۆش بن بۆ ڕۆمانێك كە بەبێ گومان نائومیدیان دەكات.

هەروەها خەونم بەوەوە دەبینی كە ناونیشانیكی دیكە: ئەدزۆ دو میلك، بە كتیبەكەم ببەخشم، كە ناونیشانیكی بێ لایەنە. لەبەرئەوەی ئەدزۆ لە دواجاردا دەنگی قسەخوانە. بەڵام بڵاوكەرەوەكان لە ئیتالیا ناوی ناودارانیان پێ خۆش نیە. بۆ نموونە خودی (*Ferm e lucia*) گۆڕانی تیدا كرا. لەم بوارەشدا ژمارەیەكی كەمی نموونە لەبەردەستدان: (*lemmo Boreo, Rube on Metello*) هەمان شتیش دەگوترێ لە بارەی كۆمەلیك ناونیشان لە ئەدەبیاتی دیكەدا وەك (*Cousine Bette*) و (*Barry lyndon*) و (*Armance*) و (*Tom Jones*).

تەنیا ڕیكەوت بوو وای لیكردم لەسەر بیرۆكەی ناوی گوڵ بگیرسیمەوە. ئەو ناونیشانەم بەدڵ بوو. چونكە گوڵ وینەیەكی ڕەمزیی پر لە دەلالەتە تا ئەو پلەیەی كە خەریكە لە كۆتاییدا هەموو دەلالەتەكان لەدەست بدات: "گولی سۆفیگەری، جەنگی دووگولەكە، گوڵ گولە گولە گولە، گولی خاچ، بۆ ئەم گولانە سوپاست دەكەم، ژیانی گولگولی". ئەو كاتەش خوینەر ناتوانێ لیكدانەوەیەك هەلبژیریت، تەنانەت ئەو كاتەش كە دەتوانیت دەست بە خویندنەوەیەكەوە بگریت لە ڕیگەی دوا بەیتەكەوە، ئەوا خوینەر چەندین هەلبژاردەی لە ژمارە نەهاتووی دەستنیشان كردووە. ناونیشان پیویستە پشیوی لە بیروباوەڕەكاندا دروست بكات، نەك لە قالبیان بدات.

هیچ شتیك دڵی دانەری ڕۆمانیك ناداتەوە جگە لە پەیڕەوی بەو خویندنەوانەی كە خوینەران پیشنیازی دەكەن و ئەو بە خەیالیدا نەهاتوون. كاتیك كە چەند كاریكی تیۆری دەنووسم، ئەوا هەلویستم بەرامبەر بە ڕەخنەگرەكان مۆركیكی دادوەریی وەردەگریت: ئایا ئەو ڕەخنەگرانە تیگەیشتوون لەوەی كە دەمویست بلیم؟ بەڵام مەسەلەكە لە حالەتی ڕۆماندا لە ڕەگ و ڕیشەوە جیایە. لەمەشدا مەبەستم ئەوەنیە كە دانەر ناتوانیت خویندنەوەیەك بدۆزیتەوە كە بەلای ئەوەوە عەبەسییە، بەڵام لە هەموو باریكدا لەسەریەتی بیدەنگ بیت. چونكە ئەوانی دیكە هەر خۆیان مافی بەرهەلستیكردنی ئەمەیان هەیە. بیانووشیان لەمەدا دەقە، بەڵام بەدەر لەمە زۆربەی خوینەران ئەو مانایانە دەردەخەن كە بیری لینەكراوەتەوە. بەڵام دەستەواژەی: بیری لێ نەكردۆتەوە، چ مانایەك دەگەیەنیت؟

خاتوونیکی ئەکادیمیستی فەرەنسی کە ناوی (میرای کال گروبەر *M.calle Grber*)ە گوتی ئەو رەگەزدۆزییەکی دۆزیوەتەوە کە ووشەی *simples* (بەمانای سادەکان) و *Simple* کە حەوالەی گیا پزیشکیەکانی دەکات، بەیەکەوە دەبەستیتەوە، هەتا ئەوەی بۆ دەربکەویت کە من لەسەر "رووەکی خراپ: *mole plante*"، کە لە (هەرتەقە)دا ناسراوە، قسە دەکەم. وەڵامەکەش ئاسانە: لەفزی (*Simples*) لە ئەدەبی ئەو قۆناغەدا بە هەردوو ماناکەی پیشوو بوونی هەیە، هەمان شتیش لەگەڵ (*mole plante*). لە لایەکی دیکەشەوە ئاگام لەو نموونەیە هەبوو کە کریسماس پیشکەشی دەکرد بۆ دەلالەت لەسەر مونازەرەی دوو لایەنە کە زادەی هەردوو پیناسەکەی گیابەندیکە بەو پییەی (*amides simples*)ە. ئایا لەم بەکارهینانی رەگەزدۆزییەدا بەئاگا بووم یان نا؟ زانینی وەڵامەکە سوودی نیە، دەقەکە هەیە و هەر ئەویش کاریگەری مەعنەویی خۆی بەرهەم دەهینیت.

کاتیك کە رەخنەکانی تایبەت بە رۆمانەکەم دەخوینمەوە، لە خۆشیا لەرز دەمگریّ کە رەخنەیەك (رەخنەی یەکەم هەریەك لە جونیفرا بۆمبایانی" و "لارس گیستافسۆن" ئەنجامیانداوە) دەدۆزمەوە ئاماژە دەکات بۆ وەڵامی "گیوم" پاش کۆتایی دادگاییەکە. ئەدزۆ (ل ٣٩١ لە وەرگیرانە فەرەنسییەکەدا) لیی پرسیوە (ئەو شتە چیە کە زیاتر لە پاکیزەیی لیی دەترسی؟) گیوم وەڵام دەداتەوە (پەلەپەل). ئەم وەڵامەم خۆشویست و ئیستاش خۆشم دەویت. کەچی خوینەریکی دیکە سەرنجی ئەوەی داوە کە "برنارگی" لە هەمان لاپەرەدا کە هەرەشەی ئەشکەنجەدان لە کارگیری دیرەکە دەکات دەلیت: "دادوەری گویّ بە پەلەپەل نادات، هەروەك "ئەو (حواری) هاوەلە ساختەیە بانگەشەی ئەمە دەکات. دادوەریی خواش کاتی بەبەرەوە ماوە". وەرگیرانە فەرەنسییەکە دوو وشەی جیاواز بەکاردینیت، بەڵام وەرگیرانە ئیتالیەکە دوو جار ووشەی "*Fretta*" بەکاردینیت. خوینەریك، کە لەسەر حەقیش بوو، لە بارەی پیوەندیی لە نیوان "پەلەپەل" کە "گیوم" لیی دەترسا و لە نیوان پەلەپەل هەروەك لە قسەکەی بیرناردا هاتووە، لیی پرسیم ئەو ساتە وەختە دەرکم بەوە کرد کە شتیکی خەمگین روویداوە.

راستیەکەی ئەو گفتوگۆیەی لە نیوان "گیوم" و "ئەدزۆدا" روویداوە لە دەستنووسەکەدا نییە، پاشان خستمە سەری، بۆ ئەوەی جۆریك لە هاوسەنگی لە بینای رۆمانەکەدا دروست بکەم. پیویستم بەوە هەبوو پیش ئەوەی سەرلەنویّ قسە کردن بدەمەوە بە "بیرنار" پەرەگرافیك زیاد بکەم. بەهەرحاڵ کە وام لە گیوم کرد رقی لە پەلەپەل ببیتەوە (بە بروایەکی زۆرەوە کە هەر ئەوەش وای لیکردم ئەو وەڵامەم

دانەر لەسەریەتی پاش نووسینی رۆمانیك بمریت بۆ ئەوەی چارەنووسی دەقەکە نەشیوینیت.

خۆش بوویت) بە تەواوی ئەوەم لەبیر کردبوو کە "بیرنار" پیشتر لە بارەی "پەلەپەل"ەوە قسەی کردووە.

ئەگەر جاریکی دیکە وەڵامەکەی "بیرنار"مان[٣] خویندەوە بەبێ بایەخ دان بە وەڵامەکەی "گیوم"، ئەوا مەسەلەکە وا دەرناکەویت کە ریگایەك بیت بۆ قسە کردن وەك ئەوەی کە قازییەك بەکاری دینیت، واتا دەستەواژەیەك لە جۆری "هەموومان لەبەردەم یاسادا یەکسانین". بەداخەوە، بوونی ووشەی "پەلەپەل" کە "گیوم" قسەی لەسەر دەکات لە هەمان ئەو چوار چیوەیەی کە تیایدا هاتووە، لەلای "بیرنار" کاریگەرییەکی مەعنەوی دروست کردووە. مافی خوینەرە کە بپرسیت ئایا هەردوو پیاوەکە لەسەر هەمان شت قسە دەکەن؟ ئایا فەزاعەتی ئەو پەلە پەلیەی کە "گیوم" باسی لیوە دەکات زۆر جیاواز نییە لە فەزاعەتی پەلەپەل لەلای "بیرنار"؟ مەسەلەکە بەسەرچوو. دەقەکە کاریگەری مەعنەویی تایبەتی خۆی بەرهەم هینا. جا بتەوێ، یان نا، ئەوا من لە هەردوو بارەکەدا لەبەردەم پرسیاریکدام، بەلکو لەبەردەم ئیستفزازیکی نادیاردام. من هەست بە ئیحراجیەك دەکەم لە لیکدانەوەی ئەوەی روویدا، تەنانەت ئەگەر بڕواشم هەبیت بە بوونی دەلالەتیکی شاراوە "رەنگە چەندین دەلالەتیش" لەو مەسەلەیەدا.

دانەر لەسەریەتی پاش نووسینی رۆمانیك بمریت بۆ ئەوەی چارەنووسی دەقەکە نەشیوینیت[٤].

### ٢) هەقایەتی ریرەوەکە:

بیگومان دانەر مافی لیکدانەوەی نیە. بەڵام مافی ئەوەی هەیە کە بیگیریتەوە بۆچی و چۆن ئەوەی نووسیوە کە نوسیویەتی. ئەو لیکۆڵینەوانەی شیعرییەت پیشکەشی دەکات هەمیشە بۆ ئەوە ناشین کە ئامرازیك بن بۆ تیگەیشتن لەو کارانەی کە بناغەی بوونەکەی بوون، بەڵام یارمەتی تیگەیشتن لە چۆنیەتی چارەسەری گرفتیکی تەکنیکیی وەك مەسەلەی بەرهەمهینانی کاریکی ئەدەبیی دەدەن.

ئەدگار ئالان پۆ لە "پیکهاتنی قەسیدەیەك" (*genes dun poeme*)دا دەیگیریتەوە کە چۆن قەسیدەی "قەلە رەش" (*Le corbeau*)ی نووسیوە، بەڵام بۆمان ناگیریتەوە ئەو گرفتانە چین کە بەرەو رووی خۆی کردنەوە لە پیناوی ساغکردنەوەی ئەم وینە شیعرییە. وینەی شیعریش لەلای من بریتیە لەو توانایەی کە دەق ئاشکرای دەکات

بۆ بەرهەمهینانی خویندنەوەی هەمیشە نۆژەن. بریتین لەو خویندنەوانەی کە هەرگیز ناکرێ تواناکانیان چك بکەین.

نووسەر "یان وینەکیش یان پەیکەرتاش یان ئاوازدانەر" هەمیشە دەزانێ چی دەکا و ئەمەش چەند لەسەری دەوەستێ. ئەو دەزانێ لەسەریەتی چارەسەرگەلیك بدۆزیتەوە بۆ کیشەیەك کە رەنگە دراوە سەرەتاییەکان تیایدا نارۆشن و غەریزی و "تیك ئالۆزکاو" بن. مەسەلەکە لە سەرەتادا جگە لە ئارەزوو یان یادەوەری پەیوەست نیە بە شتیکی دیکەوە. بەڵام دوای ئەوە گرفتەکان دینە سەر رووپەر، لە ریگەی پرسیارکردن لەو مادەیەی کە ئیشی تیا دەکەی. مادەیەکە یاسا سروشتیەکانی تایبەت بە خۆی ناشاریتەوە. بەڵام، لە هەمان کاتدا، بە یادەوەریی کەلتور کە "زایەلەی هاودەق"ی لیوە دەردەچیت بەرەو رووومان دیت.

دانەر درۆ دەکا کاتێ پیمان دەلێ لە ژێر کاریگەریی ئیلهامیك ئیش دەکات، چونکە ئیلهامەکە جگە لە ٢٠٪ پیکناهینیت، لە کاتیکدا کۆششەکە ٨٠٪ پیکدەهینیت[٥].

لامارتین لە بارەی ناودارترین قەسیدەیەوە گوتویەتی "ناونیشانی قەسیدەکەم لەبیرچوو". ئەو بەیەکجار لە شەویکی تۆف و لە نیو دارستانیکدا نوسیویەتی. کە مرد دەستنوسیك دۆزرایەوە کە راستکردنەوەو گۆرانکارییەکانی تیا بوو. رەنگە ئەم قەسیدەیە لە هەموو قەسیدەکانی دی وەستایانەتر بێ لە ئەدەبی فەرەنسیدا.

کاتێ کە نووسەر "هونەرمەند بە شیوەیەکی گشتی" دەلێ بەبێ بیرکردنەوە لە ریساکانی گۆران ئیشی دەکرد، ئەوا تەنیا دەیەوێ بلێ ئیشی دەکرد بێئەوەی ئاگای لەوە بیت کە ریسا دەزانیت. منداڵ زمانی زگماکیی خۆی بەرەوانی دەزانێ، لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێ باسی ریزمانمان بۆ بکات. ریزمانزان هەر ئەوە نیە کە ریساکانی زمان دەزانێ، چونکە منداڵیش دەیزانێ، بێ ئەوەی ئاگای لەو ریسایانە بیت. ریزمانزان ئەوەیە کە دەزانێ بۆچی و چۆن منداڵ زمانەکەی خۆی دەزانێ.

قسەکردن لەسەر نووسین مانای ئەوە نیە بسەلمینی ئەوەی نووسراوە شتیکی باشە. چونکە ئەدگار ئالان پۆ دەیگوت (کاریگەریی کاری ئەدەبی شتیکەو زانینی ریرەوەکەش شتیکی تر).چونکە کاتێ پۆڵ کلی یان کاندینسکی لە بارەی ریگای دارشتنەکانیانەوە قسەمان بۆ دەکەن، ئەوە نالین یەکیکیان لەوی دیکە باشترە. کاتیکیش "میکائیل ئۆنج" پیمان دەلێ پەیکەرتاشین کیشانی ئەو وینەیەیە کە بەو شیوەیەی پیشوو لەسەر پارچە شاخیك هەیە، ئەوە نایەوێ پیمان بلێ کە (*La pieta du vatican*) جوانترە لە (*La pieta Rondanini*)[٦].

دانەر درۆ دەکا کاتێ پیمان دەلێ لە ژێر کاریگەریی ئیلهامیك ئیش دەکات، چونکە ئیلهامەکە جگە لە ٢٠٪ پیکناهینیت، لە کاتیکدا کۆششەکە ٨٠٪ پیکدەهینیت.

بۆیە روودەدا کە چەند دانەریکی نەناسراو، کە کارەکانیان کاریگەرییان نیە چەند لاپەرەیەك بە جوانترین شـیوە دەنووسـن لـە بـارەی گۆرانـی تـەکنیکی. ئـەوان تەنـها بیرکردنـەوە لـە ریـرەوی خۆیـان بـاش دەزانـن: فاسـاری، هوراسـیوغرینوف، هـارون کوبلاند.

### ٣) سەدەکانی ناوەراست، بە هەموو دلنیاییەکەوە:

رۆمانیکم نووسی چونکە حەزم لە نووسینی بوو. لەو برواییەشدام ئەم هۆیە بەسـە بۆئەوەی بچینـە نیـو گیرانەوەی رووداوەکان. مـرۆڤ بـە سروشـتی خـۆی مـەیلی لـە هۆنینەوەی بەسەرهاتەکان هەیە. لە سالی ١٩٧٨دا لە بیرۆکەیەکی سادەوە دەستم بە نووسین کرد، ئارەزووم لە ژەهر خواردکردنی رەبەنیك بوو.

لەو برواییەدام دەکریّ رۆمانیك لـەم بیرۆکەیـەوە لـەدایك بیت، باقیەکەشـی خـویّ و ترشە و لـە کـاتی نووسـیندا دەیخەنـە سـەری. رەنگـە ئـەم بیرۆکەیـە لەمـە کۆنـتر بیـت. دەفتـەریکم دۆزییـەوە کـە میـژووی ١٩٧٥ی پیـوە بـوو تیـایدا لیسـتی ئـەو رەبەنانـەم کردبوو کە لـە دیریکی بەرفراواندا دەژیـن و هیچـی تـر. لـە سـەرەتادا کەوتمـە سـەر خویندنەوەی (*le traite des poisons*)ی ئۆرفیلا، کە کتیبەکە لە نیـو کتیبـەکانم و بیست سالّ دەبیّ لـە پـاریس، رەنگـە وەك وەفایـەك بـۆ ویسـمانس (*Las-bas Hhsmans*)[٧]، کریومە.

لەبەرئـەوەی هیـچ ژەهریـك لـەم ژەهرانـە بـەس نـەبوو، بۆیـە داوام لـە دۆسـتیکی زیندەوەرزان کرد کە شلەیەکم نیشان بدا کە هـەمان ئـەو خەسـلەتانەی هـەبیت (کـە لـە ریگەی پیستەوە وەردەگیریت). ئەو نامەیـەم دراند کە لـەو دۆستەوە پیمگەیشتبوو و دەلیّ ژەهریکی لەو جۆرە پینازانیّ. مەسەلەکەش لیرەدا پەیوەسـتە بـەو بەلگەنامانـەی کە رەنگە لە چوارچیوەیەکی دیکەدا، خاوەنەکەی پەلکیشی حەپسخانە بکەن.

لەسەرەتادا وای بۆچووبووم کە رەبەنـەکان دەبیّ لـە چـەند دیریکی هاوچاخدا بن (من بیرم لە رەبەنیك دەکردەوە کە مانیفیستۆ دەخوینیتەوە)، لەبەرئەوەی دیرەکان پرن لە یادەوەرییەکانی سەدەکانی ناوەراست، دەستم کرد بە هەلدانەوەی ئەرشیفی خۆم کـە تایبەتـە بـە سـەدەکانی ناوەراسـت "کتیبیـك لـە بـارەی ئیسـتاتیکای سـەدەکانی ناوەراست لە سالی ١٩٥٦دا، سەد پەرەی تر لە بارەی هەمان بابەتـەوە سالی ١٩٥٩، هـەندیّ هـەولی تـر، گەرانەوەیـەکی سـەرلەنویّ بۆ کەلەپوری سـەدەکانی ناوەراسـت لـە

لەو برواییەدام دەکریّ رۆمانیك لەم بیرۆکەیەوە لەدایك بیت

سالی ١٩٦٢دا لـه کاتی کارکردنم لـه باره‌ی جویس. پاشان لـیره‌دا لیکۆلینه‌وه‌یـه‌کی دریژیش هه‌بوو له باره‌ی هه‌ستانه‌وه (القیامة) و چه‌ند پارچه‌یه‌ك له به‌دواداچوونه‌کانی بوتیـس دولییبیانـا. به‌هـه‌رحال، سـه‌ده‌کانی ناوه‌راسـت بـه‌رده‌وام لـه زه‌ینمـدا بـووه "که‌ره‌سته‌یه‌کی بی ژمارم ده‌سکه‌وت" میکرۆفیلـم، چه‌ند دانه‌یـه‌کی وینـه‌دار، چـه‌ندین ده‌فتـه‌ر "کـه لـه سالی (١٩٥٢)ه‌وه لـه‌لام که‌له‌کـه ببـوون، لـه پینـاوی چـه‌ند ئامـانجیکی نادیـاردا: لـه پینـاوی نووسـینه‌وه‌ی میـژووی درنده‌کـان، یـان لـه پینـاوی لیکۆلینـه‌وه‌ی ئینسکلۆپیدیاکانی سه‌ده‌کانی ناوه‌راستدا، یان تیۆریك بۆ پیرسته‌کان.

له ساته وه‌ختیکدا به زه‌ینمدا هات که: له‌به‌رئه‌وه‌ی سه‌ده‌کانی ناوه‌راست خـه‌یالی رۆژانه‌مه، جا بۆچی رۆمانیك نه‌نووسم که رووداوه‌کانی لـه سـه‌ده‌کانی ناوه‌راسـت بن. هـه‌روه‌ك لـه چـه‌ندین چاوپیکـه‌وتندا گووتومـه، مـن لـه ریگـه‌ی شاشـه‌ی ته‌له‌فزیۆنـه‌وه نه‌بیت ئیستا (الحاضر) ناناسم. به‌لام سه‌ده‌کانی ناوه‌راست ئـه‌وا خـۆم بـه‌بی نیوانکـار ده‌یناسم.

که ئیمه له چۆلاییه‌کدا ئاگرمان ده‌کرده‌وه، ژنه‌که‌م تۆمه‌تباری کردم، کـه مـن نـازانم رابمینـم لـه پرۆشـکه‌کانی، کـه لـه نیـو داره‌کـاندا بـه ئاراسـته‌ی ته‌لـه‌کانی کاره‌بـا به‌رزده‌بوونه‌وه. هه‌ر که رشته‌ی تایبه‌ت به ئاگر که‌وتنه‌وه‌که‌م خویندـه‌وه، ژنه‌که‌م پیـی گوتم: "که‌واته تۆ ته‌ماشای نیازکه‌کانت ده‌کرد. "وه‌لامم دایـه‌وه": نـه‌خیر، بـه‌لام چۆن ده‌شی ره‌به‌نیك له سه‌ده‌کانی ناوه‌راستدا لیی رابمینیت".

ده سال پیش ئیستا، من نامه‌یه‌کم له دانه‌ره‌وه بۆ بلاوکه‌ره‌وه ناردووه کـه تایبـه‌ته به توانجیکی من له باره‌ی ئه‌و توانجه‌ی تایبه‌ت بوو به هه‌ستانه‌وه‌ی بۆتیس دولییبانا، دانم پیانابوو وتبوم: باره‌که هه‌رچۆنیك بیت، بۆ تویژینه‌وه‌ی زانستی هاتووم و چه‌ند دارستانیکی ره‌مزیـی پـر لـه ئـاژه‌لی خورافیـم بریـوه، بـه بـه‌راوورد لـه نیـوان بناغـه ستونی و چوارگۆشه‌ییه‌کانی کاتدرائیـه‌کان و لـه نیـوان سـیبه‌ریك لـه غـه‌ل و غه‌شـی لیکدانه‌وه‌یی که ترنجینراوه‌ته دارشتنه تراگۆنیه‌کانی هه‌لبژارده‌کان، به مه‌ستیه‌وه لـه شه‌قامی خواره‌وه بۆ هۆبه‌ی کلیسه‌ی سیستیری هـاتم، گفتوگۆم ده‌کرد له‌گـه‌ل کاهینـه کلۆنیزییه‌کان[٨]، زانابن یان ده‌وله‌مه‌ند. چاودیریی تۆماس ئه‌کوینیش به قورسـی و ئه‌قلانییه‌تی خۆی لیم جیانه‌ده‌بووه‌وه. هۆنۆریۆس دۆتۆن خه‌له‌تاندمی به جوگرافیاکه‌ی خۆی که هیشتا تیایدا له یه‌ك کاتدا ئه‌وه راڤه نه‌کرابوو که بۆچی منـدال لـه مندالییـدا بایه‌خ به جووتبوون نادا، هه‌روه‌ها چۆن ده‌گه‌ینه "دوورگه بزره‌که" و چۆن بـازیلك[٩]

له ساته وه‌ختیکدا به زه‌ینمدا هات که: له‌به‌رئه‌وه‌ی سه‌ده‌کانی ناوه‌راست خه‌یالی رۆژانه‌مه، جا بۆچی رۆمانیك نه‌نووسم که رووداوه‌کانی له سه‌ده‌کانی ناوه‌راست بن.

دیل دەکەین کە تەنیا ئاوینەیەکی بچوکی گیرفانی هەیەو بروایەکی نەلەقیوی بە پالەوانی زۆرانبازیی شیر هەیە.

(ئەم مەیلە بەهیزە و ئەم تاسەیە بۆ سەدەکانی ناوەراست، هەرگیز لیم جیانەبوەوە. ئەگەرچی من، لەبەر چەند هۆیەکی ئاکاری و مادی، ریگایەکی دیکەم گرتەبەر (ئەگەر هی سەدەکانی ناوەراست بیت مانای وایە دەبیّ دەولەمەند بیت و دەبیّ توانات هەبیّ سەفەر بکەیت بۆ گەنجینە دوورەکان بۆ لەبەرگرتنەوەی دەستنووسە دەگمەنەکان). سەدەکانی ناوەراست هەر لە زەینمدا بوو، ئەگەرچی وەك پیشەیەکیش نەبووبیت، بەلام هەر بە باشترین ئارەزووم مایەوە. سەدەکانی ناوەراست باشترین خولیامە. چونکە بە ئاشکرا لە هەموو شتیکدا حازرە، دەیبینم لەو شتانەدا کە بایەخیان پیّ دەدەم و لەو شتانەدا کە لە روخساردا وا دەرناکەون کە سەر بە سەدەکانی ناوەراستن، کەچی لە قولایی سەدەکانی ناوەراستیشدان.

حەزم لە پشوویەکی نهینییە لە سایەی قەشە ئۆتان (*Autan*)دا کە ئەمرۆ کاهین پریڤۆ[١٠] چەند کتیبیك لە بارەی شەیتانەوە دەنووسیّ کە بەرگ تیگرتنەکەی بۆنی گۆگردی لیّ دیت و چەند پەلهاویشتنیکی وشکانیش لە مواساك و کونك دا ئەنجام دەدات. پیرەکانی هەستانەوە (القیامة) و شەیتانەکان ئەوانەی گیانە نەفرەت لیکراوەکان دەپەستنە نیو مەنجەلە گەرمەکانەوە، بەرچاویان نابینا کرد. هاوتەریب لەگەلّ ئەمە، سەرلەنویّ کاهینی رۆشنگەر بید (*Bede*) دەخوینمەوە و، بەدوای دلنیایی لەلای ئۆکام[١١]دا دەگەریم، بۆ ئەوەی بتوانم مەتەلەکانی هیما (علامة)ی لایەنە تەم و مژاوییەکان لەلای سوسیر ئیستیعاب بکەم. هەروا بەم شیوەیە. من لە هەموو ئەمانەشدا هەمیشە سۆزم بۆ سانکتی براندنی هەلدەستیّ، بە وردبوونەوە لە بیروباوەرمان هەروەك لە کتیبی کیل (*Kells*)دا دەردەکەویت، هەروەها سەرلەنویّ بۆرخیس لە (*Celtes Kenningars*) و لە پیوەندییەکانی نیوان دەسەلات و جەماوەری بروا هاتوو، کە ملکەچی چاودیرین لە رۆژنامەکانی کاهین سوگیر، دەخوینمەوە.

٤) دەمامك:

راستیەکەی، بریارم نەداوە، هەر قسە لە سەدەکانی ناوەراست بکەم، بریارم داوە قسە لە بارەی سەدەکانی ناوەراستەوە لە زمانی هەوالنیریکەوە لەو ماوەیەدا ژیاوە بکەم. قسەخوانیکی سەرەتایی بووم. تا ئەو چرکە ساتە، وا تەماشای قسەخوانەکانم

دەکرد کە دەکەونە دیوەکەی دیکەی ڕووداوەکانەوە. شەرمم دەکرد گیرانەوە بەکاربینم. ئەو حالەتەی من لە هەمان حالەتی ئەو ڕەخنەگرە شانۆییە دەچوو کە لە پریکدا خۆی دەبینیتەوە لە ژیر ڕۆشنایی تەختەی شانۆ لەبەرچاوی هەموو ئەوانەی، کە تا ئەم نزیکانە، لە دەرەوەی تەختەکەدا لەگەلی هاوبەش بوون.

ئایا دەشێ، بۆ نموونە، بگوترێ "سەر لە بەیانیەکی کەم وینەی کۆتایی نۆڤیمبەر بوو" بەبێ ئەوەی لەمەدا لە سنوبی بچم؟ ئەدی ئەگەر وام لە سنوبی کرد کە ئەو دەستەواژەیە بلیت؟ واتە ئەگەر ئەم ڕستەیەی "سەر لە بەیانیەکی کەم وینە بوو "م خستە سەر زاری کەسیك کە ریگەی پێ دراوە ئەمە بلیت، چونکە لەم قۆناغەدا شیاوە ئەمە ڕووبدات؟ بۆیە پیویستم بە دەمامك هەبوو.

کەوتمە سەر خویندنەوەو دووبارە خویندنەوەی هەوالنیرەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، بۆ ئەوەی ریتم و سازگاریی هەواکەم بە دەستەوە بیت. لە جیاتی من قسە دەکەن و، منیش لە هەموو ئەو تۆمەتانە بەریم. من وا دەبم، بەلام لە زایەلەی هاودەق دەرباز نابم. ئاوەها سەرلەنوێ ئەوەم دۆزییەوە کە نووسەرانی پیش من دەیانزانی (چەندین جاریش ئەمەیان پێ گوتین): کتیبەکان هەمیشە لە بارەی چەند کتیبیکی دیکەوە دەدوین، هەر چیرۆکیك چیرۆکیکی دیکە دەگیریتەوە کە پیشتر گیردراوەتەوە. هۆمیرۆسیش ئەمەی دەزانی و ئەرستۆش. بەبێ ئەوەی لە ڕابلیە یان سیرڤانتیس بدوین. بۆیە چیرۆکەکەم نەدەبوو لە شتیکی دیکەوە دەست پێ بکات، جگە لەو دەستنووسەی کە دۆزرابوەوە. هەر لەبەر ئەم هۆیەش، ئەم چیرۆکە (بە تەبیعەتی حالٚ) دەبیتە شایەتنامەو ئیستاش پیشەکیم بۆی نووسی، کە گیرانەوەکەم لە ئاستی چوارەمی ڕاناوەکان، لە نیو ئاستی دیکەدا داناوە: من دەلیم فالی گوتی مابیۆن گوتی ئەدزۆ گوتی ئەو چرکە ساتە لە هەموو ترسیك ڕزگار بووم، بۆ ماوەی سالیکیش لە نووسین وەستام. چونکە شتیکم دۆزیەوە کە پیشتریش دەمزانی "هەموو خەلکیش دەیزانن" بەلام من لە کاتی نووسیندا بە باشی تیبگەیشتم.

ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ڕۆمان لە سەرەتادا هیچ پەیوەندیەکی بە وشەکانەوە نیە. نووسینی ڕۆمانیك مەسەلەیەکە دەگەریتەوە بۆ کۆسمۆلۆجیا، بە تەواوی هەروەك ئەو چیرۆکەش کە (کتیبی دروستبوون) دەیگیریتەوە "وودی ئالان دەلێ: لەسەرمانە چەند نموونەیەك هەلبژیرین".

## ٥) ڕۆمان بەو مانایەی ڕووداویکی کۆسمۆلۆجییە:

لەو بڕوایەدام کە گێڕانەوەی چیرۆکێك وا گریمان دەکا کە جیهانێك بینا بکرێت، گونجاوتریشە کە ئەم جیهانە چڕ بێت، بە پارچە سادەکانیشەوە. خۆ ئەگەر ڕووبارێکت بە دوو کەنارەوە بینا کرد و لە کەناری لای چەپدا ڕاوکەرێکت دانا و سیفەتی تووڕە و تۆسنت بەو ڕاوکەرە بەخشی و، کردیشت بە خاوەنی ڕابردوویەکی خراپ، ئەو کات دەتوانم دەست بە نووسین بکەم، واتە ئەوەی کە مەحاڵە ڕوویدات، بە ووشە دەری ببڕم. ڕاوکەرەکە چی دەکات؟ ڕاو دەکات "ئەوەتا ئێمە لەبەردەم پەرەگرافێك ئاماژە داین کە ناکرێ خۆیانی لێ لابدرێ"، پاش ئەوە چی دیکە ڕوودەدات؟ یان ئەوەتا ماسی دەکەویتە تۆڕەوە، یانیش ناکەویتە تۆڕەکەوە. ئەگەر ماسییەکە کەوتە تۆڕەوە، ئەوا ڕاوکەرەکە ماسیی دەست دەکەویت و بە دڵخۆشییەوە دەگەڕێتەوە ماڵەکەی، بەڵام ئەگەر ماسییەکە نەکەوتە تۆڕەکەوەو، لەبەرئەوەی ڕاوکەرەکە تووڕەو تۆسنە، ئەوا خۆی بۆ ڕاگیر ناکرێ و، ڕەنگە دارەکەی بشکێنێت. بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی گرنگ نیە. سەرەرای ئەوەش دەبێتە سەرەتایەك.

بەهەرحاڵ، پەندێکی هندی هەیە دەڵێ: "لەسەر ڕۆخی دەریا دانیشەو چاوەڕێکە، تەرمی دوژمنەکەت هەر سەرئاو دەکەوێت"، ئەگەر ڕوویداو تەرمێك سەرئاو کەوت، ئەوە چوارچێوەیەکی هاودەق هەیە کە حەوالەی دەکا بۆ ڕووبارەکە، ئەوەشتان بیر نەچێت کە ڕاوکەرەکەم ڕابردووی هەیە. ئایا ئەو سەرەڕۆییە دەکات کە خۆی لە تەنگژەیەکدا ببینێتەوە؟ چی دەکا؟ ئایا هەڵدێت، یان خۆی وا نیشان دەدات کە تەرمەکەی نەدیوە؟ ئایا هەست بەوە دەکات کە جێگەی گومانە، چونکە ئەو تەرمە لە واقیعدا تەرمی ئەو پیاوەیە کە ڕقی لیی بوو؟ لەبەرئەوەی خۆی تووڕە و توندیشە، تۆ بلێی خەفەت بخوات بەوەی کە بکوژی پیاوەکە نییە، چەندی حەز دەکرد تۆڵە لە دوژمنەکەی بکاتەوە؟ هەروەك دەیبینین، پێکەوەنانێکی سادەی ئەم جیهانە بەس بوو بۆ بەرهەمهێنانی چیرۆکێك.

سەرەرای ئەمەش هەندێ سیمای تایبەت بە شێوازی گێڕانەوە هەن، چونکە ئەو ڕاوکەرەی ڕاودەکات جۆرێکی گێڕانەوەیی سست و ڕەوانم بەسەردا دەسەپێنێ. هەروەها ڕیتمێکی تایبەتم بەسەردا دەسەپێنێ کە ئیحای چاوەڕێکردنێکی پڕ لە ئارام دەدات و هەروەها تایبەتیش بەو بازدانانەی کە ئەم ئارام لەبەربرانە دەردەبڕیت.

دەبێ ئەم جیهانە بنیات بنریت، ئیدی دوای ئەوە وشەکان لە خۆیانەوە دین، چونکە بوونی شتەکان لە پیش بوونی وشەکانەوەیەو، تەواو بە پیچەوانەی ئەوەیە کە لە شیعردا وشەکان دەکەونە پیش بوونی شتەکانەوە.

سالی یەکەمی ئیشکردن لە بنیاتنانی ئەم جیهانەم بەرێ کرد: لیستیکی دوورو دریژی کتیب کە دەشێ لە گەنجینەیەکی سەدەکانی ناوەراستدا بدۆزریتەوە. لیستیکی ناو و بروانامەی لەدایکبوونی کۆمەلیك لە کەسایەتیەکان کە دواتر کۆمەلیکی زۆری لێ لا دەبەم (لەبەرئەوەی دەبوایە بزانم ئەو رەبەنانەی کە لە کتیبەکەدا دەرناکەون، کین. پیویستی نەدەکرد کە خوینەر ئەوانە بناسێ، بەلام دەبوو من بیاننناسم).

کێ گوتویەتی قسەخوانی (السردیة) پیویستی بە بروانامەی لەدایکبوون هەیە؟ لەوانەیە پیویستی بە وەزارەتیکی ئاوەدانکردنەوەش هەبێ، ئەمەش تەفسیری ئەو لیکۆلینەوە زۆرانە دەکات کە ئەنجامم دان لە بارەی بیناسازیەوە، لە نیو وینەکان و لە نیو ئینسکلۆپیدیا بیناسازیەکاندا، ئەمەش لە پیناوی دیاریکردنی نەخشەی دیرەکەو هەروەها نیوانەکانیشی. تەنانەت کار گەیشتە سەر دیاریکردنی ژمارەی پایەکانی قادرمە پیچاوپیچەکەی. مارکۆ فیریری گوتویەتی دایەلۆگەکانم سینەماتۆگرافی بوون. چونکە لەلایەنی کاتەوە راست و دروست بوون. مەسەلەکە بە کردەوەش وابوو. کاتیك کە دوو کەسایەتیم دروست دەکرد، کە ماوەی نیوان چیشتخانەو دالانەکەیان، بەدەم قسەکردنەوە، دەبری، کەدەمنووسی نەخشەکەم لەبەرچاوبوو. بەم شیوەیە کە دەگەنە دالانەکە دایەلۆگەکە کۆتایی پێ دێ.

پیویستە خۆمان بە هەندێ کۆت و بەندەوە گرێ بدەین بۆ ئەوەی بە ئازادی داهینان بکەین. کۆت و بەند لە شیعردا بەرهەمی دیر و بەیت و قافیەیە، واتە ئەوەی کە هاوچاخەکان ناویان ناوە چرپاندن لە ریگەی گویچکەوە. بەلام لە گیرانەوەدا، کۆت و بەندەکان لە جیهانیکی پەنهانەوە لەدایك دەبن، کە ئەمەش پیوەندیی نیە بە واقیعیەتەوە "تەنانەت ئەگەر ئەمە ئەوەشیان تا نزیك سنوری واقیعیەت راڤە بکات" دەتوانین جیهانیکی نا واقیعی بەشیوەیەکی گشتی بنیات بنیین کە تیایدا کەرەکان دەفرن و شازادەکان بە ماچیك زیندوو دەبنەوە. ئەم جیهانە کە تەنیا ئەگەرەو ناواقیعیشە، لەسەریەتی بەپیی چەند بناغەیەکی هەر لە سەرەتاوە دیاریکراو، پەیدا ببیت (دەبێ تەئکید لەوە بکرێ ئایا مەسەلەکە پەیوەستە بە جیهانیك کە تیایدا شازادە بە ماچیکی کورەمیریك یان بە ماچیکی جادووگەرانە زیندوو دەبیتەوەو، ئایا

بێگومان مێژووش بەشێکی جیهانەکەمی پێکهێنا، ئەمەش وای لێکردوم رووداوەکانی سەدەکانی ناوەراست بخوێنمەوەو دووبارەش بیانخوێنمەوە.

بە تاقە ماچیکی شازادەیەك بۆقەکان دەبن بە میر، یان ئەمە لەگەڵ "تاتۆ"[١٢]شدا دەکەن).

بیگومان میژووش بەشیکی جیهانەکەمی پیکهینا، ئەمەش وای لیکردوم رووداوەکانی سەدەکانی ناوەراست بخوینمەوەو دووبارەش بیانخوینمەوە. لەسەروەختی خویندنەوەی ئەو رووداوانەشدا بۆم دەرکەوت کە لەسەرمە شتگەلیك بخەمە نیو جیهانەکەمەوە، کە هەرگیز بەخەیالمدا نەدەهاتن. نموونەی ئەمەش خەبات لە دژی هەژاریدا یان دادگا ئایینیەکان لە دژی هەرتۆقییەکان (*Fraticelle*)[١٣].

نموونەی ئەمەش: بۆچی کتیبەکەم هەرتۆقییەکانی سەدەی چواردەهەمی گرتە خۆی؟ ئەگەر لەسەرم بووبێ رۆمانیك لە بارەی سەدەکانی ناوەراست بنووسم، با رۆمانیك بیت لە بارەی سەدەی سیزدەهەم یان دوانزەهەم، چونکە زانیاریم لە بارەی ئەو دوو سەدەیە باشترە لە زانیاریم لە بارەی سەدەی چواردەهەم، بەلام پیویستم بە لیکۆلیار (محقق)یك هەبوو، باشتریش بوو ئەگەر ئینگلیز بیت "حەوالەکردنیکی هاودەقە" کە بەهرەیەکی وردی لە سەرنجدان و داناییەکی گەورەشی لە بواری لیکدانەوەی ئاماژەکان هەبیت.

ئەو جیاکەرەوانە ناکرێ دەست بکەون لە ناوەندە فرانسیسکیەکان[١٤] نەبیت. پاش "رۆجی باکۆن" تیۆریك لە بارەی هیماکان هەبوو کە پەرەسەندوتر بوو لەوەی کە لەبەردەست "ئۆکامییەکان"[١٥] دا بوو. بە دیاریکراویش، ئەم تیۆرە پیش ئەوە لە ئارادا بوو، لیکدانەوەی هیماکانیش لەلای ئەو یان لە سروشتیکی رەمزییەوە بوو، یانیش بەلای خویندنەوەی بیرو باوەرەکان و گەردوونخوازی (الکونیة) لە هیماکان، دایدەشکاندەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ (بیکۆن) یان (ئۆکام)دا بەکارهینانی هیماکان دەبووە هۆی ناسینی تاکەکان.

کەواتە لەسەرم بوو بچمە ژیر باری ئەوەی کە چیرۆکەکەم لە سەدەی چواردەهەم بیت. ئەمەشم بە نارەزاییەکی زۆرەوە کرد. کە ئەمەم کرد هەستم بە ئاسودەییەکی زۆر نەدەکرد. چەند خویندنەوەیەکی تازەم ئەنجامداو ئەوەم دۆزییەوە کە فرانسیسکا لە سەدەی چواردەهەم بووەو، تەنانەت ئەگەر ئینگلیزیش بووبیت، ناتوانیت خۆ گیل بکات لەو مشتومرەی ئەوکات لەسەر هەژاری هەبوو، بە تایبەت ئەگەر دۆست یان مورید یان لە ناسیاوەکانی (ئۆکام) بیت. لە سەرەتادا بریارم دا کە ئەو لیکۆلیار

(محقق)ە خودی (ئۆکام) خۆی بێت، بەڵام وازم لەو بیرۆکەیە هێنا، چونکە لە ڕووی مرۆڤایەتیەوە، لەو لێکۆڵیارە بەویقارە مورتاح نەبووم.

بەڵام بۆچی هەموو شتێك لە کۆتایی نۆڤێمبەری ١٣٢٧دا ڕوویدا؟ ئەمە ڕێك لەو مێژووەدا ڕوویدا، چونکە (میشال دو سیزان) لە دیسەمبەردا لە (ئەفنتیۆن)دا دەبێت (ئەمەش ئەوەیە کە پێی دەڵێن پێکەوەنانی جیهانێك لە ڕۆمانێکی مێژووییدا. هەندێ توخم، وەك ژمارەی پایەکانی قادرمە، دانەر بەدەست خۆیەتی، بەڵام توخمەکانی دیکە سەر بە جیهانی واقیعین، وەك هاتوچۆکانی (میشال) کە هەندێك جار لەگەڵ جیهانی شیاوی گێڕانەوەکە ڕێك دێنەوە).

بەڵام نۆڤێمبەر ماوەیەکی پێشکەوتووی ساڵە و ، منیش پێویستم بە کوشتنی بەرازێك هەبوو. بۆچی کوشتنی بەراز؟ لەبەر هۆیەکی سادە، کە من حەزم دەکرد تەرمێك بخەمە نێو کووپەیەك خوێنەوە، بەو شێوەیەی کە سەرەکە لە نێو کوپەکەدا بێت و هەردوو پێیەکەش لە دەرەوەی. ئەمە چ پێویستی دەکرد؟ چونکە فەرمان (نفیر)ی دووەمی قیامەت دەڵێت کە ناگەمە ئەو رادەیەی قیامەت بگۆڕم، ئەوە بە جەزایەك لەسەر جیهان دەڕژمێردرێت. بۆیە لەسەرم بوو وا بکەم دێرەکە لەسەر لوتکەی شاخێك بێت بۆ ئەوەی بەفرم دەست بکەوێت. ئەگەر ئەمە نەبوایە، دەکرا ڕووداوەکانی چیرۆکەکەم لە دەشتاییدا بونایە لە (بومبوزا) یان (کونکیر).

ئەو جیهانەی بنیاتنراوە ڕێنماییمان دەکات بۆ چۆنیەتی گەشەکردنی چیرۆکەکە. زۆر کەس پرسیاریان کرد بۆچی جۆرج (*Jorge*) لە ڕێگەی ناوەکەوە ئیحای بۆرخیس دەدات و، بۆچی (بۆرخیس) شەرانگێز بوو؟ بەڵام من نازانم.

بەدوای کوێرێکدا دەگەڕام پاسەوانی گەنجینە بێت (کە ئەمەش وا دەهاتە بەرچاو کە بیرۆکەیەکی گێڕانەوەیی نوێ پێك دێنێت)، لەم بارەشدا، گەنجینە، بەوەی کوێرێکیشی بۆ زیاد بکرێت، ناکرێت جگە لە (بۆرخیس) بۆ کەسی تر حەواڵە بکرێت. بۆیە پێویستە ئەوەی لەسەرمانە جێبەجێی بکەین.

کە (بۆرخیس)م خستە سەر گەنجینەکە، ئەو وەختە نەمدەزانی ئەو دەبێتە بکوژەکە. ئەو هەموو شتێکی لە خۆڕا کرد، ئەگەر دەربڕینەکە بشێت. بەڵام نابێت مەسەلەکە ببێتە هۆی ئەو بڕوایەی کە مەسەلەکە پەیوەستە بە هەڵوێستێکی "نموونەیی"وە: واتا کەسایەتیەکان ژیانێکی تایبەتیان هەیە. دانەریش کە لە باری سەرنج ڕاکێشاندایە- هیچ ناکات جگە لە جولاندنی بەپێی ئەوەی کە ئەو ئیحای پێدەدات. ئەمەش شتی پڕوپوچە، یانیش ئەوتوخمانەن کە بۆ ئەوە دەبن بن بە بابەتی

نووسینی داڕشتنێك لەسەر ئاستی بەكالۆریا، نا، راستیەكەی كەسەكان ناچارن بە گوێرەی یاساكانی ئەو جیهانەی لێی نیشتەجێن ڕەفتار بكەن و، قسەخوانیش دیلی پێشەكیەكانیەتی.

توونـاوتوون (المتاهـة: *Labyrinthe*) سـەرەڕۆییەكی جوانـی لـەلام دروسـت كـرد، چونكە هەموو ئەو تووناوتوونانەی دەمزانین، ئەوانەی كە (سانتار كاغیلی) وەسفێكی بێ وێنەی كردن، لەسەر ئاسمان كرابوونەوە. لەوانەیە ئاڵۆز و پڕ لە پێچاوپێچ بن بەڵام مەبەست نادەن بە دەستەوە، بەڵكو من پێویستم بە تووناوتوونێكی داخراو هەبوو (ئایا گەنجینەیەك بە بنمیچێكی كراوەوە هەیە؟). ئەگەر ئەم تووناوتوونە ئاڵۆز و پڕ لە داڵان و ژووری ناوخۆ بێت، ئەوا هەوایی بەشی ناكات. بەهەر حاڵ من پێویستم بە هەواییەك هەبوو بۆ كردنەوەی ئاگرێك (ئاگر بینایەكە لووش بدات، ئەمە مەسەلەیەك بوو باش تێی دەگەیشتم و ئەمەش لەبەر هۆیەكی كۆسمۆلۆجی  مێژوویی. چونكە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا كاتدرائیی و دێرەكان ئاگر وەك پوش و پەڵاش لووشی دەدان. چیرۆكێكی سەدەكانی ناوەڕاست بێنە بەرچاوت بەبێ ئاگر وەك هاتنە بەرچاوی فیلمێكی جەنگی وایە لە زەریای ئارامدا بەبێ هاتنە بەرچاوی فڕۆكەیەك كە دەسووتێ و دەكەوێتە نێو دەریاوە). بۆیە ماوەی سێ مانگ ئیشم كرد بۆ بیناكردنی تووناوتوونێكی گونجاو و دوای ئەوەش هەندێ شتم زیاد كرد، بەبێ ئەوەش هەوایەكە بەش ناكات.

### ٦) كێ قسە دەكات؟

لە نێو گرفتگەلێكدا سەرەخولێم بوو. جیهانێكی داخراوی لە شێوەی حەپسخانەم دەویست. واشم پێ باشتر بوو كە ئەم حەپسخانەیە داخراوبێت. دەبوایە یەكە زەمەنیەكان، سەرەڕای یەكە ئاسمانییەكان (لەبەرئەوەی یەكەی كار جێگەی دڵنیایی نەبوو) ئامادە بكەم. مەسەلەكە پێویستی بە بوونی دێری بەندەكتی[١٦] هەبوو كە ژیان لەسەر دروودی ڕۆژانە میقاتكراوە (لەوانەیە نموونەی نەستم یۆلیسێس بووبێت، بەهۆی بناغەی توندی ساتەكانی ڕۆژ و، هەروەها "چیای جادوگەر"یش، كە شوێنەكە بەردەڵانەو تایبەتكراوە بە چاكبوونەوەو مشت و مڕێكی زۆریش دەبینێت).

دایەلۆگەكان گرفتگەلێكی زۆریان خستە بەردەمم، كە لە كاتی نووسیندا سەركەوتووبووم لە چارەسەركردنیان مەبەستێك هەیە بە دەگمەن ڕەخنەگرەكانی

دایەلۆگەكان گرفتگەلێكی زۆریان خستە بەردەمم

قسەخوانی پەییان پێ بردووە، کە مەسەلەکەش پەیوەستە بەو وەسیلانەی قسەخوان لە پێناوی دابەشکردنی قسە بەسەر کەسایەتیە جۆراو جۆرەکان بەکاری دێنێ. کەواتە جیاوازییەکانی نێوان ئەم پێنج دایەلۆگە چین:

–وەزعت چۆنە؟

–خراپ نیم، ئەی تۆ؟

–وەزعت چۆنە؟ جان وای گوت.

–خراپ نیم، ئەی تۆ؟ بیبر وای گوت.

–چۆن، جان وای گوت، وەزعت چۆنە؟

–بیبر یەکسەر وەڵامی دایەوە: خراپ نیم، ئەی تۆ؟

–وەزعت چۆنە؟ جان یەکسەر ئەمەی گوت.

–خراپ نیم، ئەی تۆ؟ بە گاڵتەجارییەکەوە بیبر وەڵامی دایەوە.

–جان گوتی: وەزعت چۆنە؟

خراپ نیم، بیبر بە دەنگێکی بێباکانەوە وەڵامی دایەوە، پاشان بە بزەیەکی ناسنووردارەوە هەڵیدایێ: ئەی تۆ؟

جگە لە هەردوو باری یەکەم و دووەم، لە نموونەکانی دیکەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە پێی دەگوترێ سەکۆی گۆکردن (محفل التلفظ). چونکە دانەر لە ڕێگەی توانجێکی کەسییەوە دەست دەخاتە ناویەوە بۆ ئەوەی ئیحای ئەو مانایە بدات کە دەکرێ وشەکانی هەردوو کەسێتیەکەی بۆ حەواڵە بکات. ئایا ئەم مەبەستگەرییە (القصدیة) بە کردەوە بزرە لەو دوو بارەی کە هەردووکیان بێلایەن دەردەکەون؟ ئەی خوێنەر لێرەدا چ شوێنێکی هەیە؟ ئایا لە هەردوو باری یەکەم و دووەمدا ئازادە، ئایا ناکرێ، بەدەر لە ویستی خۆی، لەژێر کاریگەری بارگەیەکی سۆزدا بێت (بابێلایەنیی ڕوخسارەکیی دایەلۆگەکانی هەمەنگوای بێنینە بەرچاو) یانیش ئازادترە لەو دایەلۆگانەی کە حاڵەتەکانی دیکە پێشکەشی دەکەن، چونکە، بەلانی کەم، سنووری گەمەیان تیادا دەزانێت؟

مەسەلەکە پەیوەستە بە کێشەیەکەوە کە بۆ شێواز دەگەڕێتەوە، کێشەیەکی ئایدیۆلۆژییە، کێشەی "شیعر"ە زیاتر لەوەی کێشەی هەڵبژاردنی قافیە یان (سَجَع) یان ڕەگەزدۆزی بێت. کەواتە مەسەلەکە پەیوەستە بە دۆزینەوەی گونجان، لەوانەیە ئەوەش یارمەتیی دابم کە زۆربەی دایەلۆگەکان لەسەر زمانی (ئەدزۆ)وە هاتبن و،

تیاشیدا، بە پیی سروشتی بارەکە، تیروانینی خۆی بەسەر سەراپای گیرانەوەکە دەسەپینێ.

هەروەها دایەلۆگەکان گرفتیکی دیکەشیان بۆم نایەوە: تا چ رادەیەك ئەو دایەلۆگانە دەربڕی سەدەکانی ناوەراست دەبن؟ بە دەستەواژەیەکی دیکە، کە دەمنووسی، دەرکم بەوە کرد کە کتیبەکە شیوەیەکی میلۆدرامیی لیریکیی هەیە و ژمارەیەکی زۆر لە سروود و برگە لیریکیەکانی لەخۆگرتووە. برگە لیریکیەکان "بۆ نموونە وەسفی دەرگا گەورەکە" حەوالەی رەوانبیژی بالای سەدەکانی ناوەراست دەکریو، لیرەشدا پەکمان لەسەر نموونە ناکەوێ. بەلام ئایا بارودۆخی دایەلۆگەکان لیرەدا چیە؟ هەندێ جار دەترسام کە دایەلۆگەکانم ئیحایان لە (ئاگاتا کریستی)یەوە وەرگرتبێ، بە تایبەت لەو برگانەی لە (سوگر) یان (قەشەبرنار)ەوە دەرچوون. سەرلەنوێ گەرامەوە سەر خویندنەوەی رۆمانەکانی سەدەکانی ناوەند، مەبەستیشم لیی داستانی ئەسپ سوارییە، بە کەمیك سنوور بەزاندنەوە، دەرکم بەوە کرد کە من ریز دەگرم لە بەکارهینانیکی گیرانەوەیی و شیعری کە نامۆ نەبوو بە سەدەکانی ناوەراست. بەلام کیشەکە بۆ ماوەیەکی دریژ هەراسانی کردم و دلنیاش نیم لەو گرفتانەی کە گواستنەوە لە سرودەکانەوە بەرەو برگە لیریکیەکان دەیخاتە روو.

گرفتیکی دیکەش هەیە: مەسەلەکە پەیوەستە بە یەکداچوونیك لە نیوان کۆرەکانی گیرانەوە (المحافل السردية). دەمزانی (من) سەرقالم بە گیرانەوەی چیرۆکیك بە وشەکانی کەسیکی دیکە. پاش ئەوەی لە پیشەکیەکەدا ئامارژەم بەوە دا کە وشەکانی ئەم کەسە بە لانی کەم لە ریگەی دوو کۆرەوە پیدزەیان کردووە: کۆری مابیون و کۆری باوە فالی. دەشکرێ وای دابنیین، بە دلنیاییەوە، کە ئەم دوو کۆرە، (کێ بروا بەمە دەکات؟) هەروەك فیلۆلۆژیەکان وا دەکەن. لە دەقە رەسەنەکەدا، هەلسوکەوتیان کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئیمە سەرلەنوێ ریکەوتی ئەم گرفتە دەکەینەوە لە گیرانەوەکەی خودی ئەدزۆدا، کە گیرانەوەیەکە بە راناوی قسەکەرەوە. ئەدزۆ کە تەمەنی هەشتا سالی بەسەربردووە، ئەوە دەگیریتەوە کە تەمەنی هەژدە سال بووە. کەواتە کێ قسە دەکا. ئەدزۆی تەمەن هەژدە سال یان ئەدزۆی تەمەن هەشتا سال؟ هەلبەت هەردووکیان. مەسەلەکەش لەلای منەوە بە ئەنقەست بوو. گەمەکە پیویستی بەوە

هەبوو كە بەردەوام ئەدزۆی پیر وینا بكەین كە ئەوە دەگێریتەوە لە گەنجیدا دیویەتی یان بیستویەتی.

نموونەی من (*Les Serenus Zeitblom*)ی دكتۆر فاوستۆس بووە (بەڵام دووبارە نەمخویندەوە و هەر بە چەند بیرەوەرییەكی لەمیژ وازم هینا). ئەم گەمە لەفزیە دوولایەنیە دەستی لیسەندم و دەروونی داگیركردم. لەبەرئەوە من، كە كەسیتیی ئەدزۆم دەكرد بە دوو قات، ئەو پەردەو شاشانەش كە دانراون لە نیوان من، بەوپییەی من كەسیكم ژینامەیەكی سنووردارم هەیە و من بەوپییەی دانەریكم رووداوەكان دەگیرمەوە، واتە گیرەرەوەو، لە نیوان ئەو كەسیتیانەی گیرانەوەیان كۆتایی پێ دەهینرێ بە دەنگی گیرانەوەییشەوە، دووقات دەكەمەوە، ئەمەش مەسەلەی ئەو دەمامكەمان بیردەخاتەوە كە پیشتر ئامارژەم بۆ كرد.

هەستم كرد من پاریزراوم، ئەم ئەزموونە (حەز دەكەم بە شیوەیەكی بەلگەنەویستانە وەك ئەوەی پارچەیەك كاتۆ لە زیزەفۆنیك دانرابیت بلیم لە رووی جەستەییەوە پاریزراوم) هەندێ گەمەی منداڵانەی بیرخستمەوە، كە خۆم دەخستە پیخەوە بۆ ئەوەی وا هەست بكەم لەنیو (ژیر دەریایی: غواصة)یك دام و لەویوە نامەم بۆ خوشكەكەم دەنارد، كە ئەویش لەلای خۆیەوە خۆی لەژیر قەرەویلەیەكی دیكەدا حەشاردابوو، لە جیهان دابرابووین و ئازادییەكی بێسنوورمان هەبوو لە داهینانی پیشبركیی دریژخایەن لەنیو ئاویكی بیدەنگدا.

ئەدزۆ بەلای منەوە گرنگ بوو. هەر لە سەرەتاوە حەزم لە بەتەواوی گیرانەوەی رۆمانەكە بوو (بە نهینییەكانی و رووداوە سیاسی و تیۆلیۆژیەكانی و بە تەمومژاوییەكەشیەوە)، لە ریگەی دەنگی كەسیك لەنیو رووداوەكاندا دەژیت بە دلسۆزیی ئامیریكی فۆتۆگرافیی كە بە دەستی هەرزەكاریكەوە بیت هیچ شتیك لە بارەی ئەم رووداوانە نەزانێ (و لیشیان تێ نەگات تا پیر نەبیت، بۆیە هەلهاتن بەرەو عەدەمیكی خواوەندانە هەلدەبژیریت، ئەم هەلهاتنەش لەو هەلهاتنە ناچێ كە مامۆستاكەی فیری كردووە).

ئامانجەكە ئەوەبوو كە وا بكەین هەموو شتیك مایەی تیگەیشتن بیت لە ریگەی وشەكانی كەسیكەوە كە لە هیچ تێناگات. كاتیكیش رەخنەكان دەخوینمەوە، دەرك بەوە دەكەم كە مەسەلەكە لیرەدا پەیوەستە بە روخساریكی رۆمانەكەوە كە بە دەگمەن نەبیت نەبۆتە مایەی بایەخ پیدانی خوینەریكی رۆشنبیر (نزیكەی كەس ئامارژەی بۆ ئەم روخسارە نەكردووە). ئیستاش دەپرسم: ئایا ناشێ ئەم رووخسارە بەشداریی

کردبیت لە دیاریکردنی رادەی خویندنەوەی رۆمانەکە لەلای خوینەرە ئاساییەکان. ئەوان تیکەل بە بێتاوانیی قسەخوان بوون و هەستیان کرد کە لە هەموو گوناهیك دەربازبوون کاتیك کە لە هەموو شتیك تێنەگەیشتن. بە نیگەرانیی خۆیان بەرامبەر بە رەگەز و زمانە نەناسراوەکان و، ئاستەنگیی فیکرو، پەناو پیچەکانی ژیانی سیاسی بەرەو روویان بوومەوە. ئەمانە شتگەلیکن ئیستا لییان تیدەگەم، پاش ئەوەی بەسەرچوو. بەلام لیرەدا کۆمەلیك هەلچوونی هەرزەکاریی خۆم ناخەمە سەر ئەدرزۆ، بە تایبەت ئەوانەی پەیوەستن بە ختوکەی خۆشەویستی (هەمیشە لە لایەن کەسیکی دیکەی جیا لە خۆمەوە کە ئەم قسانەی دەکرد پاریزرابووم. بە کردەوەش وایە، ئەدرزۆ ئازارەکانی خۆشەویستیی نییە تەنها لە ریگەی ئەو وشانەوە نەبیت کە کاهینەکانی کلیسە بۆ قسەکردن لە خۆشەویستی بەکاری ناهینن، هونەر دەربازبوونە لە هەلچوونە کەسیتییەکان، جویس و ئیلیوت ئەمەیان فیرکردم.

ململانێ لە دژی هەلچوون توند و تیژ بوو. نویژیکی بێ وینەم نووسی و لەسەر شیوەی "پیاهەلدانی سروشت"ی ئالان دولیل، هۆنیمەوە و لەسەر زمانی "گیوم" لە چرکەیەك لە چرکەکانی هەلچوندا دامنا. پاش ئەوە دەرکم بەوە کرد کە من و ئەو دەبینە مایەی بەزەیی خەلك. من بەوپییەی دانەرم و ئەویش بەو پییەی کەسیتییەکە. من بەوپییەی دانەرم، مافی ئەوەم نەبوو ئەوە بکەم، ئەویش بەو پییەی کەسیتیەکە نەیدەتوانی ئەوە بکات، چونکە لە قوریکی جیاواز دروستکراوە. هەلچوونەکانی لە سروشتیکی زەینی یان بە تەحەفوزەوە بوون، بۆیە ئەو لاپەرەیەم لابرد. یەکیك لە دۆستە کچەکان، پاش ئەوەی کتیبەکەی خویندەوە گوتی: (تاکە نارەزاییم ئەوە بوو کە گیوم بەزەیی نەبوو)، ئەم قسەیەم بۆ هاورییەکی دیکە گیرایەوە، وەك پزیشکیك وەلامی دامەوە (ئەمە شیوازی خۆیەتی لە داتاشینی پەیکەرەکانی)[١٧] *Pieta*. لەوانەشە مەسەلەکەش وابیت، ئامین.

**ختنەروو:**

ئەدرزۆ بۆ چارەسەری گرفتیکی دیکەش یارمەتیی دام. دەمتوانی وابکەم رووداوەکانی چیرۆکەکەم لە رۆژگاری سەدەکانی ناوەراستدا رووی بدایە کە خەلك هەموو شتیکی لە بارەوە بزانیایە. کەسیك لە چیرۆکیکی هاوچاخدا گوتویەتی ڤاتیکان بە تەلاقی ئەو رازی نییە. کەواتە پیویست بەوە ناکات ئەوە راڤە بکەین کە ڤاتیکان چ

مانایەکی هەیە و بۆچی رازی لەسەر تەلاق نییە. بەلام مەسەلەکە لە رۆمانیکی میژوییدا وەها نییە. ئیمە بۆ ئەوەش هەقایەت دەکەین لە پیناوی رۆشنکردنی خەلك و گەیاندنی ئەوەش کە روویدا. هەروەها لە پیناوی ئاماژەدان بەوەش کە ئەم رووداوە دوورانە ئیستا بایەخی خۆیان هەیە.

بەلام لەوانەیە ئیمە بکەوینە نیو مەترسییەکانی "سلغاری"یەوە. کەسیتییەکانی سلغاری لە دەست دوژمنەکان بۆ دارستان هەلدین و، دەکەونە سەر قەدی داریکی بائۆباب[١٨]: ئەو ساتە وەختە قسەخوان لە گیرانەوە دەکەویت بۆ ئەوەی دەرسیکمان لە بارەی زانستی رووەك و بائۆباب دابدات. ئە بیرۆکەیە زۆر بەکاردەبریت. مەسەلەیەکی خۆشەو، لە خەوشەکانی کەسیك دەچیت کە خۆشمان دەویت، بەلام هەولی ئەوە دەدەین خۆ لە خەوشەکانی ببویرین.

سەدان لاپەرە نووسینم ئامادەکرد بۆ ئەوەی ئەو ئاستەنگە ببویرم، بەلام بیرم نییە لە پیناوی چارەسەرکردنی ئەم گرفتەدا چیم کرد. تەنیا دوو سال پاش ئەوە دەرکم بەو مەسەلەیە کرد، کاتیك کە هەولم دەدا ئەوە راڤە بکەم کە بۆچی ئەم کتیبە هاوسۆزیی پەیداکرد لە لایەن خەلکانیکەوە کە حەز بە خویندنەوەی کتیبە "زانایییەکان" ناکەن. شیوازی گیرانەوەیی ئەدزۆ پشت نابەستێ بەو چاکە رەوانبیژییەی پیی دەلیین (قسەی بە پیچ و پەنا: القول المراوغ: *Preterition*) ئەوە ئەو پەندە بەناوبانگەیە: (لە توانامدا هەیە بلیم ئەو جوانیی کتیبەکانی تایبەت بە فیکر بە باشی دەناسێ.. بەلام بۆچی لە قسەدا دریژ دادری بکەم (بۆسیی).

ئیمە نامانەوێ قسە لە شتیك بکەین کە خەلك چاك دەیزانێ، بەلام ئیمە، کە ئەوە دەلیین، قسە لە بارەی ئەو شتەوە دەکەین. ئەمە لەو ریگایە دەچیت کە ئەدزۆ بۆ ئاماژەکردن بە هەندێ کەسایەتی و هەندێ رووداوی زۆر ناسراو بەکاری دینێ. ئەم کەسایەتیانەو ئەم رووداوانە، خوینەری ئەدزۆ، کەسیکی ئەلمانییە لە کۆتایی سەدەدا، نایانزانی، چونکە ئەو کەسایەتییانەو ئەو رووداوانە لە سەرەتای سەدەوە لە ئیتالیا روویانداوەو، ئەدزۆش بۆ قسەکردن لەسەریان هیچ خۆ بەدوورگرتنیکی نەبووە. بەلکو ئەمە بە شیوازیکی فیرکاری ئەنجام دەدات، چونکە ئەمە شیوازی هەوالنیریی سەدەکانی ناوەراست بوە. زۆر حەزیان بە هینانە ناوی چەند وتەیەکی ئینسکلۆپیدیایی دەکرد هەرچەندی ئاماژەیان بۆ شتیك بکردایە. کچیکی دۆستم (نەك ئەو کچە دۆستەی پیشوو) پاش ئەوەی دەستنووسەکەی خویندەوە پیی گوتم

ئەوەی سەرنجی ئەوی راکیشاوە دەنگی رۆژنامەنووسییانەی قسەخوانەکە بوە، نەك دەنگی رۆمانەکە، ئەمەش هەمان ئەو قسانە بوو کە رۆژنامەی *Espresso* ئەگەر لە یادم مابیت، باسی کرد. ئەم قسانە لە سەرەتادا نەکەوتنە بەردلم، بەلام پاشان ئەوەی ژنەکە دەرکی پیکردبوو بەبی ئەوەی جورئەت بکات دان بەمەدا بنیت، تییگەیشتم. ئەمە ریگای (حولی) ئەهلی بلاوکراوەکانی ئەم سەدەیە بوو لە گیرانەوەدا، ئەگەر ئەمرۆ قسە لەسەر هەوالدەریەکان (الاخباریات) دەکەین لەبەر ئەوەیە کە ئیمە زۆر ئەوە دەنووسین.

**هەناسە:**

برگە فیرکارییە دریژەکانیش ئامانجیکی دیکەیان هەبوو، دۆستە بلاوکەرەوەکانم، پاش دیتنی دەستنووسەکە، ئاماژەی ئەوەیان بۆ کردم کە سەد لاپەرەی یەکەم کورت بکەمەوە، وا هاتە بەرچاویان کە وەخت دەبات و ماندووکەرە. بیدوودلی ئەمەم رەت کردەوە. بیانووەکەشم ئەوەبوو کە ئەوەی حەزی لە چوونە نیو دیرو حەوت رۆژمانەوە تیایدا هەیە، دەبی بەرگەی ئەو ریتمە بگری. ئەگەر توانای ئەوەی نیە، ئەوا ناتوانی سەرلەبەری کتیبەکە بخوینیتەوە. بەهەرحال ئەرکی سەد لاپەری یەکەم تاقیکردنەوەیەك و مالیکردنیك بوو. باکم بەوانەش نییە کە ئەمەیان خۆشناوی، ئەوان لە سەرەتای گردەکەوە وەستاون.

چوونە نیو رۆمانیك لە گەشتیك بەرەو شاخ دەچیت. دەبی هەناسەیەك هەلبژیری‌و، هەلبژاردنی ریتمیکیش بۆ رۆیشتن، ئەگینا ئیمە لە سەرەتا وەستاوین.. ئەمە لە شیعریشدا روودەدات. هەر خوا خۆی دەزانیت و ئەو شیعرانە چەند مایەی بیزارین کە هەندی ئەکتەر کە نازانن شیعر بخویننەوە، دەیان خویننەوەو، خویندنەوەکەشیان ئاوازدار دەکەن و، وا رەفتار دەکەن وەك بلیی پەخشانیك بخویننەوە، ئەوان کەوتوونەتە دوای ناوەرۆك و ریتمیان لەبیرکردووە. بۆ خویندنەوەی قەسیدەیەکی لە جۆری *tercet* یان [١٩] دەبی ریتمیکی لیریکی کە شاعیر گەرەکیەتی، رەچاو بکری. باشترە وا شیعری دانتی بخوینینەوە وەك بلیی مەسەلەکە پەیوەست بیت بە قافیەکانی (عدیە)ی مندالیمان[٢٠] کە هەناسە برکیمان بیت بە دوای مانادا.

بەلاّم لە گیرانەوەدا، دەروون ناگەریتەوە بۆ رستەکان، بەلکو پەیوەستە بە چەند یەکەیەکی گەورە، واتە بە چەند برگەیەکی تازەگەر. رۆمانگەلیك هەن وەك ئاسك هەناسە دەدەن و هی دیکەش وەك نەهەنگ یان فیل. ئاویتەبوون لە دریژی هەناسەکەدا نییە بەلکە لە ریك و پیکیەتی. ئەگەر روویداو، لە چرکەساتیکدا، هەناسە برا و رشتەیەك (یان برگەیەك) پیش هاتنی تەواوی هەناسەکە پچرا، ئەوا ئەمە رۆلیکی گرنگ لە ئابووریی گشتی قسەخوان دەگیرێ. رەنگە ئەمە ببیتە خالیکی پچران، یان سەراوژیرکردنیکی لە ناکاوی رووداوەکان بیت. ئەمەش ئەوەیە کە دانەرەکان، بەلانی کەم گەورەکانیان، ئەنجامیان داوە: بۆ نموونە رستەیەکی وەك: (خاتوونە بەستەزمانەکە گەرایەوە) خالیك بۆ سەری دیرەکە، هەمان ریتمی: (مالئاوا ئەی شاخەکان)ی نییە. کە ئەمەش روودەدات، مەسەلەکە وەك ئەوە وایە کە شاخەکانی لۆمباردی خوین دایپۆشیبێ*.

رۆمانی مەزن ئەوەیە کە دانەرەکەی دەزانیت کەی خیرا دەبیت و کەی دەوەستیت و، چۆن پلەی هەروەستەکردنەکان یان خیراکردنەکان لە چوارچیوەی ریتمیکی رەسەنی چەسپیو دەخەملینرێ. بۆ نموونە لە مۆسیقادا دەشێ "ریباتۆ"[٢١] بژەنین بەبێ زیادەرەویکردن تیایدا، ئەگەر نا وەکو ئەو مۆسیقاژەنە خراپانەمان لیدیت کە لەو بروایەدان لە پیناوی ژەنینی چەند برگەیەکی شۆپان ئەوە بەسە کە بازنەی ریباتۆ فراوان بکەین.

لیرەدا چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانە راڤە ناکەم، بەلکو هەول دەدەم ئەوە دەربخەم کە چۆن من نەمخستۆتە روو. درۆزنیش دەردەچم ئەگەر بلیم من ئەو گرفتانەم بە شیوەیەکی وشیارانە خستۆتە روو. لیرەدا رۆحیکی ئاوازدانان هەیە کە لە ریگەی ریتمەکانی ئەو پەنجانەی دەکەونە سەر دوگمەی ئامیرەکە بیردەکاتەوە.

لیرەدا دەمەوێ بیرۆکەیەکی تایبەت بەم بیرۆکەیە بخەمە روو کە دەلی گیرانەوە بریتییە لە بیرکردنەوە بە پەنجەکان. شتیکی ئاشکرایە دیمەنی تایبەت بە جووتبوونەکەی نیو مەتبەق هەر هەمووی بنیاتنراوە بە شایەتی وەرگرتن لە چەند دەقیکی ئاینیی لە سروودی سرودەکان و قەدیس برنارو جان دوفکامبەوە، هەتا ژنە قەشە هیلدوگارد دو بنگام. ئەوەی سۆفیگەریی سەدەکانی ناوەراست نەزانێ و تەنیا هەستیکی بیستنی سادەی هەبیت ئەمە دەزانیت. بەلاّم ئەگەر ئەمرۆ لیم داوا بکەن کە خاوەنی ئەم شایەتیانە دیاری بکەم و، یەکەمیان لە کوێ کۆتایی دیت و دووەمیان لە کوێوە دەست پێدەکات، ئەوا من ناتوانم ئەمە بکەم.

رۆمانی مەزن ئەوەیە کە دانەرەکەی دەزانێت کەی خێرا دەبێت و کەی دەوەستێت و، چۆن پلەی هەروەستەکردنەکان یان خێراکردنەکان لە چوارچێوەی ریتمێکی رەسەنی چەسپیو دەخەملێنرێ.

ڕاستیەکەی، ژمارەیەکی زۆر چەکمەجەم لەبەردەستدا بوو کە پڕبوون لە هەموو جۆرە دەقیك و هەندێ جار چەندین لاپەڕەی کتیب و دانەی کتیبی تیابوو، کە زۆر زیاتر بوون لە وانەی بەکارم هینان. بەڵام کە دیمەنەکەم نووسی، بە یەك کەرەت ئەمەم کرد (دەستکارییم نەکرد تەنیا دواتر نەبیت، هەروەها مادەی (فیرنی)شم خستە سەر بۆ ئەوەی جۆریك لە گونجاوی لە نیوان توخمە گەیەنەرەکان پەیدابکەم).

بە گویرەی ئەمە، من کە دەمنووسی چەند دەقیکی پەرش و بڵاوم بە دەورەوە بوو، تاویك تەماشای ئەم دەق و تاویکی تر سەیری دەقیکی دیکەم دەکرد، برگەیەکم لیدەگواستەوە بۆ ئەوەی پاشان بە برگەیەکی دیکەی ببەستمەوە. ئەمە ئەو ڕشتەیە بوو کە زۆر بە پەلە نووسیم. پاش ئەوە دەرکم بەوە کرد کە من بە پەنجەکانم دوای ڕیتمی جووتبوونەکە کەوتووم، بۆیە لە توانامدا نەبوو بوەستم بۆ ئەوەی شایەتیەکە هەلبژیرم. ئەوەی کە شایەتییەکەی پشت ڕاست دەکردەوە ئەو ڕیتمە بوو کە شایەتیەکەم لە ڕیگەیەوە پیدزە کردبووە ناوی‌و، ئەوەشم دووردەخستەوە کە ڕەنگە ببیتە هۆی شکاندنەوەی ڕیتمی پەنجەکانم.

ناتوانم بلیم ماوەی نووسینی ڕووداوەکە هەمان ئەو ماوەیەیە کە ڕووداوەکە خایاندوویەتی (هەتا ئەگەر جووتبوونەکە خاویش بووبێ)، بەڵام هەولم داوە، تا ئەو ڕادەیەی بشیت، ماوەی نیوان کاتی جووتبوونەکە و کاتی نووسینەکە کورت بکەمەوە. مەبەستم نووسینی وەستایانەیە نەك نووسین بە تیگەیشتنە (بارت)یەکەی. من لە بارەی نووسین بە چەمکە مادیە فیزیکیەکەی دەدویم. قسە لەسەر ڕیتمی جەستە دەکەم، نەك ڕیتمی هەلچوونەکان. هەلچوونەکە لە سەرەتادا هەبوو، لەو بڕیارەی قازیەکە دای بە ئاویتەکردنی سەرمەستیی سۆفیگەریانە و سەرمەستیی ئیرۆسی، لەو چرکەیەدا کە تیایدا خویندمەوە و ئەو دەقانەم هەلبژارد کە بەکاریان دەهینم. پاش ئەوە هەموو هەلچوونەکان نەمان. ئەوە ئەدزۆ بوو سیکسی دەکرد، نەك من، هەرچی من بووم بەس ئەوەم لەسەر بوو کە هەلچوونەکانی بکەم بە گەمەی هەردوو دەست و هەردوو چاو، وەك ئەوەی من ویستبیتم چیرۆکی خۆشەویستییەك لە ڕیگەی تەپل لیدانیکەوە بگیرمەوە.

**بنیاتنانی خوینەر:**

ئایا نووسەریك هەیە تەنها لە پیناوی ئایندەدا بنووسیّ؟ نووسەریکی لەم جۆرە بوونی نییە

لە پیناوی ئەم ریتمەو ئەم هەناسەیە و ئەم ئازارانە؟ لە پیناوی من؟ هەلبەت نەخیر. ئەمە لە پیناوی خوینەرە، چونکە ئیمە لە وەختی نووسیندا بیر لە خوینەریك دەکەینەوە. بە تەواوی هەروەك دۆخی ئەو وینەکیشەی لە کاتی رەسمکردنی تابلۆیەکدا بیر لە بینەر دەکاتەوە. ئیدی پاش هەر فلچە وەشاندنیك دوو هەنگاو یان سیّ هەنگاو دەچیتە پاش بۆ ئەوەی دیراسەی شوینەکە بکات. بینەریك پیویستە چۆن تەماشای دیمەنیك بکات، لە چوارچیوەی مەرجەکانی رووناکیی گونجاو و وا لیی رادەمینیّ کە تابلۆکە بە دیوارەکەوە هەلواسراوە.

کە دەست بە ئیش دەکریّ، دایۆلۆگی نیوان دەق و خوینەرەکەی دەست پیدەکات (لەم دایەلۆگەدا دانەر دوورخراوەتەوە). بەلام لەسەروەختی دارشتنەوەی ئەم ئیشەدا دایەلۆگیکی دووسەرە دیتە گۆریّ: دایەلۆگیك لە نیوان ئەم دەقەو لە نیوان هەموو دەقەکانی پیشوودا (ئیمە کتیبیك نانووسین بە سەرچاوەگرتن لە کتیبیکی دیکەوەو لەبارەیەوە نەبیت). دایەلۆگەکەی دیکەش لە نیوان دانەر و خوینەرە نموونەییەکەیدایە. بۆ ئەم مەسەلەیەش تەماشای *Lector in Fabula* و پیش ئەوەش تەماشای *L, oeuvre ouverte* م کردووەو، ئەم خوینەرە من دامنەهیناوە.

دانەر کە خەریکی نووسینە، لەوانەیە بیر لە جەماوەریکی بە کردەوە بکاتەوە، هەروەکو دامەزرینەرانی رۆمانی هاوچاخ فیلدینگ یان دۆفۆ ئەمە دەکەن. ئەمانە بۆ ئەو فرۆشیارانەیان دەنووسی کە ژنان بۆ بازار کردن دەچوونە لایان. خودی جویسیش بۆ جەماوەر دەینووسی، هەر ئەو بوو کە بیری لە خوینەریکی نموونەیی توشبوو بە خەوزرانیکی نموونەیی دەکردەوە. لە هەردوو باریشدا پیکەوە، چ بنوسین و بیر لە جەماوەریك بکەینەوە کە لەبەردەم کۆسپەی دەرگایەو ئامادەباشە، یان بۆ خوینەریك بنووسین کە سەر بە ئایندەیە، ئەوا نووسین مانای بنیاتنانی خوینەریکی نموونەییە لە ریگەی دەقەوە.

کەواتە بیرکردنەوە لە خوینەریکی نموونەیی کە بتوانیّ ئەو کۆسپانە ببری کە سەد لاپەرەکەی بەرایی دروستی کردوون، چ مانایەکی هەیە؟ ئەمە مانای نووسینی سەد لاپەرەیە بە مەبەستی بنیاتنانی خوینەریکی گونجاو بۆ ئەو لاپەرانەی کە دواتر دین.

ئایا نووسەریك هەیە تەنها لە پیناوی ئایندەدا بنووسیّ؟ نووسەریکی لەم جۆرە بوونی نییە، تەنانەت ئەگەر ئەو جەختیشی لەسەر بکات، ئەمەش لەبەر هۆیەکی سادە: لەبەرئەوەی ئەو نووسەرە نۆستەر دامۆس[٢٢] نییە، کەواتە ناتوانیّ ئایندە وینا

بکات، تەنیا لە ریگەی ئەو نموونەیەوە نەبیت، کە لەوەوە گەلآلەی دەکات، کە هاوچاخەکانی دەیزانن.

ئایا نووسەریك هەیە بۆ کەمیکی کەمینەی خوینەران بنوسیت؟ بەلیٚ، ئەگەر ئەمە مانای ئەوە بیت کە ئەو خوینەرە نمونەییەی کە وینای دەکات، بە باشی بەخت یاوەری نییە کە لە جەماوەریکی بەریندا بەرجەستە ببیت.

سەرەرای ئەوەش و، تەنانەت لەم بارەشدا، دانەرەکە کە دەنووسیٚ ئومیدی هەیە، ئەمەش نهینییەك نییە، کە ژمارەیەك لەو نموونانەی لە وینەی ئەو خوینەرەن، کە زۆر جیگەی مەبەستن، بە دەنگ کتیبەکەیەوە بین، کە ئەمەش دەقەکە گریمانی دەکاو دەبیتە مایەی هاندانی.

رەنگە جیاوازییش هەبیٚ، ئەگەر جیاوازییەك هەبوو، لە نیوان ئەو دەقەی کە دەیەویٚ خوینەریکی تازە بەرهەم بهینیٚ و لە نیوان ئەو دەقەی دەیەویٚ ئارەزووەکانی جەماوەریکی بەرین رازی بکات. باری دووەم ئەوەیە کە ئیمە لە بەردەم کتیبیکداین، بەپیٚی رادان بە ئاراستەی بەرهەمهینانی بە کۆمەلیی مادەیەك، نووسراوە. کەواتە دانەر شتیك دەکا لەوە دەچیٚ کە دیراسەی بازار بکات بۆ ئەوەی خۆی لەگەلٚ خواستەکانیدا بگونجینیٚ. ئەم کارە کە پشتی بە فۆرمەلەیەکی حازر بەستووە نیشانە راستەقینەکانی دەرناکەویٚ تا دوای دیراسەکردنی تیکرای نموونەکانی: کاتیك لەو هەموو رۆمانانە رادەمینین، تیبینی دەکەین، کە ئەگەر ئیمە ناوەکان و جیگەکان و سیماکانمان گۆری، دانەر تیایدا هەمان چیرۆك، کە جەماوەر حەزی لییەتی، دەگیریتەوە.

بەلآم کاتیك کە نووسەر بە دوای تازەدا دەگەریٚ و خوینەریکی جیاواز دەخاتە لاوە، ئەوا نایەویٚ دیراسەی بازار بکات لە پیناوی جۆری داخوازییەکان، بەلکو دەیەویٚ فەیلەسوفیك بیت گۆشتی ***Zeitgeitst*** لوش بدات. ئەو ئەوە بۆ جەماوەرەکەی دەخاتە روو کە دەبی حەزی لی بیت، تەنانەت ئەگەر ئەم جەماوەرە ئەوەش نەزانیت. ئەو دەیەویٚ خوینەر بە خۆی بناسینیٚ.

بۆیە ئەگەر مانزۆنی[٢٣] بە دوای ئەوە بکەوتایە کە جەماوەر دەیویست، دەولەمەند دەبوو: رۆمانی میژوویی سەدەکانی ناوەراست بە کەسایەتیە بەناوبانگەکانی، تەواو وەك تراژیدیای یۆنانییە کە مەلیکەکان و شازادەکانی تیادایە (ئەی ئەمە ئەوە نیە کە ***Adelchi I,*** پیشکەشی کردووە)، کەش و هەوایەکی مەزن و گەورە، چەند

بەگژیەکداچوونیکی شەرخوازانە، خۆبادان بە سەربەرزییەکانی ئیتالی لە رۆژگاریکدا کە ئیتالیا لیرەوار بووە. ئایا رۆماننووسەکانی پیش ئەو و لەگەڵ ئەو و دوای ئەویش ئەمەیان نەکردووە، ئەو رۆماننوسە میژووییە نەگبەتانە هەر لە (*L, Aristan d,Azeglio*)ەوە تا (*Fougueu xet vaseux Guerrazzi*) بە (*L,Ilisible Cantu*) شەوە؟

جا مانزۆنی چیی کرد؟ سەدەی حەڤدەهەمی هەلبژارد: ماوەی کۆیلەیی و زۆلەکان و تەنیا بکوژیکی بەکریگیراو، بەلام فیلباز، بەبێ گیرانەوەی شەرەکان. سەرەرای ئەوەش هەلبژاردنیکی ئازایانەی کرد کە چەندین بەلگەو هاواری خستە پال چیرۆکەکەیەوە. ئەم ئیشە بووە مایەی سەرسامیی هەموو خەلك: بە رۆشنبیران و رەشۆکییەکان، مەزنەکان و سادەکانەوە، دەمارگیرەکان و رەبەن خۆرەکانەوە.

ئەو دەرکی بەوە کردبوو کە خوینەران ئەمەیان دەوێ، تەنانەت ئەگەر ئەمەش نەزانن و داواشی نەکەن، تەنانەت ئەگەر توانای بەکاربردنیشیان بە زەیندا نەهاتبێ. ئەمەش پیویستی بە تەقەلایەکی گەورە هەبوو: مەورەدو مشار و چەکوش و تایت بۆ ئەوەی ئەم بەرهەمە تامی خۆش بیت و، لە پیناوی ئەوەی خوینەرە بە کردەوەکان ببن بە خوینەرانی نموونەیی هەروەك بە ئاواتی دەخواست.

مانزۆنی نەیدەنووسی بۆ ئەوەی مەرایی لەبەر جەماوەر بکا، بەلکو ئەمەی دەکرد لە پیناوی خولقاندنی جەماوەریك کە نابێ رۆمانەکانی بە دلیان نەبیت. مەسەلەکە چەند مایەی جەخار دەبوو ئەگەر ئەم رۆمانە بە دلی جەماوەر نەبوایە. لەم نیفاقەو لەم رەوانییە رامینن کە قسەی پێدەکات لە بارەی ٢٥ خوینەرەوە، کە ٢٥ ملیۆن خوینەریشی دەویست.

ئەم خوینەرە نمونەییەی دەمویست لە کاتیکدا دەمنووسی، کێ بوو؟ بە تەواوی دلنیاییەوە خوینەریکی دەست تیکەلاوە، لە گەمەکەمدا هاودەممە. دەمویست بە شیوەیەکی تەواو ببم بە کەسیکی سەدەکانی ناوەراست و، لە سەدەکانی ناوەراستدا بژیم وەك ئەوەی کە قۆناغی من بووبیت (پیچەوانەکەشی راستە). لە هەمان کاتیشدا بە هەموو هیزیکەوە حەزم دەکرد سیمایەکانی خوینەریك لە بەردەممدا بکیشریت، کە دوای رەتکردنی چرکەساتی مالیکردن ببیتە نیچیرەکەم یان نیچیری دەق و، وزەن دەکا کە ئەو حەزی لە هیچ نییە تەنیا ئەوە نەبیت دەقەکە پیشکەش دەکات. دەقەکە دەیەوێ ببیتە ئەزمونیکی وەرگۆران لەلای خوینەر. تۆ لەو بروایەدای کە تۆ سیکس و ئەو پیلانە تاوانکارییانەت دەوێ کە لەکۆتاییەکەیاندا تاوانبار ئاشکرا دەبن، سەرەرای

رووداوگەلیکی زۆر، بەلام لە هەمان کاتدا شەرم دەکەی لە پەسەندکردنی کالایەکی هەرزان کە لە "*Fiacren! 13*"ەوە لە "*Forgeron de la Court- Dieu*"ەوە هاتبیَ.

کەچی من شتیك لە لاتینی و، شتیك لە ژنان و زۆریك لە تیۆلۆژیا و خوینیکی زۆرت پیَ دەدەم هەروەك لە (*Grand Guignol*)دا وایە بۆ ئەوەی دوای ئەمە بنووسیی: (نا ئەمە راست نیە، نامەویَ دریژە بەو گەمەیە بدەم)، ئەوکاتە دەبی تۆم هەبیت، وا لە جەستەت بکەم ختووکەی بیت لە بەردەم گەورەیی ئەو خواوەندەی کە سیستەمی جیهان دەکا بە بیهودەیی. پاش ئەوە، ئەگەر زیرەك بیت، دەرك بەوە دەکەیت کە چۆن بۆ ئەو تەلەیە پەلکیشم کردیت و، لە کۆتاییشدا من لە هەر هەنگاویکدا ئەمەت پیَ رادەگەیەنم و، وریات دەکەمەوە کە من بەرەو ئازارت دەبەم. بەلام ئایا جوانیی متمانەکان بە شەیتان لەوەوە نەهاتووە کە تۆ ئیمزا دەکەیت و دەشزانی لەگەلّ کیَ هەلسوکەوت دەکەیت. ئەگەر نا چ سوودیکی هەیە کە قوربانیی بدەین بەوەی بخریینە دۆزەخەوە.

لەبەرئەوەی من حەز دەکەم جوانترین تاکە شت ئەوە بیت کە وات لیدەکات ختوکە بدەیت، واتە ختوکەی میتافیزیکی و، چی تریشم بۆ نەماوەتەوە جگە لەوەی کە (لەنیو هەموو نموونەکانی گۆشتەکەدا) ئەوەی میتافیزیکیتر و فەلسەفی ترە، واتە رۆمانی پۆلیسی هەلبژیرم.

### میتافیزیکای پۆلیسی:

شتیکی ریکەوت نییە کتیبەکە وا دەست پیَبکا کە رۆمانە پۆلیسییەکان دەست پیدەکەن (ریکەوتیش نییە رۆمانەکە خوینەری ساویلکە تا کۆتایی بخەلەتینیَ، تا ئەو پلەیەی کە دەرك بەوە ناکات مەسەلەکە پەیوەستە بە رۆمانیکی پۆلیسیەوە کە تیایدا هیچ شتیك ئاشکرا نابیَ و لیکۆلیار ناگاتە هیچ شتیك).

وا بزانم خەلك رۆمانی پۆلیسییان خۆش دەویَ، نەك لەبەرئەوەی تاوانی تیایەو لە کۆتاییدا نیزام بەسەر نانیزامی هەلەدا سەردەکەویَ (نیزامی رۆشنبیری و کۆمەلایەتی و شەرعی و ئەخلاقی). ئەگەر رۆمانی پۆلیسی سەرسامیی خەلك بوروژینیَ، لەبەرئەوەیە کە بریتییە لە چیرۆکی خەملاندنیك لە بارە تایبەتەکەیدا. بەلام ئایا پشکنینیکی پزیشکی، یان تویژینەوەیەکی زانستی یان پرسیاریکی فەلسەفیی بریتی نییە لە چەند باریکی خەملاندن کە لە بنەرەتدا مەسەلەی فەلسەفە دەردەخات، کە لە

واقیعی مەسەلەکەدا، هەمان شتە لە رۆمانی پۆلیسیدا (هەروەك لە شیکردنەوەی دەروونیشدا وایە): کێ بەرپرسیارە؟ لە پیناوی زانینی ئەمەدا (یان بروابوون بە زانینی ئەمە) دەبێ وای دابنیین کە هەموو رووداویك لۆژیکیك بەریوەی دەبات، ئەوەی کە تۆمەتبار بەسەریدا سەپاندووە. چونکە هەموو بەسەرهاتی تویژینەوەیەك و خەملاندنیك باسی شتیکمان بۆ دەگیرنەوە کە بە بەردەوامی لە تەکماندایە (ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە لە شایەتیدانیکی هایدگیری دەچیت). ئەمەش بە روونی ئەوە لیك دەداتەوە کە بۆچی چیرۆکە بنەرەتییەکە (کێ تاوانبارە؟) لقی لێ دەبیتەوە و دەبیت بە چەند چیرۆکیکی دیکە کە هەموویان چیرۆکی خەملاندنەکانن، کە هەموویان تەوەرە دەبەستن لە دەوری خەملاندن بەو پییەی کە وایە.

جیهانی رووتی خەملاندن بریتییە لە هەلدیر، سێ جۆر هەلدیریش هەن: یەکەمیان توونا‌وتوونی تیزییە *thesee*[٢٤] و، ریگا بە کەس نادات ویڵ بیت. تۆ دەچیتە ناوەوە و دەگەیتە ناوەراست. لە ناوەراستیشەوە روو لە دەریچە دەکەیت. ئەمەش ئەوە لیك دەداتەوە کە لە ناوەراستدا مینۆتۆر *minotaure*[٢٥] هەیەو ئەگەرنا چیرۆکەکە هەموو چیژیك لە دەست دەدات و دەبیت بە تەنها سەیرانیك لە پیناوی پاراستنی لەش ساغی. ئەمە راستە، بەڵام تۆ نەدەزانی دەگاتە کوێ و نە مینۆتۆریش چی دەکا و لەوانەیە تۆقینیش بەرهەم بینێ.

بەڵام ئەگەر بچینە سەر توونا‌وتوونی کلاسیکی، ئەوە داویك، داوی ئەریان[٢٦]، دەکەویتە دەستتانەوە. توونا‌وتوونی کلاسیکی داوی ئەریانەو داوی مرۆڤ خۆیەتی.

بەڵام توونا‌وتوونی دووەم هەلدیریکی دەستکردە: ئەگەر بیخەیتە بەردەستت شتیکتان دەست دەکەوێ لە درەخت دەچیت، لەسەر بنەرەتی شیوەی چەند رەگیك لەنیو چەند دالانیکی داخراودا، کە تەنیا یەك دەریچەی هەیەو لەوانەشە ریگاتان لێ ویل بیت. ئیوە پیویستتان بە داوی ئەریان هەیە بۆ ئەوەی ویل نەبن. ئەم هەلدیرە نموونەیەکە لە ریرەوی هەول و هەلە.

لە کۆتاییشدا تۆر، یان ئەوە هەیە کە دۆلۆز و گاتاری پیی دەلێ (الجذمور *Rhizome*[٢٧]. (جذمور)یش بەو شیوەیە دروست کراوە کە وا لە هەموو ریگایەك دەکا بشیت ببەستریتەوە بە ریگایەکی دیکەوە، نە ناوەندو، نە دەوروبەر و نە دەریچەشی هەیە، چونکە گریمانەیەکی بێکۆتاییە. پانتایی خەملاندن پانتاییەکە لە (جذمور) دەچیت. هەلدیری کتیبخانەکە کە وینام کردووە هەلدیریکی دروستکراوە، بەڵام ئەو جیهانەی کە گیوم تیایدا دەرك بەوە دەکات کە زیندووەو لەسەر شیوەی (جذمور)

بنیاتنراوە: مایەی بە بنیاتکردنە بەڵام هەرگیز بە شێوەیەکی یەکجاری بە بنیاتنەکراوە.

گەنجیکی تەمەن حەڤدە ساڵ گوتی هیچ شتیك لە دایەلۆگە تیۆلۆجیەکان نەگەیشتووە، بەڵام لەلای ئەو شتیك دینیتە ئارا کە لەوە دەچی دریژەی هەلدیری فەزایی بیت (وەك ئەوەی مەسەلەکە پەیوەست بێ بە مۆسیقایەکی تەشویقی لە یەکیك لە فیلمەکانی هیچکۆکدا). لەو بڕوایەشدام شتیکی لەو بابەتە روویداوە: خوینەری ساویلکە هەستی کردووە کە لە بەردەم چیرۆکی هەلدیریکدایە، بە شیوەیەك کە هەلدیرەکان لە سروشتیکی فەزاییەوە نەبووە. سەیرەکە لەوەشدایە کە ئەو خویندنەوەیەی لە هەموویان ساویلکانەتر بووە لە هەموویان "بونیاتگەرانە" ترە. خوینەری ساویلکە بەبێ ئەوەی پیویستی بە نیوانکاریکی ناوەخنی هەبیت، کەوتۆتە پیوەندییەکی راستەوخۆوە لەگەڵ ئەوەی کە دەبێ رۆمانەکەش وەخت ببات بە تایبەتی لە ریگەی چنینەکەیەوە.

ئەگەر رۆمانیك توانیی وەخت ببات ئەوا رەزامەندیی جەماوەر بە دەست دینێ. بەهەرحاڵ، بۆ ماوەیەکی دریژخایەن، بە تیروانینیکی نەریتییەوە تەماشای ئەم رەزامەندییەی کردووە. بۆیە ئەگەر رۆمانەکە بە دلی جەماوەر بوو، ئەوا ئەمە بەلگەیە کە رۆمانەکە شتیکی تازەی نەوتوە. تەنیا بەمەندە وازدینێ کە جەماوەر چاوەریی دەکرد.

لەو بڕوایەشدام جیاوازییەك هەیە لە نیوان وتەی (ئەگەر رۆمانەکە ئەوەی تیابوو کە خوینەر چاوەریی دەکا، ئەوا دەبیتە مایەی رەزامەندیی) و لە نیوان وتەی (ئەگەر رۆمانەکە بە دلی خوینەر بوو ئەوە مانای وایە رۆمانەکە ئەوە دەلی کە خوینەر چاوەریی دەکرد) کەواتە باری دووەم هەمیشە راستەو، ئەوەش بەسە کە دۆفۆ یان بەلزاك تا دەگەینە *Tambour* و *Cent ans de solitude* بینینەوە بیر.

دەکرێ بگوتری هاوکیشەی: رەزامەندی بەهایەکی سلبی، پالپشتی کراوە لە ریگەی چەند هەلویستیکی مشتومرییەوە کە ئیمەی دەستە ٦٣ کەسیەکە وەرمان گرت و، بەلکو پیش ١٩٦٣ش، کاتیك کە کتیبی باشمان بە کتیبیکی بازرگانی و، رۆمانی بازرگانیمان بە رۆمانی چنین دادەنا، لە کاتیکدا کە ئیمە کاری ئەزمونی کە هەرا دەنیتەوە و جەماوەری بەرین رەتی دەکەنەوە پیمان پەسەند بوو. هەموو ئەمانە گوتران و، هەموو ئەمانەش مانایەکی هەبوو. ئەم شتانە خویندەواران و رۆشنبیرانی

وروژاند، کە هەواڵنێرەکان هەرگیز لە بیریان نەکرد، چونکە بە ئەنقەست داڕێژراون بۆ ئەوەی ڕێك ئەم کاریگەرییەی هەبێت، ئەمەش لە ڕێگەی هێنانەوەی نمونەی ڕۆمانە سەرەکیە کلاسیکیەکان، کە ڕەهەندیکی بازرگانیی بەدەر لەهەر سیمایەکی تازەگەریی هەیە، بە تایبەت لە سەدەی نۆزدەهەمدا.

چار نەبوو کە چەند هاوپەیمانیتیەك ساز بدرێ کە هەموو وەسیلەیەکیان تیادا بەکارهێنرا، کە زۆر جاریش تەعبیریان لە چەند شەریکی خێلەکی دەکرد. ئیستاش لەبیرمە کە دوژمنانمان لامبیدۆزاو باسانی و کاسۆلا (*Lampedusa, Bassani, Cassola*) بوون. بەڵام ئیستا من تیروانینیکی تایبەتم بۆ هەریەك لەو سێیە هەیە. لامبیدۆزا ڕۆمانیکی باشی نووسیبوو کە پێش ڕۆژگاری خۆی کەوتبوو، ئیمەش دژی ئەو پەسەندکردنە بووین کە بە دەستی هێنابوو وەك بلیی ڕێچکەیەکی تازەی لە ئەدەبی ئیتالیدا شکاندبێ. لە کاتیکدا ئەو بە پێچەوانەی ئەمەوە ڕێچکەیەکی داخستبوو، هەرچی کاسۆلایە رای خۆم لە ئاستی نەگۆری. لە بەرامبەریشدا زۆر وریام لە ئاست باسانیدا ئەگەر لە ١٩٦٣ بوام، ئەمرۆش بە سنگیکی فراوانەوە وەك هاورییەکی ڕیگا پەسەندی دەکەم. بەڵام هەموو ئەمە پیوەندیی بەو کیشەیەوە نییە کە من لە بارەیەوە دەدویم.

کیشەکە ئەوەیە کە هەموو خەڵك ئەوەیان لەبیرچوو کە ساڵی ١٩٦٥ ڕوویدا کاتیك کە ئەو دەستەیە لیك کۆبوونەوە. ئەوەبوو ئەندامانی دەستەکە لە بالیرمۆ کۆبوونەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کیشەکانی ڕۆمانی ئەزموونی (بە داخەوە کارەکانی ئەو سیمینارە هیشتا لە کەتەلۆگەکانی *Feltrineli*دایە لەژیر ناونیشانی *Ilromanzo Spierimentale* بە دوو میژووی جیاواز: ١٩٦٥ لەسەر بەرگەکە و ١٩٦٦ لە کاتی تەواوبوونی چاپکردنەکەی).

ئەم گفتوگۆیە کۆمەلیك بیروڕای گرنگی تیابوو. سەرەتاکەی ئەو ڕاپۆرتە بوو کە ریناتۆ باریلی (*Renato Barilli*) پیشکەشی کرد و ئەوکات بە تیۆریسینی هەموو ئەزمونگەرانی ڕۆمانی نوێ دادەنرا، بەڵام ئەو وەختە ئەو وشەیە لە ئارادا نەبوو، یان بە لانی کەم لە ئیتالیا لە ئارادا نەبوو لەوکاتەدا کە جۆن بارت لە ئەمریکا هیشتا لە سەرەتادا بوو). باریلی ئاماژەی بە ڕوسیل داوە کە سەرلەنوێ دۆزرابوەوە، بەڵام، ئاماژەی بە بۆرخیس نەداوە، چونکە هیشتا ئیعتباریان بۆی نەگیرابوەوە. کەواتە باریلی چیی گوت؟ گوتی تا سنووری ئەم ماوەیە کۆتایی گریچنەکە بە باشتر زانرابوو بو کار (فعل) لە چرکەساتی پەیدابوونی و لە نەشوەی مادیەتەکەیدا ڕاگیرابوو، لە

**کاتیکدا قۆناغیکی نویٚ لە میژووی گیرانەوە روونـاکی دەبینـیٚ لەتـەك گیرانـەوەی ئیعتبار بۆ کار (فعل)، تەنانەت ئەگەر کارەکە سروشتیکی دیکەشی هەبیت.**

**بەلاٚم من رۆشنایی دەخەمە سەر ئەو هەستانەی کـە شـەوی پیـش سـیمینارەکە دایگرتبووین کە تەماشای کۆلاٚج (*Collage*)یکی سینیماتۆگرافیی سەیرمان دەکرد کە *Griffi, Baruchello* لەژیر ناونیشانی *Verifica incerta* پیشکەشـیان کـرد. مەسـەلەکە پەیوەستە بە چیرۆکیکـەوە کـە لـە پارچـەکانی چـەند چـیرۆکی دیکـەوەو بـارودۆخی کیشـوەریك و بیرۆکـەکانی سـینەمای بازرگانیـەوە پیکـهینرابوو. ئـەوەی وروژاندمـی ئەوەبوو کە جەماوەر لە خۆشییاندا چەند چرکەیەك دەلەنگییەوە کە هـەمان ئەو چەند چرکەیە دەشیا چەند سالیك پیش ئیستا مایـەی هەراسانی بیت، واتـە ئـەو چرکانـەی تیـــایدا خـــۆ بـــە دوور دەگـــیریٚ لـــە ئەنجامـــە لۆژیکیـــەکان و زەمانیـــەکان و چاوەریکردنەکانیشی بە شیوەیەکی ئاشکرا پیشیل دەکریٚ.**

**بزووتنەوەی پیشرەوەکان باوی بوو. ناکۆکیەکان وایان لیهات بۆ چاوو گویٚ ئازیز بن. تەنیا چوختەیەك شیاو بوو: پەسەندنەبوونی (ارسالیة: نـاردە خـوازی) ئیدی وەك پیوەریك نەمایەوە بۆ قسەخوانیی ئەزمونگەری (و سـەبارەت بـە هـەموو هونـەریکیش)، لەبەرئەوەی ناپەسـەندی (لامقبـول) بـوو بـە شـتیکی مایـەی خۆزگـە. دەسـتمان پیکـرد گەرانەوەیـەکی گشـتی بـۆ شیوەکانی پەسـەند و دلخـواز (المقبـول و المحبـب) ببینـین. لیرەدا دەمەویٚ باسی ئەوە بکەم ئەگەر، لە ئیوارە دوارۆژییەکانی مارینیتیدا، جەماوەر لەسەری بووبیٚ فیکە لی بدات (ئەوا ئیستا مەسەلەکە جیاوازە، چونکە ئەو مشتومرەی بە شکستی ئـەزمونیك دادەنـرا کـە پەیوەسـت بـیٚ بـە پەسـەند بوونـی، مشـتومریکی پروپوچ و بیٚ بەرهەمە: مەسەلەکە پەیوەستە بە گەرانەوە بۆ نەخشـەی ئەکسـۆیۆلۆژیی پیشـرەویی میژویـی و، ئەگـەری رەخنـەگری پیشـرەویش، جگـە لـە مارینیتیـەکی[٢٨] دواکەوتوو، شتیکی دیکە نییە.**

**بـا دووبـارەی بکەینـەوە پەسـەندنەبوونی (ارسـالیة: نـاردە خـوازی) لای وەرگـر (متلقي) نەبۆتـە گەرەنتیـەك بـۆ بەهایـەك لـە قۆنـاغیکی میژوویـی دیـاریکراودا نـەبیت. رەنگە لەسـەرمان بیت پشـت لـەو بیرۆکـە پەنهانـە بکـەین کـە بالاٚدەسـتە بەسـەر هـەموو گفتوگۆکانمان و خۆی دەبینیتەوە لەوەی کە هەرای (*Scandale*) بەلگەی راستیی کاری ئەدەبییە. دووانەی سیستەم/ ناسیستـەم، لـە نیـوان کـاریك بـە ئاراسـتەی بـەکاربردن و کاریکی ئیستفزازی، تەنانەت ئەگەر بەهاکەشی لە دەست نەدات، مایەی ئەوەیە کە لە**

گۆشـەنیگایەکی نویـوە چـاوی پیـدا بگیردریتـەوە. لـەو بروایـەدام دەشـیت چـەند توخمیکـی دابریـن (قطیعة) و نـارەزایی (اعتراض) لەوکارانـەدا بدۆزینـەوە کـە بـەکاری ئاسان بەکاربردن دادەنرین: لە کاتیکدا کاری ئیستفزازی هەن کە دژی هیچ شـتیك نین و لەگەڵ ئەوەشدا هیشتا جەماوەر دەوروژینن. لەم رۆژانەدا کەسیکم دی گومان و شك دایگرتبوو لەبەرئەوەی بەرهەمیکی زۆر بەدل بووە) و بەم شیوەیە تا دوایی.

١٩٦٥ سـەرەتاکانی ئـەلبوب ئـاربوو، واتـە ئـەو سـاڵانەی تیـایدا جیاوازییـە کلاسیکیەکانی نیوان هونەری ئەزمونگـەریی ناوینەگـەری (اللاتصویـري) و هونـەری جەماوەریی قسەخوانیی وینەگەری، بەهایان نەما. ئەو ساڵانەیە کـە تیـایدا پۆسـۆر *Pousseur*، کە لەبارەی بیتلـزەوە دەدوا، گوتـی: (ئەوان لـە بـەرژەوەندیی ئیمـە ئیـش دەکەن) بێ ئـەوەی دەرك بەوە بکەن کە لـە پینـاوی خۆیـاندا ئیـش دەکـەن (و کاتـێ بیربرین دەری دەخات هەر کە بیتلز گەیشتە ئەو ئاستەی کە بۆرسیل پیی گەیشت وای لیـهات بتوانـرێ پارچـەکانیان (مقطوعـات) شـان بـە شـانی مۆنتیفـیردی و سـاتی[٢٩] بژەنرین.

## پۆست مۆدیرنیتە، گاڵتەئامیزو دلخواز:

لـە (١٩٦٥)ەوە دوو بیرۆکـە بـە شـیوەیەکی یـەکجاری روون بوونـەوە. دەشـیت گریچنەکە لـە شیوەی حەوالـەکردن بـۆ چـەند گریچنیکـی دیکـە بدۆزینـەوە. دەشـیت حەوالەکردنەکـەش کـەمتر کلاسـیکی و کـەمتر بازرگـانی بیـت لـەو گریچنـەی حەوالـە دەکریتە سەری. (١٩٧٢ جێبەجێ بوونی پیشبینیی بۆمبیـانی سـەبارەت بـە گەرانـەوە بـۆ گریچـن بـەخۆوە دەبینـێ، کـە بـە شـیوەیەکی گاڵتـەئامیز و زۆرزانانـە چـاو خشیندراوەتەوە بە *Ponsn du Terrail* و *Engene sue*، هەروەها کـە هـەندێ لاپـەرەی دۆماس مایـەی وروژاندنـی سەرسامییەکی تیکەل بە کـەمیك گاڵتـەبوو). ئایـا دەکـرێ رۆمـانیکی بازرگـانی بدۆزریتـەوە، جۆریـك لـە ئیشـکالی بیـت و لـە هـەمان کاتیشـدا دلخوازیش بیت؟

تیۆریسـینە ئەمریکیـەکانی پۆسـت مۆدیرنیتـە ئـەم گەرانەوەیـە بـۆ گریچـن و دلنەواییان هیناوەتە دی.

بەڵام بە داخەوە وشەی پۆسـت مۆدیرنیتـە بەسـەر هـەموو شـتیکدا پەسـەند دەبیـت (وەك ئەوە تەماشای پۆست مۆدیرنیتە کراوە کە ئەمریکیـەکان پیشـنیازیان کـرد، واتـە

بەوپییەی گۆتەیەکی ئەدەبییە، نەگ گۆتەیەکی گشتی کە لیۆتار هینابیتی). وا بزانم هەرکەسەو بە کەیفی خۆی ئەم گۆتەیە بەکاردینی.

لە لایەکی دیکەشەوە وا دەردەکەویٚ هەولیك هەیە دەیەویٚ بیباتەوە سەر رابردوو: پیش ئەوە ئەم گۆتەیە تەنها بەسەر هەندیٚ لە نووسەران و هونەرمەندانی سەر بە بیست سالی رابردوو پەسەند دەکرا، بەلاّم وردە وردە وای لیهات بەسەر نووسەرانی سەرەتای سەدەکەش پەسەند دەکرا، پاشان بازنەکەی زیاتر و زیاتر بەرفراوان بوو و بەدووریش نازانریٚ هۆمیرۆس بە پۆست مۆدیرنیتە بزانریت.

لەم بروایەشدام پۆست مۆدیرنیتە ئاراستەیەك نییە کە بتوانین لە رووی کرۆنۆلۆژییەوە دیاریی بکەین، بەلاّم گۆتەیەکی گیانییە یان ریگایەکە لە ئیشکردندا. دەشکری بگوتریٚ هەر قۆناغیك پۆست مۆدیرنیتەی تایبەت بە خۆی هەیە، هەروەها هەر قۆناغیك سەنعەتیکی خۆی هەیە (تەنانەت ئەگەر بشمپرسیبا، ئەگەر پۆست مۆدیرنیتە ناویکی هاودەمی سەنعەت نەبیٚ بەوپییەی گۆتەیەکی میتا میژووییە). وا بزانم لە هەر قۆناغیکدا چەند چرکەیەکی قەیران وەك ئەوەی نیچە لە *Les considerations inactuelles* دا لە بارەی لیکۆلینەوە میژووییەکان باسی کردووە. رابردوو حوکمرانیمان دەکات و شەکەتمان دەکات و تالاّنمان دەکات.

پیشرەویی میژوویی (لیرەشدا وا تەماشای پیشرەو بکە بەو پییەی کە گۆتەیەکی میتامیژووییە) دەیەویٚ حسیبی خۆی لەگەلّ رابردوودا یەکلایی بکاتەوە. ئەم رستەیەی خوارەوە: (بروخیٚ تریفەی مانگ) دروشمی ئایندەگەرەکانە، هەروەها بەرنامەی هەموو پیشرەوەکانیشە، ئەوە بەسە کە شتیکی گونجاو بخەینە شوینی ئەم رستەیەوە. پیشرەویی، رابردوو تیك دەشکینیٚ و دەشیوینیٚ: *Les demoislles davignon*[٣٠] بزاڤیکی چۆنایەتیی ئەمەیە، تەنانەت پیشرەویی لەمەش دوورتر دەروات، پاش ئەوەی وینەکەی تیکشکاند بە یەکجاری ئیلغای دەکاتەوە، دەست لەملانی تەجرید و ناشیوەگەری، تابلۆی سپی و، تابلۆی دراو و، تابلۆی سوتاو دەکا، بەلاّم لە بواری تەلارسازیدا، پیشرەویی دەبیٚ بە نزمترین مەرج بۆ شورەی دیواری "*Curtain wall*" (شورەیەك، بیناکەی لە شیوەی نەسبیکە، هاوتەریبیکی تەواوی لاکیشەکانە، بەلاّم لە ئەدەبدا، ئینسیابیەتی گوتار تیکدەشکینیٚ، بۆ ئەوەی بگاتە کۆلاج بە ریگای بۆروت[٣١] *Burronghs* و، لەسەر سنووری بیدەنگی و لاپەرەی سپی.

لە مۆسیقاشدا سەرەتای رەتبوون لە نادەنگ (لانبرة)ەوە بۆ ژاوەژاو، بۆ بیدەنگیی رەها پیکدینیت (بەم مانایە بیت جۆن کان لە سەرەتاکانیدا مۆدیرن بوە).

رۆژگاریك هات تیایدا پیشرەویی (ئاراستەی مۆدیرنیتە) توانیی زیاتر پیش بکەوێ، چونکە زمانیکی وەسفکەری بەرهەمهینا کە لە بارەی دەقە مەحالەکانی (هونەری چەمکخوازی) دەدوا. وەلامی پۆست مۆدیرنیتەیی لە بارەی مۆدیرنیتەوە لەوەدایە کە دان دەنێ بەوەی ناکرێ رابردوو تیك بشکیندرێ، چونکە ئەمە دەبیتە هۆی بیدەنگی. دەبیت سەرلەنوێ: بە ریگایەکی گالتە ئامیز و غەیرە بەرائەتەوە دیراسە بکریت. ئیستا من بیر لە هەلویستی پۆست مۆدیرنیتە دەکەمەوە کە وەك هەلویستی ئەو پیاوە وایە کە ژنیکی زۆر روناکبیری خۆشویستووەو ژنەکەش دەزانێ ئەو ناتوانێ پیی بلێ: (زۆرم خۆش دەویی) چونکە پیاوەکە دەزانێ کە ژنەکەش دەزانێ (هەروەها ژنەکەش دەزانێ کە پیاوەکە دەزانێ) ئەم رستانە خاتوو باربارا کارتلاند نووسیویەتی. لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەریك هەیە، وەك ئەوەی بە ژنەکە دەلێ: (زۆرم خۆش دەویی، هەروەك باربارا کارتلاندیش وا دەلێ). بەم شیوەیە ئەو پیاوە، کە خۆی لە بەرائەتیکی ساختە بەدوورگرتووە، بە روونی گوتی ناکرێ ئیمە بە بەرائەتەوە بدویین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی بەو ژنەی گوت کە دەیویست پیی بلێ خۆشی دەوێ، ئەو لە قۆناغیکیشدا خۆشی دەوێ کە تیایدا بەرائەت ون بوە. ئەگەر ژنەکە دەستی لەگەڵ تیکەلاو بکات، ئەوا ئەوەی پیاوەکە گوتویەتی ژنەکە بە ئاشکراکردنی خۆشەویستیەکەی دادەنیت و، هیچ یەکیکیشیان هەست بە بەرائەت ناکەن. هەردووکیشیان تەحەدیی رابردوویان قبول کرد، واتە پیش ئەوەی بگوترێ، ئەوەی کە ناکرێ لە حسابی خۆماندا رەتی بکەینەوە. هەردووکیشیان بە هوشیاری و گالتەوە گەمەی گالتەخوازی دەکەن. بەلام هەردووکیان، جاریکی دیکەش سەرکەوتوو بوون لە قسەکردن لە بارەی خۆشەویستیەوە.

مەسەلەکە پەیوەستە بە گالتەخوازی و زمانیکی وەسفکەر و گۆکردن (تەلەفون)یکی دووقات. ئەمەش مانای وایە، لە حزوری گەردوونی مۆدیرنەدا، ئەگەر تۆ لە گەمەکە نەگەیت، ئەوا بە زەرورەت لەسەرتە رەتی بکەیتەوە. بەلام لەگەڵ پۆست مۆدیرنیتەدا، رەنگە ئیمە لە گەمەکە نەگەین، بەلام بە جدیەتەوە تەماشای شتەکان دەکەین. کە ئەمەش لە لایەکی دیکەوە بریتییە لە جیاکەرەوەیەکی (موجازەفە)ی گالتەخوازی. کەسانیك هەن هەمیشە ئامادەن بە جدییەوە تەماشای گالتەخوازی بکەن. وا بزانم ئەو کۆلاجەی بیکاسۆو خوان گریس و براك پیشکەشیان کرد کۆلاجیکی مۆدیرن بوو، بۆیە

کەسانی ئاسایی رەتیان کردەوە، لە بەرامبەریشدا، ئەو کۆلاجەی ماکس ئەرنست کردی، واتە ئەو مۆنتاجەی تایبەت بە چەندین پارچە لە داتاشراوەکانی سەدەی نۆزدەهەم، سەر بە پۆست مۆدیرنیتە بوو. هەروەها دەشتوانین وا تەماشای بکەین کە چەند قسەخوانیکی فانتاستیکین و، چەند قسەخوانیکی خەونئامیزن، بەبێ ئەوەی ئاگامان لەوە بیت کە بریتییە لە گوتاریك لە بارەی داتاشین و رەنگە لە بارەی کۆلاج خۆیشیەوە.

ئەگەر ئەمە سروشتی پۆست مۆدیرنیتە بیت، ئەمە ئەوە لیك دەداتەوە کە دەکرێ (ستیرن) یان (رابلیە) پۆست مۆدیرنیتە بن، هەروەها ئەمە ئەوەش لیك دەداتەوە کە بۆچی بۆرخیسیش وا نەبوو، بۆچی دەکرێ لە ناخی هەر هونەرمەندیکدا پیکەوە بژین یان بە خیرایی بە دوای یەکدا بین یان چرکەساتی پۆست مۆدیرنیتە ئالوگۆر بکەن. تەماشای جویس بکەن، پۆرتریت چیرۆکیکی هەولی مۆدیرنیتەیە. بەڵام *Les Dublners* مۆدیرنتر بوو لە "*Les Portrait*"، ئەگەرچی لە رووی زەمەنیەوە پیشی ئەویشە. کەچی یۆلیسیس لەو نیوانەدایە. لە کاتیکدا *Fi nnegans wake* بە پۆست مۆدیرنیتە دادەنرێ، یان بە لانی کەمەوە گوتاری پۆست مۆدیرنیتەیی لەخۆگرتووە، بۆیە بانگ دەکرێ تا تیبگات، لیکۆلینەوەیەکی نوییە لە بارەی گالتەخوازیەوە کە ئەوەی پیشوو رەت ناکاتەوە.

هەر لە سەرەتاوە، نزیکەی هەموو شتیك لە بارەی پۆست مۆدیرنیتەوە گوترا (واتە ئەوەی گوترا لە چەند هەولیکدا وەك: "ئەدەبی شەکەتی *La litterature de lapuisement*"ی جۆن بارت، کە لە سالی ١٩٦٧دا دەرچووە و بەم دواییە لە ژمارە (٧)ی *Calibano*ی تایبەت بە پۆست مۆدیرنیتەی ئەمریکی چاپکراوە). ئەمەش مانای وانیە کە من کۆکم لەگەڵ ئەو ریزلینانە باشەی کە تیۆریسینانی پۆست مۆدیرنیتە (بە جۆن بارتیشەوە) پیشکەش بە نووسەران و هونەرمەندانی دەکەن و هەروەها ریگای دیاریکردنیشیان بۆ ئەو کەسەی سەر بە پۆست مۆدیرنیتەیە و ئەو کەسەش کە وانییە.

ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەو پوختانەن کە تیۆریسینانی ئەو ئاراستەیە لە پیشەکیەکانیانەوە هەلیانهینجاوە: (بە بۆچوونی من نووسەری پۆست مۆدیرنیتەی نمونەیی لاسایی کەس ناکاتەوە، نکولیش لە باوانی لە سەدەی بیست و باپیرانی لە سەدەی نۆزدەهەم ناکات. ئەو مۆدیرنیتەی هەرس کردووە، بەڵام وەك باریکی قورس

نایخاتە سەرشانی. ڕەنگە ئەم نووسەرە خەون بە گەیشتنە ئارەزوومەندانی جیمس میشێنرو ئەرفینگ والاسەوە نەبینێ، بەبێ ئەوەی قسە بکەین لەسەر ئەو نەخوێندەوارانەی هۆیەکانی گەیاندنی جەماوەری، گیلی کردن، بەڵام خەون دەبینێ بە گەیشتن بە (یان بەلانی کەم هەندێ جار) خەریك کردنی جەماوەریکی بەرینتر لە ئەلقەی ئەوانەی کە تۆماس مان ناوی نابوون مەسیحییە بەراییەکان، دلسۆزانی هونەر. ڕۆمانی سەر بە پۆست مۆدێرنیتە لەسەریەتی لە ململانیی نیوان واقیعی و ناواقیعی، نیوان شێوەگەری و ناوەرۆکگەری، ئەدەبی رووت و ئەدەبی مولتەزیم، قسەخوانیی دەستەبژێرو قسەخوانیی جەماوەر بەولاوەتر بچێت. لەم بوارەدا پیم باشترە بە جازی باش یان مۆسیقای کلاسیکی بپیورێ: لە کاتی گوێ بیست بوون یان دیراسەکردنمان بۆ دابەشکردنیك، بریکی زۆر دەدۆزینەوە کە لە سەرەتادا سەرنجمانی بۆ خۆی ڕانەکیشاوە، کەچی دەزانێ هەر لە سەرەتاوە چۆن خۆشیت پێبدات تا ئەو رادەیەی هانت دەدات سەرلەنوێ گوێی لێ بگریتەوە، ئەمەش بۆ پسپۆران ڕاستە هەروەك بۆ تازە دەست پیکردووانیش ڕاستە) (جۆن بارت لە سالی ١٩٨٠دا سەرلەنوێ لەژێر ناونیشانی "ئەدەبی پڕبوون *La litteraturede la Plenitude* باسی ئەم بابەتەی کرد").

بە دلنیاییەوە دەکرێ ئەم گوتارە بە ڕێگایەکی موفارەقە دابڕیژریتەوە، کە ئەمەش لیسلی فیدلەر لە لیکۆلینەوەیەکدا سالی ١٩٨١ و، لە مونازەرەیەکی تازەشدا لە بارەی *Salmagundi* لەگەڵ چەند دانەریکی دیکەی ئەمریکیدا کردوویەتی. هەلبەت فیلدەر مایەی ئیستفزاز بوو. سەربەرزی دا بە[٣٢] *Le dernier des mohicans*، هەروەك سەربەرزیشی دا بە قسەخوانیی سەرەرۆییەکان و قوتی، هەموو ئەو تۆپەلە نووسینانەی ڕەخنەگران ڕقیان لیی هەلگرت، کە ناسرابوو چۆن خۆی بە ئەفسانە دەورە داوەو لە خەیالی پتر لە نەوەیەکدا ڕوینران.

فیلدەر پرسیی: ئایا ڕۆمانیکی وەك ڕۆمانی[٣٣] *La case de loncle tom* بە هەمان گەرمیەوە لە مەتبەق و لە سالۆن و لە ژووری منداڵاندا دەخوینیەوە ئەگەر سەرلەنوێ چاپ بکریتەوە؟ شکسپیر و هەروەها ڕۆمانی "ذهب مع الريح" شان بە شانی ئەوانە دانراون کە دەیانزانی چۆن وەخت بکوژن. ڕەخنەگریکی کارامە بوو، ئەمە گومانی تیدا نییە، هەمووشمان دەزانین ڕەخنەگریکە چیژیکی بەرزی هەیەو زەحمەتە بروای پێ بکرێ. ئەو تەنیا دەیویست ئەو بەربەستەی لە نیوان هونەر و لوتف دا هەیە بیرمینێ. ئەو بەشیوەیەکی ورد دەرکی بەوە کردبوو کە مەسەلەی دانانی کاریگەری بەسەر جەماوەریکی بەرین و داگیرکردنی خەونەکانی، لەوانەیە ئەوە بن کە لە ڕۆژگاری

ئیستادا پیی دەلیین پیشرەوی. ئەمەش ئەو ئازادیەمان پیّدەدا کە بلیین داگیرکردنی خەونەکانی خوینەر بە زەرورەت بەلگەیەك نین بۆ ختوکەدانی. لەوانەیە مانای راوەدوونان و شەکەتکردنیشی بدەن.

**١٢) رۆمانی میژوویی:**

دوو سال دەبیت ئەوەم رەت کردۆتەوە کە وەلامی چەند پرسیاریك بدەمەوە، لە جۆری: ئایا ئیشەکەت بە ئیشیکی کراوە دادەنریّ؟ چوزانم، ئەوە گرفتی ئیوەیەو گرفتی من نییە. یان لە جۆری: کام کەسیتی لیتەوە نزیکترە؟ خوایە، کامەیە ئەو کەسیتیەی لەگەلّ دانەردا دیتەوە؟ هەلبەت لەگەلّ هەلومەرجدا (*adverbes*). بەلام لە هەموو پرسیارەکان هیچتر ئەوەبوو کە دەلیّ: ئایا راستە گیرانەوەی رووداوەکانی رابردوو راکردنە لە ئیستا؟ وەلامەکەی منیش: لەوانەیە، خۆ ئەگەر مانزۆنی لە بارەی رووداوەکانی سەدەی حەڤدەهەم دووابیت، لەبەرئەوە بووە کە سەدەی نۆزدەهەم ئەوی نەوروژاندووە. گویستی لە رۆمانەکەیدا *SantAmbrigio* ئەو شتانە بۆ نەمساییەکان دەگیریتەوە کە تایبەتن بە قۆناغەکەی، لە کاتیکدا رۆمانی *Guiramento de Pondil*ی بیرشیت قسەی لەسەر خورافیاتی رابردوو دەکرد. *Love story* زادەی سەردەمی خۆیەتی، کەچی *La chartreuse de parme*[٣٤] ئەو رووداوانە دەگیریتەوە کە ٢٥ سالە روویانداوە.

چ سودیکی هەیە کە بگوتریّ گرفتەکانی ئەوروپا، کە ئیستا تیایاندا دەژین، لە سەدەکانی ناوەراستدا پەیدابوون، هەر لە دیموکراسیەتی گروپەکانەوە تا ئابووریی بانقەکان و، لە شانشینە نیشتمانیەکانەوە بۆ شارەکان، لە تەکنەلۆژیای مۆدیرنەوە تا شۆرشی جوتیاران. سەدەکانی ناوەراست ئەو منداڵییەمانە کە دەبیّ بەردەوام بۆی بگەرێینەوە تا یادەوەریمان بپاریزین. بەلام لە تواناشدا هەیە بە ریگاکەی ئیکسیکالیبۆر *Excalibur*[٣٥] قسە لەسەر سەدەکانی ناوەراست بکەین.

بەوپییە، دەبیّ لە چەند شتیکی دیکەدا بە دوای گرفتەکەدا بگەرێین، کە گرفتیکە ناکریّ خۆی لیّ بەدوور بگیریّ. کەواتە چ مانایەکی هەیە کە رۆمانیکی میژوویی بنووسین؟ وا بزانم گیرانەوەی رووداوەکانی رابردوو سیّ ریگای هەیە. ریگای یەکەم رۆمانسە *Romance*[٣٦] کە لە خولی برۆتۆنیەوە دەست پیّدەکات بۆ چیرۆکەکانی تۆلکیان *Tolkien*، کە تیایدا "رۆمانی قوتی"، کە هیچ پیوەندیەکی بە رۆمانەوە نییەو

**بەڵام پیوەندییەکی پتەوی بە رۆمانسەوە هەیە، دەدۆزینەوە. لەم بارەدا رابردوو لەسەر شیوەی سینۆگرافیا، یان بنیاتنانی هەقایەتیك کە جلەو شل بکات بۆ جۆرەها خەیال، لە بەردەمماندا دەردەکەویت. خەیالی زانستیش لەلای خۆیەوە زۆربەی جار بە رۆمانس دادەنری. رۆمانسیش هەقایەتی شوینیکی دوورە.**

**پاش ئەوە رۆمانی ئەسپ سواری دیت هەروەك لەگەڵ دۆماس دا وایە. رۆمانی ئەسپ سواری رابردوویەکی واقیعی کە دەکریَ بناسریت، بۆ خۆی هەڵدەبژیریَ: بۆ گەیشتن بەمەش، پری کردووە لەو کەسیتییانەی شوینی خۆیان لە ئینسکلۆپیدیادا هەیە (ریشولیو، مازاران) و، هەروەها پری کردووە لەو کەسیتییانەی چەند کاریك (چاوپیکەوتن لەگەڵ میلیدی، سازکردنی چەند دیداریك لەگەڵ ئەوەی پیی دەلین بۆناسیۆ) دەکەن کە لە ئینسکلوپیدیادا بوونیان نییەو بەڵام لەگەڵیدا ناکۆك نین.**

**لە پیناوی پشتیوانیکردنی مۆرکی واقیعیانە، کەسیتییە میژووییەکان (بە دەست تیکەڵوکردن لەگەڵ هستۆگرافی) هەمان ئەو کارانەیان پیَ دەسپیردریت کە لە رووی میژووییەوە کردوویانە (ئابلوقەدانی لاروشیل، پیوەندیی پتەو لەگەڵ ئانی نەمساییدا، چەند کیشەیەك لەگەڵ لافروند). کەسیتییە خەیالییەکان لەم چوارچیوە "راستەقینە"یەدا دەئاخنرین. بەڵام ئەم جۆرەی دواییان دەربری هەستیکە کە لەوانەیە هەستی چەند کەسیتییەکی ئەو قۆناغە بیت. ئەوەی دارتانیون لە چرکەساتی گیرانەوەی مروارییەکان بۆ لەندەن دەیکات، کاریکە مایەی ئەنجامدانە لە سەدەی شازدەهەمدا، هەروەك دەکریَ لە سەدەی هەژدەهەمیشدا ئەنجام بدریت. پیویست بەوە ناکا لە سەدەی حەڤدەهەمدا بژین بۆ ئەوەی هەمان دەروونی دارتانیونمان هەبیت.**

**لە بەرامبەریشدا پیویست بەوە ناکات چەند کەسیتییەك لە رۆمانی میژووییدا هەبن کە دەکریَ لە ریگەی ئیسنکلۆپیدیای هاوبەشەوە بناسرین. ناودارترین کەسیتی لە *Les Fiances*دا، کاردینال فیدیریگۆیە، کە پیش مانزونی بە فراوانی نەناسرابوو (بەڵام کەسیتییەکەی دیکە، سان شارل، ناودارتر بوو)، بەڵام هەرچیەك لوسیا، یان فراکیستوفۆرۆ دەیکات ناکریَ جیبەجیَ بکریَ لە لامباردیای سەدەی حەڤدەهەم نەبیت). جوڵانەوەی کەسیتییەکان لە پیناوی تیگەیشتنیکی باشتر لە میژوو و، ئەوەی رابورد، بەکاردەهینریَ و سەرەرای ئەوەی بە دروستکردن دروستکراوە، بە روونییەکی بیَوینەوە، باسی ئیتالیای ئەو قۆناغە دەکات زیاتر لەوەی کە کتیبەکانی میژوو لە بارەیەوە دەیلین.**

بەو مانایە بە دلنیاییەوە حەزم لە نووسینی رۆمانیکی میژوویی بوو، نەك لەبەرئەوەی ئاوبارتان یان میشال بە راستی هەبوون و بە راستیش ئەوەیان گوتووە کە گوتیان، بەلام لەبەرئەوەی هەموو ئەوەی ئەو کەسیتییانە گوتیان و لە نیوانیشیاندا گیوم، دەکری لەم قۆناغەدا بگوترین.

نازانم تا چ رادەیەك لەو بوارەدا بەوەفا بووم، لەو بروایەشدا نیم دریغیم کردبی کە هەندی شایەتیی دانەرانی پیشووی (وەك فیتگنشتاین)م تی دەخزاندە ناوی، بۆ ئەوەی ئەو وەهمە بدەمە خوینەر کە ئەو شایەتییانە سەر بەو قۆناغەن. لەو بارەشدا دەمزانی کەسیتییەکانی سەدەکانی ناوەراستم ئەوانە نین کە تازەن، بەلام ئەوانەی سەر بە سەردەمی تازەن ئەوان بوون کە بە ئەقلیەتی سەدەکانی ناوەراست بیریان دەکردەوە.

لەگەل ئەوەشدا هەندی جار من دەپرسم: ئایا توانای ئەوەم نەداوە بە کەسیتییەکانم کە بە شیوەیەکی سەراپایی بیروڕای سەدەکانی ناوەراست کۆبکەنەوە، بە سەرچاوەگرتن لە کۆمەلیك خورافەی چەمکخوازی کە ئەگەر لەم بارەی خۆیاندا بیانهیلمەوە، ناتوانم بیانناسم بەو پییەی کە سەر بە سەدەکانی ناوەراستن. بەلام وابزانم رۆمانی میژوویی لەسەریەتی ئەمەش بکات: لەسەریەتی ئەو هۆکارانە دیاری بکات کە لە رابردوودا لە پشت ئەوەوە بوون کە دواتر روویداو، هەروەها ئەو ریرەوەش کە بە شیوەیەکی سست لە ریگەی ئەوەوە گەشەی کردو ئەم کاریگەرییەی رووداوەی دروست کرد.

ئەگەر کەسیتییەك لە کەسیتییەکانم دوو بیرۆکەی سەر بە سەدەکانی ناوەراستی بەراورد کرد بۆ ئەوەی بیرۆکەی سییەم کە مۆدیرنترە هەلبهینجی، ئەوا ئەوەی کردووە کە پاشان کولتور دەیکات. ئەگەر هیچ کەسیك ئەوەی گوتویەتی هەرگیز نەنووسیتەوە، ئەوە بە دلنیاییەوە کەسیکی دیکە هەیە بیری لی کردبیتەوە ئەگەر بە شیوەیەکی تیکەل و پیکەلیش بیت (تەنانەت ئەگەر لە ترسان یان لە شەرمەوە ئەمەشی نەگوتبی).

لە هەموو بارەکاندا شتیك هەبوو زۆر بە دلم بوو: هەرچەندەی رەخنەگریك یان خوینەریك گوتبیتی یان نووسیبیتی کە کەسیتییەك لە کەسیتییەکانم ئاماژە بۆ چەند شتیکی مۆدیرن دەکات، ئەوە لە واقیعدا ریك لەم بارانەدا چەندین شایەتیم لە سەدەی چواردەهەم هیناوەتەوە.

چەند برگەیەکیش هەن و خوێنەر لەزەتی زۆری لێ بینیون کە لەسەر سەدەکانی ناوەڕاستی حسیب کردوون، لە کاتێکدا من بە شێوەیەکی قاچاخ بە مۆدێرنم داناون. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە هەر خوێنەرێك بیرۆکەی تایبەتی خۆی لە بارەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەیەو، زۆربەی جار ئەم بیرۆکانەش ناڕاستن. تەنیا ئێمەین، ڕەبەنی ئەو ماوەیەین، ڕاستیەکە دەزانین، بەڵام ئەگەر بیلێین، ئەوە بەرەو توون پەلکێشمان دەکات.

### کۆتایی

دوو ساڵ پاش دەرچوونی ئەم ڕۆمانە هەندێ سەرنجم دۆزییەوە کە مێژووی ١٩٥٣ی پێوەیە: (هوراس و برادەرەکەی هانا بۆ کۆنت "ب" دەبەن لە پێناوی هەڵهێنانی مەتەڵی تارماییەکە. کۆنت "ب" کەسێکی ڕووخۆش و سەیر و تەنبەڵە. لە بەرامبەریشدا کاپتنێکی گەنج هەیە سەر بە پاسەوانیی دانیمارکییەو پەنا بۆ وەسیلە ئەمریکییەکان دەبات. ڕووداوەکان بە شێوەیەکی سروشتی و بە گوێرەی نەخشەیەکی تراژیدی گەشە دەکەن. لە دوا دیمەنیشدا کۆنت "ب" پاش ئەوەی خیزانەکەی کۆدەکاتەوە مەتەڵەکە هەڵدێنێ: تاوانبارەکە هاملیتە. تازە بەسەرچوو، هاملیت مرد).

چەند ساڵێك پاش ئەوە، بۆم دەرکەوت شارلستۆنیش بیرۆکەیەکی هەبووە لەمە چووەو، واش پێدەچێ گروپی ئۆلیبۆ *L oulipo*[٣٧] بەم زووانە نەخشەیەکی کێشابێت بۆ هەموو دۆخە پۆلیسییە شیاوەکان و بۆشم دەرکەوت ئەوەی ماوەتەوە نووسینی کتێبێکە: کتێبێك کە خوێنەر تیایدا بکوژە.

### ئامۆژگارییەك:

چەند بیروڕایەك هەن بیرکردنەوەمان دەکەن بە هی خۆیان و هەرگیز بیروڕای شەخسیش نین، کتێبەکان لە نێوان خۆیاندا دەدوێن و، لێکۆڵینەوەیەکی پۆلیسی قووڵیش دەری دەخات کە تاوانبارەکان خۆمانین.

### پەراوێزەکانی پێشەکی

١-وەرگێرانە فەرەنسییەکە: *Grasset Fasquelle, 1982*

٢-چاپی ئیتالی: *Alfabeta 49, juin 1983*، بەڵام چاپە فەرەنسییەکە دوو ساڵ پاش ئەمە لە ساڵی ١٩٨٥دا لە دەزگاکەوە دەرچوو لەژێر ناونیشانی: *Umberto Eco: Apostille AUNOM DE LA ROSE, ed Grasset, 1985*

٣-سەیری کتیبەکەی Interpretation et surinterpretatio ed PUF, Paris 1996 بکە.

## پەراویزەکانی ناوەڕۆک (وەرگیری عەرەبی دایناون)

*لە دەقەکەدا بە ئینگلیزی هاتووە.

١-بەیتە شیعرەکە بە لاتینییەو بەویش رۆمانەکە کۆتایی پیّهاتووە:

Stat rosa Prstina nomine, nomona nuda tenemus وەرگیرانە کوردییەکەشی (بە پشت بەستن بە وەرگیرانە عەرەبیەکە) بە نزیکی ئەمەیە: (ناوی گوڵی بەسەرچوو هیشتا ماوە، لە گوڵەوە وشەی رەوان هەلدەهینجین).

*مەسەلەکە بەندە بە یەکەمین دارشتنی رۆمانی "دەزگیراندارەکان Les Fiances"ی ئەلساندرۆ مانزۆنی (ئەم پەراویزە وەرگیری عەرەبی دایناوە لە ئیتالیەوە).

٢-ڤیلۆن Francois Villon: شاعیریکی فەرەنسییە لە سەدەی پازدەهەم ژیاوە. ژیانی پربووە لە سەرەرۆیی و هاوژیانی سەعلوك و تاوانباران بوە، هەروەها هاورییەتی خانەدانەکان و کەسیتییە مەزنەکانیشی کردووە. هەندیّ خانەدان چەندین جار لە سەرپەراندن (میقسەلە) دەربازیان کردووە. لە کارەکانی . هەروەها هەندیّ کەس بە گەورەترین رەوانبیژیان داناوە، هەندیکی دیکەش بە یەکەمین شاعیری سەر بە مۆدیرنیتەیان داناوە.

٣-(برنار) و (ئەدزۆ) و (گیوم) سیّ کەسیتیی سەرەکین لە رۆمانی "ناوی گوڵ"ی ئەمبرتۆ ئیکۆدا.

٤-بۆ زیاتر قووڵبوونەوە لەم کیشەیە بگەریوە بۆ کتیبەکەی ئەمبرتۆ ئیکۆ Ed puF, 1996 interpretation et surinterpretation کە وەرگیری عەرەبیی ئەم باسە (د. سەعید بەنەکراد) وەری گیراوەتە سەر زمانی عەرەبی لەژیر ناونیشانی: التأويل بين السيميائيات و التفكيكية، المركز الثقافي العربي، بيروت، الدار البيضاء، ٢٠٠٠.

*لاپەرە ٤٨٥ لە چاپی: La livre de poche (پەراویزی وەرگیر لە ئیتالییەوە).

٥-لە دەقەکەدا بە ئینگلیزییە.

٦-دوو کەڤالی میکایل ئەنجیلۆن و هەردووکیان مەسیح و دایکەکەی دەنوینن لە باریکدا کە هەموو مایەی ئازارە. وشەی (Pieta)ش ئاماژەیە بۆ پاکیزە لە باریکی ئازار و نالیندا جەستەی مەسیحیشی لەنیو دەستدایە.

٧-Huysmans ویسمانس (١٨٤٨-١٩٠٧) نووسەریکی فەرەنسیی بە رەگەز هۆلەندییە، لە پاریس ژیانیکی پر مەترسی و یاخی بوونی بەسەر بردووە. شتی زۆری لەسەر ئەم شارە نووسیوە، یەکیك

لەوانە رۆمانەکەیەتی: *Las- bas* کە ئیکۆ لیرەدا ئاماژەی بۆ دەکا، تیکر ای ئاماژەکەش ئەو ماوەیە دەردەخات کە ئیکۆ لە پاریسدا، کاتیك کە خویندکار بووە، بەسەری بردووە.

٨-*Cluny*: دیریکە لە فەرەنسا دۆق (گیوم داکیتان) لە ٩١٠ی زایینی دایمەزراندووە. ئەم دیرە بەوە ناسرابوو کە سەربەخۆ بووە لە خانەدانەکان و قەشەکانیش لە یەك کاتداو، پیوەندیی راستەوخۆی لەگەڵ پاپا لە رۆما هەبووە. رەبەنەکانی ئەم دیرە جۆریکی تایبەتی ژیان و چەندین داب و نەریتی کولتوری و تەلارسازییان هەبووە و تەنانەت سیفەتی کلۆنیزییەکان دراوەتە پاڵ رەبەنەکانی.

٩-بازیلیك *basilic* چەند خشۆکیکی خورافی بوون، باوەر وابوە کە توانای کوشتنیان هەبووە لە ریگەی چاوتیبرینە قوربانیەکەیان.

١٠-پریڤۆ *Prevot* (١٦٩٧-١٧٦٣) رۆماننوسیکی فەرەنسییە، ماوەیەکی زۆر لە نیوان هۆلەنداو ئینگلتەرادا ژیاوە، دواجار لە پاریس گیرساوەتەوە، بۆ ئەوەی کۆمەلیك کتیب بنووسێ لەوانە: رۆژانەو سەرەرۆییەکانی پیاویکی گرنگ.

١١-ئۆکام *Occam Guillaumed* (١٣٤٩..) کاهین و فەیلەسوفیکی ئینگلیزییە سەر بە فەرەنسیسکییەکانە. دریژەی بە خویندنەکەی داوە لە ئۆسکوفۆرد و پاریس و ساند میشال و سیزانا دژی پاپای بیست و دووەم لە بارەی مشت و مری تایبەت بە: ئایا مەسیح هەژار بووە؟ پاشان دەربەدەرکراو هەلات بۆ بیزا، سەر بە قوتابخانەی (الاسمیة: ناوگەری) بووە، دانی بە مەعریفەدا نەناوە جگە لەوەی لە ریگەی وردبوونەوەی ناوەکی یان دەرەکییەوە دیت.

١٢-تاتۆ *Tatou* ئەرمەدیل، لە رەگەزی ئاژەلە زریدارە میرووله خۆرەکانە.

١٣-*Fraticelle* هەرتۆقییەکان: دەستەیەك هەرتۆقیی (تازەگەر)ی سەدەی سیازدەهەمین، لە ئاراستەی فرانسیسکییەوە داکەوتوون. بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەوان پیت بە پیت رینماییەکانی قەدیس فرانسوا داسیز پیرەو دەکەن.

١٤-فرانسیسکیزم: رینماییەکانی قەدیس فرانسوا داسیزن کە بە: "هەژارە بچکۆل" ناسراوە، کە پیاویکی ئیتالییەو لە ئەسیز سالی ١١٨٢ لەدایك بووەو سالی ١٢٢٦ مردووە. دامەزرینەری ئەو ئاراستەیەیە کە دەلێ: مەسیح هەژار بووە، بەمەش خەباتی کردووە دژی دەولەمەندیی لە رادەبەدەری کەنیسە لە سەدەکانی ناوەراستدا.

١٥-ئۆکامییەکان، واتە ئەوانەی سەر بە ریبازی ئۆکامن (تەماشا پەراویزی "١١" بکە)

١٦-*Benedictin* بیندکین: رەبەندیکی لایەنگری قەدیس بەنوا دو وۆرسیزە. ئەم ئاراستەیە هەژموونی خۆی بەسەر کۆمەلیکی زۆر لە دیرەکان لەوانە دیری کلۆنی، سەپاند (تەماشای پەراویزی "٨" بکە).

١٧-*Pieta* بنەچەی وشەکە (*Pitie*)ە کە مانای بەزەیی و لیبووردن دەدات. لە بنەرەتیشدا کۆمەلیك کەڤال و تابلۆن، پاکیزە دەنوینن، کە جەستەی مەسیحی، دوای لەخاچکردنەوەی، خستۆتە سەر ئەژنۆی.

ئەمەش لە قسەکانماندا لە بارەی کەڤالەکانی میکایل ئۆنج، کە دوا دوایی ژیانی سێ کەڤالی داتاشیوەو هەموویان ناوی (*Pieta*)یان هەلگرتووە، ئاماژەمان پیدا.

١٨-باوئۆباب: داریکی ئیستوائییەو قەدەکەی پانەو بەرەکەی ناویکی تیایە دەخورێ.

١٩-*Tercet* کۆپلە شیعریکە لە سێ برگەی *Hendecasyllabe*: بەیتە شیعریکە لە یازدە برگە پیکهاتووە.

٢٠-*Comptine* عدیة: گەمەیەکی منداڵانەو بریتییە لە دیاریکردنی ئەوەی کە سەرەی کییە.

*ئاماژەیە بۆ دوو برگەی ناودار *des Finces de manzoni* (پەراویزی وەرگیری عەرەبی، لە ئیتالیەوە).

٢١-*Rubato* ریگەیەکە بۆ ژەندنی برگەیەکی مۆسیقی، جیاکەرەوەکەی ئەوەیە کە ئازادییەکی زۆر دەدا بە مۆسیقاژەن لە ژەنینی مۆسیقادا.

٢٢-نۆستراداموس *Nostradamus* (١٥٠٣-١٥٦٦): پزیشك و فەلەکناسیکی فەرەنسییە بە کتیبە تاییەتەکەی ناسرا کە وتەیەکی زیادەرۆیی تیایە: *michel de notre- dame centuries astrologiques*.

٢٣-*Alessandro Manzoni* مانزۆنی (١٧٨٥-١٨٧٣) نووسەریکی ئیتالییەو لە خیزانیکی دەولەمەندی سەر بە خانەدانەکانە. کۆمەلیك قەسیدەی شیعریی نووسیوە. پاشان بە ئیلهام وەرگرتن لە کەلەپوری مەسیحی، دەستی بە نووسینی رۆمانی میژوویی کردووە: یەکیك لەو رۆمانانە: *Ies cinq mai 1821*

٢٤-*Thesee* تیزی: پالەوانیکە لە میتۆلۆجیای گریکی، ئەفسانەکە وا باسی دەکا کە پالەوانیکی دیرینەو لە هەموو سوچیکدا جەنگیوەو بەگژ هەموو درندەیەکدا چۆتەوە. سەفەری دورگەی (کریت)ی کردووە بۆ ئەوەی درندەیەك بکوژێ کە ئەهلی دوورگەکە، بۆ خۆلادان لە شەری، حەوت کچ و حەوت کوریان وەك قوربانی پیشکەش دەکرد. لەوێ عاشقی ئاریان دەبێ و دەیخوازێ (تەماشای پەراویزی "٢٦" بکە).

٢٥-*Minotore* مینۆتۆر: درندەیەکی گەورەی (کریت) بووە، جەستەی مرۆڤ و سەری گای هەبووە، تیزی بە یارمەتیی ئەریان کە تۆپەلیك دەزووی بۆ راکیشاوە تا لەنیو هەلدیرەکاندا ریگا ویل نەکات، کوشتویەتی.

٢٦-ئەریان *Ariane*: کەسیتییەکە لە میتۆلۆجیای گریکی، کچی مینۆسی شای (کریت)ە، تیزیی خۆشویستووە کە هاتۆتە دورگەکە بۆ ئەوەی مینۆتۆری دەورەدراو لەنیو هەلدیردا بکوژێ. ئەریان شمشیریك و تۆپەلیك دەزوی پیداوە تا ریگاکەی ون نەکات.

٢٧-*Rhizome* الجذمور: روەکیکە لەژیر زەویدا پەلداوێ و چەندین خونچەی هەیەو رەگیکی زۆر بەیەکداچوو لەژیر زەویدا بەرهەم دینێ.

٢٨-*Tommaso Flippo (marinetti)* مارینیتی: نووسەریکی ئیتالییە بە هەردوو زمانی فەرەنسی و ئیتالی دەینووسی و بە یەکیك لە ئایندەخوازەکان دادەنریت. بیروراکانی بە روونی لە بەیاننامە ئایندەخوازیەکەیدا دەرکەوت:

*Le manifeste technique de leLetterature Futuriste*

٢٩–*monteverdi* (١٥٦٧–١٦٤٣): مۆسیقاژەنیكی ئیتالیە.

ساتی *Satie* (١٨٦٦–١٩٢٥): مۆسیقاژەنیكی فەرەنسییە.

٣٠–*Les demoiselles d'Avignon*: تابلۆیەكە بیكاسۆ لە سالی ١٩٠٧دا كیشاویەتی و قۆناغی (التعكیبیة) لە ژیانی هونەرییدا دەردەخات.

٣١–*Edgar Rice (Burrough)* (١٨٧٥–١٩٥٠) رۆماننوسیكی ئەمریكییە، وەك پشكنەریك بە دوای زیردا پاشان شوانی و پۆلیسیی كردووە. قۆناغی گەنجیتیی كە پریبووە لە سەرەرۆیی، ئیلهامی ئەوەی پێ بەخشیوە لە سالی ١٩١٢دا، كە ئەوكات تەمەنی ٢٧ ساڵ بووە، زنجیرەی تەرەزان دەربكات، ئەو زنجیرەیەی كە سینەماو كاسیتە وینەدارەكان بە فراوانی بلاوی دەكەنەوە.

٣٢–*Le dernier des Mohicans* رۆمانیكی جیمس فۆنیمۆر كوبیرە (١٧٨٩–١٨٥١) لە سالی ١٨٢٦دا نووسیویە

٣٣–*Tom* ... لی (١٨٥١–
١٨٥٢)دا

٣٤–*arme*

٣٥–*ibur* ... دەریادا بە
دوایدا دە

٣٦–*ance*

٣٧– ... ا لە بارەی
ریمۆن كی ... یژییەكان و
ترۆبادۆر ... ە ئارەزووی
دەرخستن

**خوینەران و وەرگیرانی "سەردەم" ئاگادار دەكەین**

**كە فایلی ژمارەی داهاتوومان تایبەتە بە:**

**بوونگەرایی**

**یان**

**( وجودیەت )**

**چاوەریی بەشداریكردنتانین.**

لویس لانکفۆرد*

# پرنسیپەکانی دیالۆگی ڕەخنەیی



وەرگێڕانی: شاهۆ سەعید

کاتێك ڕەخنەگران و مامۆستایان دەربارەی کاری هونەری قسە دەکەن، ئەو کردەی قسەکردنەیان لە چەند سیاقێکی شارەوەو گریمانەییدا دەخەنەڕوو. بۆ نمونە ڕەنگە مامۆستایەك گریمانەیەك پێشکەش بە خوێندکارانی هونەر لە قۆناغە پێشکەوتوەکانی خوێندندا بکا، بەوەی کە چەند تەکنیکێکی نیگارکێشان دەزانن و پەی بەوە دەبەن کە ئایا مەبەست لە هاوسەنگیی تەماشاکردن و شێوازە سەرەکیەکانی هونەری خۆرئاوایی مۆدێرن چیە؟. لێرەوە کەسی مامۆستا چەند زاراوەیەك بەکاردێنێ و چەند ئاماژەیەکی لاوەکی دەکا بۆ ئەو چەمکانەی کە لە بارودۆخی تردا پێویستیان بە شیکردنەوەی ورد هەیە. بۆ نمونە ئەو ڕەخنەگرەی کە دەڵێ: "ئەم تابلۆیە جوغزێکی

سیحریی تێدایە" مەبەستی لەوەیە کە ئەو جوغزە لە شێوەی بەهایەکدایەو شایەنی وردبوونەوەیە. چونکە بە گوێرەی هەڵسەنگاندنی ئەو رەخنەگرە "جوغزی سیحری" خەسڵەتێکی کاری هونەرییەو بەهایەکی تایبەت بە کارەکە دەبەخشێ. بەڵام رەنگە هێزی کاردانەوەی بینەر بەرامبەر کاری هونەری لە ژینگە جیاوازەکاندا گۆرانکارییەکی ئەوتۆی بەسەر نەیەت، بۆیە بە گوێرەی ئەزموونە جیاوازەکان مەسەلەکەش دەگۆڕێ. لێرەوە ئەگەر کەسی مامۆستا وای بە باش زانی بە شێوازێکی ساناو ئاسان قسان بکاو کەسی رەخنەگریش لە قسەکردندا فرێزی ئاڵۆزو قورسی بەکارهێنا، بیهێنەرە بەرچاوی خۆت کە لە دۆخێکی وەهادا رەوتی دیالۆگی رەخنەیی بە ئاقارێکی چەند جیاوازدا دەڕوا.

**پێداویستی سنورکێشان:**

ئەڵبەتە ئەو فرێزانەی کە لە کاتی ئاخاوتنی رەخنەییدا دەربارەی کاری هونەری هەڵی دەبژێرین، کاریگەری لەسەر چۆنیەتی تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی ئەو کارە جێ دێڵێ. چونکە چەند رێنماییەك لە ئارادان کە شێوازەکانی رەخنەی هونەری پێك دێنن و هاوکاریمان دەکەن بۆ ئاراستەکردنی رەوتی دیالۆگی رەخنەیی و سەرنجی بینەران بۆ چەند ئەدگارێکی دیاریکراوی کاری هونەری رادەکێشن. هەرچەندە خودی کێشەکان دەستەبەری هێنانەکایەی رێگەچارەکان دەکەن، بەڵام شێوازی رەخنەیی رێگەچارە بۆ چۆنیەتی ئاشکراکردنی خەسڵەتی دەربرین بۆ کاری هونەری دەدۆزێتەوە، بەڵام ناتوانێ رەچاوی جیاوازی بەکارهێنانی بینەران بۆ ئەو شێوازە بکا. هەروەها شێوازە رەخنەییەکان مامەڵە لەگەڵ ئاشتی پێکەوە گونجانی رەخنەو بابەتی رەخنەکراودا ناکەن، لە کاتێکدا کە هەڵوێستی توندو جۆراوجۆری هونەرمەندە هاوچەرخەکان کارێکی وای کردوە پێناسەکردنی بابەتە هونەرییەکان هەروا سانا نەبێت.

شیکردنەوە یان راڤەکردن *Interpretation*، رەگەزێکی باڵایە لە زۆربەی شێوازە رەخنەییەکاندا، بەڵام پێوەرەکانی ئەو راڤەکردنە زۆرجار ئاڵۆزو تەم و مژاوین. کەواتە، ئەو زانیاریانە چین کە پێویستە لە دیالۆگی رەخنەییدا بەکاربین؟ ئەمە جگە لەوەی هەمیشە مامۆستاکان رووبەرووی ئەو گرفتە دەبنەوە کە داخۆ باشترین ئامانجە لاوەکییەکان چین کە پێویستە شان بە شانی ئامانجە سەرەکییەکان لە پرۆسەی رەخنەی هونەریدا، لەناو کلاسدا، پیرەو بکرین.

شیکردنەوە یان راڤەکردن *Interpretation*، رەگەزێکی باڵایە لە زۆربەی شێوازە رەخنەییەکاندا، بەڵام پێوەرەکانی ئەو راڤەکردنە زۆرجار ئاڵۆزو تەم و مژاوین.

کەواتە سنورەکانی ڕەخنەی هونەری چین؟ گونجاوترین ئاخاوتنی ڕەخنەیی چیە؟ ئەو شتە چیە کە پێویستە بەر لە پێڕەوکردنی شێوازی ڕەخنەیی لەبەرچاوی بگرین؟ مەرجی پێویستی ڕەخنەی هونەریی کاریگەر چیە؟.. لێرەدا دەمانەوێ چوار پرەنسیپ بخەینە ڕو کە بە شێوەیەکی هەمەلایەن دیالۆگی ڕەخنەیی سنوربەند دەکەن. گومانیش لەوەدا نیە کە ناکرێ سنورێکی ورد بۆ کارە شیاو و نەشیاوەکانی ڕەخنە دەستنیشان بکەین، چونکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ توانای پەیپێبردن و تێگەیشتنی هونەرمەندان لە ڕێگای فۆرمە هونەرییە تازەکانەوە لە فراوانبووندایە. بۆیە پێویستە ناوەڕۆکە ڕەخنەییەکان بە گوێرەی دۆخە جیاوازەکان سنووردار بکرێن، بەلام تێگەیشتنی مەرجە سەرەکیەکانی ڕەخنە هاریکاریمان دەکا لە پێناو دۆزینەوەی ئەو ناوەڕۆکە ڕەخنەییەی کە دیالۆگێکی ڕەخنەیی کاریگەر دەخاتەوە. هەمان ئەم پرەنسیپانە نابنە ڕێگر لە ئاست لێدوانی باش دەربارەی هونەر تەنانەت گەر سنوورداریش نەبێت، بۆیە پێویستە هەمیشە وریابین بەرامبەر ئەو ئامۆژگاریانەی هانمان دەدەن کارە هونەرییە گەورەکان لە چەند بازنەیەکی هەستیاری داخراودا گیر بکەین. بەلام ئەم پرەنسیپانە بە شێوەیەك ئامادە کراون کە نمونەیەکی پتەوو یەکانگیر ئامادەکاریی ڕەخنەیی پێشنیار دەکەن.

### چوار پرنسیپی دیالۆگی ڕەخنەیی:

١-پێویستە چەمکی هونەر ئاستی شیاوی بابەتی ڕەخنەیی دیاری بکا: دیارە چاك بەکارهێنانی دەستەواژەی ڕەخنەی هونەری دەخوازێ کاری هونەری وەك بابەتێکی ڕەخنەیی تەماشا بکرێ. هەروەك لە شوێنێکی تریشدا وتوومە: بابەتگەرایی هونەری پاڵپشتی دەربڕینی ئیستاتیکییە[1]. لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەگران و مامۆستایان ڕووبەڕووی ئەو جەماوەرە گومانکەرە دەبنەوە کە داوای پاساوی بابەتی دەکەن بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی هونەر. چونکە کارێکی شیاو نیە بۆ کەسێك کە شێوازی ڕەخنەیی بەکاردێنێت، ئەو شێوازە وەك پرۆڤەیەکی ئەکادیمی لە ڕەخنەکردنی بابەتێکدا بەکاربێنێ کە لە بنەڕەتدا ڕەتکراوە بێت و شیاوی ڕەخنەکردن نەبێت، واتە بابەتێکی زۆر دوور بێت لە تێگەیشتنی بینەر بۆ هونەر، ئەم شێوازەش وەك پرۆسەی تێپەڕاندنی کەم و کورتی دەردەکەوێ. بەلام ئەم حاڵەتە بە دەگمەن لەگەڵ فۆرمە تەقلیدیەکانی هونەردا، وەك وێنەگرتن و نیگارکێشان، ڕوو دەدا، چونکە

ناسینی هەلومەرجی هونەریی بابەتێک گومان دەرەوێنێتەوەو کارئاسانی لە بەردەم پرۆسەی رەخنەدا دەکا.

کاتێك بابەتێك بە شێوەیەکی پەرگیر فۆرمە هونەرییە باو و بەناوبانگەکان تێدەپەڕێنێ ئەوە خۆی لە خۆیدا گرفتێکی گەورەیە. بۆ نمونە تابلۆی پەردەیەکی زەبەلاح لە دۆڵێکدا (کریستۆ ١٩٧٦)، تاشە بەردە گەورەو دیارەکانی بیابان، ئەو ژن و پیاوانەی لە بری رەنگ جووڵە نمایش دەکەن.. ئەمانە ئەو کارە هونەرییە سەیرو سەمەرانەن کە بینەران تووشی راچەنین دەکەن و، بەر لەوەی رەخنە بکرێن بوونیان پێویستی بە شیکردنەوە هەیە.

لێرەدا ناخوازم باس لە تیۆری هونەر بکەم، بەلام زۆر شیاوە لە دیالۆگی رەخنەییدا پەی بە گرنگیی چەمکی هونەر ببەین، چونکە ناسینی هەلومەرجی هونەریی بابەتێك گومان دەرەوێنێتەوەو کارئاسانی لە بەردەم پرۆسەی رەخنەدا دەکا. بەلام پێوەرەکانی قبوڵکردنی کاری هونەری خۆی لە خۆیدا هونەرێکە کە بە گوێرەی تیۆرو چەمکی بەکارهێنراو لە گۆڕاندان. هەریەك لە دیکیێ *Dikie* و سکلافانی *Sclafani*[٢] پێشنیاری ئەوەیان کرد کە دەکرێ تیۆری هونەر بەسەر سێ جۆردا دابەش بکرێ و هەر جۆرێکیش فۆرمی دووبارەبۆوەی هەبێت. ئەم جۆرانەش بریتین لە: (یەکەم) گەوهەرگەراکان *Essentialistic* (هەڵگرانی ئەو تیۆرەی کە گەوهەر لە پێش بوونەوە دادەنێن). (دوەم) چەمکی کراوە *Open Concept* یان دژە تیۆرەکان *Antitheory*. (سێیەم) ئەو چەمکانەی کە زیاتر پشت بە نەریتە کۆمەلایەتیەکان دەبەستن نەك خەسڵەتی بابەتەکان. هەر رەخنەگرێکیش یەکێك لەم چەمکانە پەسەند بکا ئەوا بڕیاری خۆی دەدا سەبارەت بە جێبەجێکردنی پێوەرە ئامادەکانی هەڵبژاردنی بابەتی لێکۆڵینەوە. ئەگەر بڕیارەکەش پێشوەخت کاری بۆ بکرێ، ئەوە زیاتر بە دەستەوە دێت.

بەهەرحاڵ، تەنانەت ئەگەر چەمکی هونەر وەك چەمکێکی لاوەکی لە ئەزموونی هونەریدا هەڵسەنگێنین. ئەوا ئەو هەڵسەنگاندنە دەبێتە دەروازەیەکی سەرەکیی بابەتەکە بۆ جیهانی هونەر کە بە گوێرەی شێواز و ئامرازەکانی رەخنەی ئیستاتیکی دەستەبەری لێوردبوونەوەی دەکا. ئەم خاڵە لە شێوازەکانی (برۆدی *Broudy*[٣]، کالین *Kaelin*[٤]، سمیت *Smith*[٥]دا هاتوە.

٢-پابەندبوون بە کرۆکی دیالۆگی گونجاوەوە مەرجێکی پێویستی بوونی رەخنەیەکی هونەریی کاریگەرە: بە گشتی کرۆکی ئەو دیالۆگە لە دوو رەگەزی تێکهەڵکێش پێکدێت: (یەکەم) ئاراستەکردنی پەی پێبردنی هەستیاری (دوەم) قەیدو مەرجەکانی حوکمی رەخنەیی. بۆ نمونە دەکرێ سەبارەت بە خاڵی یەکەم بوترێ:

تایبەتمەندیی هەر کارێکی هونەری کاریگەریی لەسەر مانای کارەکە هەیە. هەر بۆیە جیاکردنەوەی هەر گۆشەیەکی تابلۆ لە گۆشەکانی دیکە پشتگوێ خستنی لە ڕووی لێوردبوونەوە و وەسفی ڕەخنەییەوە، کارێکی ناپەسەندە، بەلام سەبارەت بە قەیدو مەرجە باوەکان ڕەنگە بوترێ: پوێستە حوکمی ڕەخنەیی بە پاساوی گونجاو پاڵپشت بکرێ، چونکە فرێزی پەسەندکردن بە شێوەیەکی ساناو زارەکی حوکمێکی ڕەخنەیی شیاو نیە.

چوونە نێو دیالۆگ بێ هەستکردن بە ئاستە گونجاو و ئاستە نەگونجاوەکان دەبێتە هۆی سەرگەردانی و تێکەڵکردن و دژبوون، ئەوەش خۆی لە خۆیدا چەند حوکمێکی ڕەخنەیی لاوازی لێدەکەوێتەوە. لێرەوە ئەگەر هەمان پرسیار لە خۆمان بکەین: ئەو زانیاریانە چین کە دەکرێ لە دیالۆگدا بیسازێنین؟ ئەوا دەبینینن وەلامەکە کرۆکی ئەو پێکەوە گونجانە دەستەبەر دەکا کە لە ڕێگایەوە دەتوانین کارە هونەرییەکان ڕاڤە بکەین و شییان بکەینەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی گرنگیی ئەم پرنسیپە زۆر بە کورتی دوو شێوازی باوی ڕەخنەی هونەری دەخەمەڕوو، کە ستۆلنز *Stolintz*(٦) ناویان دەنێ: (یەکەم) ڕەخنەی گەوهەری *Intrinsic Criticism*. (دوەم) ڕەخنە بە گوێرەی ڕەوت کۆنتێکست *Contetual Criticism*. جۆری دوەم بینەر بەرەو لێکۆڵینەوە لە کاری هونەری ئاراستە دەکا بە پشتبەستن بە بواری ئەو موتیڤانەی کە لە پاشخانیستراکتورە بینراوەکانەوەن، تا ئەو بوارانەو کە بنەماو کاریگەریی کۆمەلایەتی و هونەرییان هەیە. زۆر جاریش ئەم حاڵەتە پەیوەندیدارە بە پێگەو ژینگەی کلتوریی داهێنانی کاری هونەرییەوە، هەروەها پەیوەندیی بە دۆخی ژیانی هونەرمەندو کەسایەتی کاری هونەرییەوە هەیە لە ڕووی توانای گەشەکردن و شۆڕشگێڕییەوە بە جۆرێ کە لەگەڵ مێژووی هونەردا بگونجێ.

کۆنتێکستی ڕەخنە زۆرجار پشتئەستوورە بە ئەگەری ئەو دیالۆگەی کە پەل دەهاوێ بۆ تایبەتمەندییە ناوازەکانی کاری هونەری. بۆچوونێکی تر هەیە دەڵێ: زۆرجار زانیارییە مێژووییەکان خاوەن مۆرکێکی پلەبەندین و وێناو پێکهاتەکان چەند مانایەکی نوێ دەپۆشن کە بە چەند قۆناغێکی زەمەنیدا تێدەپەڕن. هونەرمەندانیش لە ڕێگای وزەو تواناکانیانەوە لە جیهان دەگەن و پەی پێدەبەن بە شێوەیەکی تایبەتی بە خۆیان، بۆیە ناسینی شارستانیەت بە تەنها، بەرهەمی هونەری بە تەواوی لێك ناداتەوە.

هـەرچی رەخنـەی گەوهەرییـە پشتئەسـتوورە بـە خەسـلەت و بـەهاکانی کـاری هونەری. هەروەك لە کارەکانی ئیکەر *Ecker* و *Kaelin*دا ئاشکرا دەبێ بەهاو یەکانگیری لە دیالۆگی رەخنەییدا پیوانە دەکرین بە ئاستی ئاشکراکردنی ئەو پەیامەی کە کاری هونـەری دەیگەیەنیتـە بینـەران و چۆنیـەتی ئـەو گەیاندنـە. دیـالۆگی گونجـاو پیویسـتە بارگـاوی بکرێ بە کرۆکی ئـەو بابەتانـەی کـە بـە روونـی لیـی دەگـەین، هـەروەها دەبـێ بارگـاوی بکـرێ بـە خـودی کـارە هونەرییەکـە. رەخنەیـەکی لـەم جـۆرە پیویسـتی بـە دیـاریکردنی رەگـەزە بینراوەکـان و پـەیوەندی ئـەو رەگەزانـە بـە یەکدیيـەوە هەیـە، هـەروەها پـەیوەندی بـە ری و شـوینی کاریگـەریی سـتراکتۆرە بینراوەکانـەوە هەیـە بەسـەر ئـەو شـیوازەی هەسـتی پیدەکـەین و بەسـەر رەوتـی بەشـداریکردنیان لـە گەیاندنی ماناکاندا.

رەخنـەی گەوهــەری دوو ئاراسـتەی هەیـە: (ئاراسـتەی یەکـەم) پـەیوەندیی بـە پـەروەردەکاری ئیسـتاتیکیەوە هەیـە، ئەوانـەی نیگـەرانن بـەوەی کـە پابـەندبوونی لـە رادەبـەدەریان بـە وتویژەکـانی نـاو کلاسـەوە تەگـەرە لـە بـەردەم ئامرازەکـانی چیـژی هونـەریدا دادەنـێ. بـۆ نمونـە ئـەو خویندکارانـەی کـە لـە ریگـای رەفتـاری ئاسـایی خۆیانـەوە قوتابخانـەی گوزارشـتخوازی پەتیگـەری (التعبيريــة التجريديــة) رەت دەکەنەوە، لە کاتی بیستنی چیرۆکی هونەرمەندە هاوچەرخە خاوەن حەماسەتەکان و شۆرشەکانی جیهانی هونەردا بایەخی نوییان لا دەوروژێ.

(ئاراستەی دوەم) پەیوەندی بەو رەخنەگرانەوە هەیە کە ئاستەمە بە وردی زانیاریە ئامادەکراوەکانی شیکردنەوەی کاری هونەری بخەملینن. بۆ نمونە: لە شیکردنەوەی تابلۆی (گۆرنیکا)ی پیکاسۆدا.. ئەگەر بلیین (ئەو تابلۆیە باس لە گوندی باسك دەکا کاتێ لە ژیر بۆردومانی چردا بوە) ئایا ئەمە سەرمان لیناشیوینێ و ئەو پرسیارەمان لا دروست ناکا کە (ئایا دەکرێ پەیامەکەی پیکاسۆ پـەیامیکی جیهانی بیت لـە کاتیکدا وینای چەند ئاماژەیەکی بچوك دەکا لە ئیسپانیاوە؟!).

ئاشـکرایە کرۆکـی پیکـەوە گونجـانی سـەرکەوتوو، شـتیك نیـە کـە سـودیکی لـە رادەبـەدەری هــەبیت. چونکــە دەبــێ هەمیشــە بگەینــە بریارەکــان لەبــەر رۆشــنایی لیکدانەوەی کرۆکی پیکەوە گونجان لە دۆخیکی تایبەتدا. بەهەر حال ناکرێ شیوازی ریکـەوت لـەو شیوازانەی کە پیشتر باسمان کردن باشتر بیت، چونکە هەر شیوازیك لەوانە دیدیکی بەهیزمان بەرامبەر کارە هونەریەکان پیدەبەخشن. واتە هەر یەکیك لەو پیوەرە رەخنەییانە کە لەگەڵ یەکتر کۆك نین باشـەو خراپـەی خۆیـان هەیـە. ئەگـەر

هەرچی رەخنەی گەوهەرییە پشتئەستوورە بە خەسلەت و بەهاکانی کاری هونەری.

یەکیکیشمان لەوی تر پێ باشتر نەبوو ئەوا دەکرێ سوود لە بایەخە هاوبەشەکان وەربگرین. دەکرێ ئەو دوو پرەنسیپەش کە ئیستا باسیان دەکەین هاوکاریمان بکەن لە رونکردنەوەی شیوازی سوود وەرگرتنەکانمان، تاوەکو هاوسەنگییەك لە نیوان هەردوو شیوازەکەدا رابگرین.

٣-پیویستە پیش پیرەوکردنی شیوازی رەخنەیی، ئامانجەکانی رەخنەی هونەری دەستنیشان بکرین: ئەگەر رەخنە لە ساناترین ئاستەکانیدا پەسەند کرا وەك "قسەیەك دەربارەی هونەر"[٨]، یان ئامانجیکی لەوە فراوانتری هەبوو وەك ئەوەی بلیین "رەخنەکردنی ژیان لە پیناو سەقامگیرکردنی بەها مرۆییەکاندا"[٩]، لە هەردوو حالەتەکەدا ناسینی شتیك کە شایانی پیناسەکردن و بایەخ پیبەخشینە لە ریگای دیالۆگی رەخنەییەوە دیتە کایەوە، هەروەها دەبیتە هاندەریك و سەرەنجام هەستیك دروست دەکا سەبارەت بە کۆتایی گیرمەو کیشەکەو ئەنجامدانی پرۆسەی هەلبژاردن. رەنگە ئامانجەکان بەرفراوان بن بە ئەندازەیەك ئامانجەکانی هەردوو شیوازی رەخنەی جەوهەری و رەخنەی نیو رەوتیش لەخۆ بگرێ. واتە رەخنە دەبیتە ئامرازیکی دەولەمەندکردنی ئەزموونی هونەری تاکو پەی پیبردنی هەستیاری زیاتر خاوەنی خەسلەتی خۆی بیت و توانای تیگەیشتنی کاملتر بیت، بەلام ئامانجە هەمەلایەنەکان (بە تایبەتی لە دۆخی پەروەردەییدا)، لکاون بە ئامانجە لاوەکیەکانەوە، یان بەو ئامانجانەوە کە کاریگەرییەکی راستەوخۆیان لەسەر بابەتە رەخنەییەکان هەیە.

ئەو کەسانەی لە بواری پەروەردەی ئیستاتیکدا کاردەکەن هەمیشە هەول دەدەن گەشە بە توانای دەرکپیکردنی هونەری بدەن لای خویندکاران و بیکەنە دیاردەیەکی کۆمەلایەتی. رەنگە ئەم دۆخە سەبارەت بە گفتوگۆی رەخنەیی لەمەر کاریکی هونەری وەك "تانەی نەخشینراو"ی ولیام هۆگارس ئاسایی بیت، چونکە ئەو کارە چەند زانیارییەك لەخۆ دەگرێ دەربارەی شاری لەندەن لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەدا. هەروەها دەکرێ چەند ریژەیەکی گەورەی زانیاری دەربارەی ئەخلاق و سیاسەت و نەریتە کۆمەلایەتیەکانی ئەو سەردەمە بەکار بهینرێ بۆ یارمەتیدانمان لە جیبەجێ کردنی ئامانجی کۆمەلایەتی و جیبەجی کردنی مەرجەکانی رەخنەی جەوهەری و رەخنە لە گویرەی رەوت. چونکە گەر ئەو سەرچاوەیە نەچیتە خزمەتی پرۆسەی روونکردنەوەی ئەو سیفەتانەی کە شایانی پەیپیبردنی هەستیاری نیگارکیشانن، ئەوا پرەنسیپەکانی رەخنەی جەوهەری پیشیل دەکرین.

رەنگە پرۆسەی رەخنەیی سودیکی ئەوتۆی نەبیت ئەگەر ئامانجەکانی خراپ خرانە گەر یان خراپ ریکخران.

ئەلبەتە لە توانای ئامانجە هەمەجۆرو دووبارە بوەکاندا هەیە کە شیوازی حوکمدان لەسەر رەخنەو چەمکەکانی رەخنە بگۆرن. چونکە ئەو پەروەردەکارەی کە دەیەوی گەشە بە هەستیاری و هەست و سۆزی خویندکارەکانی بدا، هەمان ئەو مۆرکە بزۆکانە دووبارە دەکاتەوە کە تابلۆی هونەرمەندیکی ئیتالی داهاتووخواز دەیوروژینیّ، هەمان ئەو تابلۆیەش دەکریّ لیکۆلینەوەی لە بواری هیل ، ریتم، رەنگی لەسەر ئەنجام بدری بۆ ئەو خویندکارانەی کە دەیانەویّ پرەنسیپەکانی نەخشەکیشان فیربن، ئەم کارانە پیویستن بە مەرجیّ روەکانی تری کاری هونەری وەك هیماگەری *Sumgolism* بۆ نمونە پشتگویّ نەخریّ. لیرەوە کەسی مامۆستا بە هەلەدا ناچیّ لە هەلسەنگاندنی کارەکەو دوورکەوتنەوە لە پرۆسەی رەخنەیی. واتە دەکری گۆرانکاری لە ئەزموونی رەخنەییدا ئەنجام بدریّ لە رووبەرووبوونەوەی پیداویستیەکانی ئەو بوارە پەروەردەییەدا کە پیشتر بایەخیکی زۆری دەدا بە رەخنە. ئەم گۆرانکارییە خیرایانە لە پرۆسەکەدا نەك هەر شیاو بەلکو سروشتی و پیویستیشن. بۆیە ئاستی دەرکپیکردنی هەستیاریی رەخنەگر هەمیشە بە گویرەی بایەخ و ئەرکە رەخنەییەکان پیکدیت.

رەنگە پرۆسەی رەخنەیی سودیکی ئەوتۆی نەبیت ئەگەر ئامانجەکانی خراپ خرانە گەر یان خراپ ریکخران. وەك ئەوەی -بۆ نمونە- بایەخیکی کۆمەلایەتی پەتی بدەین بە کارەکانی هۆگارس، نەك رەخنەیەکی ئیستاتیکی، بەلام دەستنیشانکردنی ئامانجەکانی بە شیوەیەکی پیکەوە گونجاو و هاوسەنگ، گەشە دەدا بە دیالۆگی رەخنەیی و سودیکی زۆر چاکیشی لیدەکەویتەوە.

٤-پیویستە بەر لە دەستپیکردنی دیالۆگی رەخنەیی، تایبەتمەندیی بەشداربوان دەستنیشان کرابیّ: هەموو رەخنەگریکی باش و هەموو مامۆستایەکی سەرکەوتو دەرك بەوە دەکا کە بەشداربوون لە چەند ئاستیکی دیاریکراوی شارەزایی، مەعریفە، توانا شکاندن بەسەر بابەتی لیکۆلینەوەدا دەچنە دیالۆگەوە. باشتر وایە زمانی دیالۆگ لە یەك کاتدا توانای وروژاندنی هەبیت و لە ئاستی تیگەیتشنی فیکریشدا بیت، چونکە زۆر گرنگە کە رەخنەگر شارەزایی لە مەودای کاریگەریی گۆرانکاریەکانی هەبیت لەسەر رەخنەی هونەری، بە تایبەتی سەبارەت بەو زاراوە ئالۆزانەی کە لە دیالۆگدا بەکاردین و، پیکەوە گونجانی فریزو دەربرینەکان.

بۆ نمونە گریمان رەخنەگریك دەلیّ: "هەرچەندە ئەم تابلۆیە هی پیکاسۆ نیە، بەلام چەند خەسلەتیکی هەیە کە لە شیوازی سیجاگەریی شیکاری (التکعیبیە التحلیلیە)ی

پیکاسۆ دەچی". لیرەدا سەبارەت بەو کەسانەی ئەو شیوازەی پیکاسۆ بەکاردینن فریزیکی لەم جۆرە ئاماژەیە بۆ لیکۆلینەوەو دەرکپیکردنی ئەو فۆرمە پەتییانەی کە بابەتەکان و خالی جیهانبینی جیاواز یان هاوشیوەو تەکنیکەکانی کۆلاج ***Collage*** وینا دەکەن. چونکە لە بنەرەتدا چەمکی شیوازی هونەری کورتکراوەی تایبەتمەندیەکانی کاری هونەرییە. لیرەوە ئاماژەی لەم جۆرە دەچیتە خزمەت رەخنەی جەوهەری و رەخنەی نیو رەوت.

بەلام سەبارەت بە کاریگەریی ئەو دەربرینەی سەرەوە لەسەر ئەو کەسانەی کە حەزیان بە (سیجاگەریی شیکاریی) نیە جۆریکی تر لە کاریگەری هەیە. هەمان ئەو فریزە دەکریَ جۆرە وانەیەك بیت دەربارەی شیواز بەدەر لە خەسلەتەکانی کاری هونەری و چەند گشتاندنیکی ئالۆزی لی دەکەویتەوە دەربارەی شیوازی کارکردنی پیکاسۆ لە وینەکیشاندا، کەواتە هەنگاویکی لەم جۆرە لەبەر رۆشنایی پیکەوە گونجانی شیوازو ئامانجە رەخنەییەکاندا تاووتویَ دەکریَ.

بەهەر حالْ دەکریَ ئاراستەی دیالۆگ لە ریگای بەکارهینانی دەربرینیکی لەم جۆرە بگۆرریَ: "نیگشارکیشەکە قوتابیەکی پیکاسۆ بوو"، چونکە دەربرینیکی لەم جۆرە هیلیك هاوشانی شتیکی تر دەکیشیَ، گومانیشی تیدا نیە کە ئاماژە بۆ بەهای خودی کارەکە ناکا، بەلام دەربرینیکی لە جۆری: "هونەرمەندەکەش وەك پیکاسۆ رووبەری ئەندازەیی و هیلی خوار دەکیشیَ و شوین پەنجەیەکی ئاشکرا هەیە لە فۆرمەلە کردنی بۆشاییەکی ئالۆز" قورسایی خۆی سەبارەت بە کرۆکی گەوهەری کرۆك لەناو رەوتدا هەیە.

وتەزایەکی لەم جۆرەش وتەزایەکی راستە: "تاکو ئاستی مەعریفە و شارەزایی کەسی بەشدار بەرفراوانتر بیَ، هاندەری خۆگونجان لە نیوان شیوازە رەخنەییەکاندا زۆرتر دەبی". واتە رەنگە ناسینی زاراوەو تەکنیك و شیوازەکان و باکگراوندی میژوویی و کلتوری لە دەروەی چوارچیوەی دیالۆگی رەخنەیی تەماشای بکریَ، بەلام دەکریَ لە کاتی خۆیدا وەك ئامرازیکی تیگەیشتن و چیژوەرگتن لە کارە هونەریەکان لە کاتی پراکتیزەکردنی رەخنەی هونەریدا بەکار بهینریَ.

**پوختە:**

**لەم وتارەدا هەولمان دا سودەکانی چوونە نیو دیالۆگی رەخنەیی لە دەرەوەی ئەو چوارچیوەیەی کە شیوازەکانی رەخنەی هونەری پیشکەشی دەکەن روون بکەینەوە. بەهاو چەمکە رەخنەییەکان کاریگەری بەهیز لەسەر تیگەیتشنی کاری هونەری بەجیّ دیلن، تەنانەت گەر لە ریگای ستراکتۆری شیوازی رەخنەییەوە پالفتەش بکرین. لە ریگەی دەستنیشانکردنی ئەو چوار پرەنسیپەی دیالۆگی رەخنەییەوە ویستم نمونەیەکی پتەو و یەکانگیری خۆ ئامادەکردن بۆ پرۆسەی رەخنەیی پیشنیار بکەم، کە دەتوانیّ ژینگەیەکی گونجاو بۆ دیالۆگیکی رەخنەیی کاریگەر دەستەبەر بکا. هەروەها رەنگە لە ریگای ناسینی ئەو پرەنسیپانەوە بە جۆریك لە جۆرەکان پیکەوە گونجانیك لە نیوان شیوازە دژ بەیەکەکانی رەخنەی هونەریدا بدۆزینەوە.**

## پەراویزەکان

*لویس لانکفۆرد پرۆفیسۆری پەروەردەی هونەرییە لە زانکۆی ئۆهایو، دەربارەی رەخنەی هونەری و ئیستاتیکاو پەروەردەی ئیستاتیکی چەندین نووسینی هەیە بە تایبەتی لە وەرزنامە ئەکادیمیەکاندا.

1

Studies in Art Education 25, no.3 (1984): 151-58.

2. George Dickie and Richard J. Sclafani, eds., Aesthetics: A Critical

1977), PP. 2-3.

3 in Aesthetics and

Study of Education (Chicago: University of Chicago Press, 1983), pp.

219-47.

4. Eugene F. Kaelin, The Philosophy of Aesthetics: A Phenomenological Approach (Saratoga Springs, N.Y.: Empire State College, 1973).

5

Aesthetic Education 7, no. 1 (1973): 38. 49.

6

Criticism in Art Education, ed. Ralph A Smith (Chicago: Rand McNally, 1966), pp. 364-72.

7

Inquiry:

National Society for the Study of Education (Chicago: University of Chicago Press, 1972), pp. 258-86.

8

Education 7, no.1 (1973): 50.

9 38.

## سەرچاوە

لويس لانكفورد، مباديء الحوار النقدي، النقد الفني. أبحاث في النقد الفني. ت: د. زياد سالم حداد. (ط ١؛ بيروت: دار المناهل، ١٩٩٣)، ص ٧١-٧٨.

# گوڵبژێرێك لە شیعرەكانی ژنە شاعیری ئەمریكی "جوول"




و. لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

"هەندێ لە خەڵکی لەسەر ئاستی "فیزیکی" لە بەرامبەر ئەفسوونی شیعردا کاردانەوەیان دەبێ، بە واتا کاردانەوەیەکی سروشتیەو گەڕانەوەشە بۆ ساتە زۆر ڕاستەقینەکانی شیعر. بە واتایەکی دیکە گەڕانەوە بۆ درکاندنی شتە پەنهانەکان و سروشی ڕەسەن کە لەوەوە شیعر لەدایك دەبێ، گەڕانەوە بۆ جۆرێك لە ئاڵوگۆڕو پەیوەندیداری و لەیەك گەیشتن، بەشداریکردنی یەکتری لەسەر بەرزترین ئاستدا.. شیعری جوان پشکی بەشدارییەکی گەورەیە لەگەڵ ژیان و واقیعدا. جیهان هەرگیز وەك ئەو ساتەوەختە نیە کە شیعر تیایدا لەدایك دەبێ، بە واتا بەر لەدایکبوونی شیعرێکی جوان جیهان شتێکەو لە پاش هاتنی شیعرێکی جوان تەواو جیایە.

شـیعریکی چـاك لـەوەدا یارمـەتیمان دەدا کـە فۆرمـی ژیـان و مانـاو مـەغزاکانی لەبەرچاومان بگۆڕێ، بەلکو شیوەو ئاکارو ماناکانی ئەم بوون و گەردوونەش دەگۆڕێ، یارمەتی هەر یەکیك لـە ئیمـە دەدات کـە سـەبارەت بـە خۆمـان و جیـهانی دەوروبـەر زانیاریمان زۆرتر بێ".

ئەم رازەی ناو کەوانەکە رازی شاعیری ئینگلیزی (دیلن تۆماس)ە کە لـە سـالی (١٩١٣)دا لەدایکبوەو لە (١٩٥٣)دا کۆچی دوایی کردوە.

من بیرمە هیشتا منال بووم کە دایکم لە دوای هاتنـەوەمان لە قوتابخانـە لەگـەڵ براکانم کۆی دەکردینەوەو سەرگەرمی ئەوەبوو فیرمان بکات چۆن بە مۆسیقاوە خۆمان سەرحال بکەین، فیری دەکردین چۆن خۆشی لە وینەکیشان و لە تابلۆ رامان ببینـین، هـەروەها رای دەهینـاین لەسـەر نووسـین. مـن بـە خۆشەویسـتی شـیعرەکانی "شکسپیر"ەوە گەورە بووم، شیعرەکانی دیلن تۆماس، رومی، ییتس، هەندێ شاعیری دیکـە کـە دواجـار دایکـە شـیعرەکانی بـۆ دەخویندینـەوە. جگـە لـەوەش دایکـم پەخشانەکانی خۆی دەخویندەوە، سەرەرای ئەوەش.. هانی دەداین کە ئیمە پەخشان و نووسینی خۆمان هەبێ. بۆ من شیعر وشـەو دەنگی دەبەخشی بەو شتانەی کە بێ شیعر هیچ دەنگیکیان نیە، من هیدی هیدی هەستم بە هیزو گەرمی و رۆحی شیعر کـرد- لـە ریـی شـیعرەوە ئیمـە فـیردەبین، دەزانـین، هەسـت بـە شـتەکان دەکـەین، تیگەیشتنمان بەرینترو بەرفراوانتر دەبێ و دەچیتە دەرەوەی بازنەی وشەکان.

بەرلـەوەی یەکەم شیعرو ئاهـەنگی خـۆم بنووسمـەوە، لـە دەفتـەری یادگارەکانمـا وشەکان وەك شیعر دەردەکەوتن، وابزانم هەر ئەو ئاهـەنگ و گۆرانیانـە بوون وایـان لـە مـن کـرد ئەمرۆکـە وەك شـاعیریك دەربکـەوم. شـیعرەکانی مـن لـە ژیـر کاریگـەری شیعرەکانی "پاپلۆ نیرودا" دەخولقان، لەژیر کاریگـەری شـیعرەکانی (بۆکۆڤسـکی)، (ئۆکتاڤیۆبـاز)، دیـارە لـە رووی مۆسـیقاو ئاهەنگـەوە مـن سەرسـام بـووم بـە شـیعرە لیریکیـەکانی (تـن پـان ئالـەی)، شـاعیرانی دیکـەی وەك (بـۆب دیلـن)، (جۆنـی میتشـل)، (لیۆنـارد کۆهیـن)، (تـۆم وەیتـس). هەریـەك لـەو شـاعیرانە توانیبـووی لـە نیـوان شـیعرو مۆسیقادا پردیك دروست بکات.

من تیگەیشتم کە هـەموو شیعریك خۆ ناداتـە دەست مۆسیقا هـەندێ لـە خـەیال و بیرۆکەکان دەنیو چەشنیك لە کپی و خامۆشی وەدەربکەون و ئاهەنگی خۆیـان بگیرن. بۆ هەمیشە بەشیك لە خودی ئیمە کە دەکرێ بەشیکی ناسك و نەرم و نیان بێ، بەشیك

کە کەمتر دەگیرێ، ئەو بەشەیە لە زاتی ئێمە کە ئامادەیە بە دڵ و کوڵ بکرێتەوە، بۆ هێمنی و ئاسایش و ئاشتی دەکرێتەوە، پەردە لەسەر خەیاڵ و خەونەکان وەلا دەدات و دەروازەکانی مەملەکەتی ڕۆحی ئێمە دەخاتە سەرپشت، ئەوەشیان تەنها لە ڕێی شیعرەوە بەرجەستە دەبێ، هەموو دەرکەوتەکانی ڕۆح و دۆخە جیاکانی لە شیعردا جێیان دەبێتەوە. شیعر ڕێمان بۆ دەکاتەوە کە بگەین بەو بەش و هەرێم و ناوچانەی ناو بوون و زاتی خۆمان کە لەوێدا چاك تێدەگەین ئێمە کێ بووین، هەر لەویشدا تێدەگەین و ئەو وزەیە لە خۆماندا بەدی دەکەین کە باشتر لەوە حاڵی بین کە ئێمە هەنووکە کێین و بڕیاریش بدەین لە داهاتوودا دەبین بە کێ. شیعر لە خۆمانمان نزیك دەخاتەوە، هەرچی ویژدان و ڕەسەنایەتی لە ئێمەدا هەیە وەئاگای دێنێ، لەگەڵ ئەوانی دیکەدا لەنێو بۆتەی ئەزموونێکی ئینسانی و دۆستانەدا کۆدەبیتەوە، شیعر دەمانگەیەنێتەوە بە ڕۆحی خۆمان. شیعر چی جوان و پیرۆزە لەناو زاتی ئێمەدا وەئاگای دێنێ، هەموو ئەو حاڵەت و شتانە دەخاتە قسەو دواندن و چرپە کە وشەکان لەبەردەمیاندا ئیفلیج و دەستەوەستانن، ئەوەش هاوسەنگیمان پێ دەبەخشێ و گەلێ ڕەهەندو دیوی دیکەمان پیشان دەدات بۆ ناسین و دەربڕین لە دۆخ و حاڵەتە ئینسانیەکان، شیعر زمانی دیکەمان پێ دەبەخشێ تا خۆمان و خەڵکی بدوێنین.

شیعر پاکترین و ڕاستەوخۆترین و ئاشکراترین هونەرە کە لە ژیانما هەستم پێ کردبێ، دەکرێ بڵێین شیعر کەرەستەیەکی زۆر خاوەو پێویستی بە پالاوگەو پالاوتن نیە. شیعر شتێکە زیندوو، دەربڕینێکی داهێنەرانەیە، شایەستەی ئەوەیە کە دەیەها بڵندگۆو سەکۆ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، هەقی خۆیەتی کە تا ئەوپەڕی بایەخی پێ بدرێ و بەرز ڕابگیرێ، دەبێ تێی بگەین، لەنێو ژیانی ڕۆشنبیری و کەلتووری خۆماندا کەڵکی لێ ببینین، وا بێت ژیانمان دەوڵەمەندتر بکات. هەمیشە لەم جیهانەی ئێمەدا شیعری وا جوان و مەزن هەیە کە دەبێ دەنگ و ڕەنگی پێ ببەخشرێ. ئومێدی من ئەوەیە کە ئەو ستایش و جوانی و ڕەنگامەیەی شیعر لە ئێوەدا بە ئاگا بێنم.. دواجاریش زمانێك بۆ ئەو دەربڕینە بەکاربێنم.

## من مەزەندە دەکەم ئەوەی کە ویستم

من مەزەندە دەکەم
ئەوەی کە ویستم
گوێ بیستی شتێك بم

کە تۆ هەمیشە لەگەڵما دەمێنیتەوە

من مەزەندە دەکەم
ئەوەی کە ویستم

بینینی
ئەو دەستانەت بوو کە سوێندم بۆ بخۆن
هەرگیزاو هەرگیز دەستەکانم فەرامۆش ناکەن

من مەزەندە دەکەم
ئەوەی کە ویستم
ئەوەبوو بزانم
کە من ناکرێ بێ هوودەو مایەپووچ
تۆم خۆشویستبێ!

## "دڵنیانەبوون"

تۆ بانگم ناکەی.. زەنگێکم بۆ لێنادەی
بەخۆدا دەچمەوە.. بە تۆ
ڕاڕاو نیگەران دەبم–
تۆ بڵێی ئەوە دۆخی من و تۆ بێ؟
کتوپڕ دڵنیا نابم
دێمەوە سەر هۆکارەکان.. سەرچاوەی شتەکان
هەر گفتوگۆیەك هیچ مانایەکی نابێ
چ ئاسان هاتم و فریوم خوارد
چەندە گێل بووم
بڕوا بەوە بکەم

کە دەکرا تۆ
منت خۆش بوێ
تۆیەك کە ناکرێ فریو بخۆی
بە هیچ شتێك
جگە لە دان بەخۆداگرتن و
کەمی داوات
هەریەك ئەوی دیکە سادەو سانا دەکاتەوە
کتوپڕ شوێنی خۆم دەدۆزمەوە
تەلەفونەکە زرنگەی دێ
تۆ پێم دەڵێی "هەلاو"
وەلێ من بڕوات پێناکەم

## "ڕاوەدوونان"

ئێستاش وا دەستی پێکرد
خۆت دەیبینی.
هەرکە ڕۆیشتیت
گەمەکەی من قورستر دەبێ.
لە عیشقدا من هەر بەدواتەوەم
من هەر ڕازیت دەکەم
بە مەرەکەب فریوت دەدەم
شەو دەسڕمەوەو
ئەستێرەی تازە بڵاودەکەمەوە
دەتدوورم بە خۆمەوە
چیدیکە ناتوانیت
لە دەرەوەی بازنەی ڕاوەدوونانی من
هات و چوونت قەدەغەیە
تازە دڵی تۆ مۆرکی منی بەسەرەوەیە.

### "من بۆت دەنووسم تا پێت بڵێم"

من ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم
تا پێت بڵێم

من چیتر تۆم خۆش ناوێ

چیدیکە یادت ناکەم

هەرگیز نەمکردوە

ڕاستی ئەوەیە، من
هەوڵم دا، وەلێ هەرگیز
شەیدابوون و عیشقی تۆم نەدووریەوە
هیچ شتێك نەبوو.. جگە لە دڵڕەقی

هەموو شتە زۆر جوانەکانیشت هەر کلێشەو قاڵب بوون

ستایشەکانیشت چ شێتانەو بێ زەوق بوون
بێتام ئاشکرابوو
کە تۆ منت خۆش دەوێ
وەك ئەڤینی ناو
ڕۆمانەکانی سوارچاکی و
عیشقبازی
پیاوی ئازا لای تۆ ئەوەبوو
بۆنی خۆشی گوڵ بمرێنێ
بەلآم نەکەی غەمگین بیت
هیچ شتێك نیە دۆڕابێ،

هیچ کام لە من و تۆ
لە دڵەوە  یەکدیمان نەویستوە
تۆ بە تەنها وات مەزەندە کرد کە کردووتە
منیش هەر ئەوە بوە..
ویستوومە!

## "مانگی نوێ"

من ئەویندارم
ئەویندارى پیاوێك
کە هەر هەنووکە لێرە ڕۆی
چوو خەونەکان
ڕاو بکا
ئێسقانەکانی
ئەو بۆنە
دەناسنەوە
چ پڕ سەلیقەن
دەستەکانی
پڕن لە شکۆو ستایش
لە هەرچییەکی کەم بێ
بۆی دەگەڕێ
لەسەر ئەم گردۆڵکەی خۆمەوە
لێی دەڕوانم
ئەو کاتەی بەنێو گوندیدا
ڕێ دەکا
ئەو کاتەی دۆڵە بەپیت و قووڵەکان
دەکا بە دوو کەرتەوەو لەتیان دەکا
هەروەك بڵێی سمت و کەفەڵی
ژنێك بن

ئەو ژنەی ئەم
بە جۆرەها شیوە
شەیدای بوو
وەك هەلۆ
وەك جەنگاوەریك
هەروەکو بەردیك
من خۆشم دەویَ
هۆ لەویندەریَ
دوور دوور لە من.

## "سەردەمانیک.. عەبایەکم بوو"

سەردەمانیکی زوو.. عەبایەکم بوو.. لە خووری زبر
پەروبالیکی تەر کە فرینی کوشتم
سەردەمیکی زوو گومان و زنجیرەیەك وشەی درکاویم بوو
کە وایان کرد خەون و خەیالەکانم..
بە دەم ریَوە لەتر بدەن
لە سۆراغم بەدوای سەربەستیدا..
ماندووم بەو بارە ئەرخەوانیەوە
من قەستمە ئەو پەرداخە وەلادەم
فریی دەم ئەو ماچانەی دەمبەستنەوە
دەمم پرە لە شاتوو
لە زمانی خەلکانی دیکە
لەژیر قورسایی ئەو دەستە ئەستورانە
ئەو تف و لیکانە دلم تەواویَ نەخۆشە.
وەلی نهینییەکم لە دلدایەو بە تۆی نالیم..
من ئەو گرەی خۆم خامۆش کرد
دلی خۆیشم لاواز

تا بتوانم بەردەوام بم
بمینمەوە: لەو شوینەی کە دەمزانی
تیایدا قەت گەورە نابم.. گەشە ناکەم
(لەوێ. وا وترا)
تا سەرلەنوێ بتوانم دەنیو هەوایەکی رووتدا بوەستم
بێ دارشەق، دوور لە چاوی جوان
من بە تەنها تۆ جێ ناهیلم
بەلکو پارچەیەکیش لە خۆم
کە زۆر دەترسێ:
لە راستی ئەو سترانەی خۆم.

## "پەرجوو"*

گوێ بگرە
گویت لیە تۆ.. دەیبیستی..؟
من دەیبیستم.
من هەستی پێ دەکەم.
من چاوەریی پەرجوویەك دەکەم کە دێ.
کە لەناو مندا
گریی نیگەرانییەکی کردۆتەوە
*
پیشبینی ئەو پەرجوە بکە.
خەونی پیوە ببینە.
با لە بوونی تۆدا بیتە بوون.
بیزانە! شتیکی باش
وا بەریوەیەو.. دێ.
روەو لای تۆ رێ دەکاتەوە

---
* موعجیزە

وەك هەموو ئەو شتانەی کە ریی خۆیان
روەو فەرزەندەکانی یەزدان
دەدۆزنەوە.
دە گویێ بگرە!

## "دیلن"

دوینێ شەو خەونم بینی
خەون بە کچیکی چکۆلەوە کە هاتە لام
قژی نوالەی رۆشناییەکی گەرم
لە زمانیەوە رەنگیك دەتکا
*
ئەم کچی تۆ بوو
لەودا هەموو ئەو بەرەم بینی
کە من لە هەموو ژیانما بۆی دەجەنگام
بروام پیی هەبوو.. خەونم پیوە دەبینی

## "شۆخ"

لەسەر..
بەرگی
ئەم گۆڤارە
وینەی کچیکی شۆخ دیارە
هەموو ئەو شتەی کە من دەیبینم
دەستە
پیسەکانی منن
کە لاپەرەکان هەلدەدەنەوە

### "شیعری ئەڤین"

دوینێ شەو بە یەکەوە خەوتین
لەژێر ورشە ورشی ئەستێرەکاندا
مانگ چاوانی بازنەیی خۆی
نەدەتروکاند
بەسەر ئیمەدا دەیروانی
لەشمان رووت.. تاریکیشمان لەخۆ دامالی بوو
وەك رەگە رووتەکان
لە یەکدی ئالاّ بووین
رانەکان و ئانیشکەکانیش میوەی پرو قورس بوون
وەك "کەستانە"ی زستانەش دەبریقاینەوە.
لەشی ئەو پیاوەیە کە من خۆشم دەوێ–
دەمی، لیوانی پرتەقالی مەیلەو سوور
سەرسام بە زمانی پەرگول ئاسای،
من توانیم بەنیو دۆل و دەربەندە ئالتوونیەکانی
هەریمی تۆدا بگەریم و.. بیپشکنم
بێ وەستان
شاگەشکەو خۆشحال بەوەی کە هەر رۆژەو
سپیدەیەکی تازە
لە تۆدا دەدۆزمەوە
کازیوەیەك کە لە کانگاو قوولاّیی
بوونی پەنهانی تۆدا
سەرهەلدینێ.

### "نەخۆشیەك.. هیواش"

باوکم کە چوە جەنگی "ڤیتنام" تەمەنی نۆزدە سال بوو
وا مەزەندە دەکەم ئەوەیان رۆحی زامدار کرد.

هەندێ شت هەن کە ناکرێ هەرگیز عەقلی مرۆڤ
پەی پێ ببات..
هەندێ شتی تر کە لەش قەت ناتوانێ لە یادیان بکات..
باوکە لەمەر ئەو شتانە نەدەدوا. لە راستیدا، من مەزەندە ناکەم
کە هەرگیز پرسیاریکم..
لی کردبێ،
من رقم لەوە بوە مەزەندەی ئەوە بکەم چاوە جوانەکانی
ئەو هەموو باران و قورو خویناوە بگرنە خۆیان.
هەر دەبێ لەوە بچێ ئەو جەنگەڵانەی ئەوان تیی کەوتن
وەك دەردو درمیکی لەسەرخۆ
دلی ئەم و.. هەر هەموو هاوەلەکانی خواردبێ و
تا هەنووکەو.. بەردەوام بێ
تا لە ژیاندا مابن هەر واشبێ.

## "هەر هەموو وشەکان"

هەموو ئەو وشانەی کە ئاواتەخوازم پەنجەکانت بەریان کەوێ
هەموو ئەو کاتانەی خۆزگەم بوە
تۆ دەرکیان پێ بکەی
خەم و قەهری خامۆش
کە لە قورگما وشك و رەق
وەك ددانیکی شکاوو
سارد گیر بوە
*
خۆزگەمە گویت لیی بێ
لەو منالەی دەنیو گۆشتی مندا..
دەگری و دەنالینێ
وەها بە کول کە ئیسقانەکانم وە ژان بینێ

*

من خۆزگەمە تۆ دلنەواییم بکەیت و..

ترسەکانم بدوینی

*

من خۆزگەمە کە تۆ بتوانی

وەك زەریاکان لە ئامیزم بگری

هەر هەموو دەمارو ماسولکەکانم هیورو خاو کەیتەوە

لەو هەموو ئازارو برینانەی..

کە وەبیریان دیتەوە

لەو هەموو هیوا تالآنە، هەر هەموو هاوارو قیژەکان

هەردوو ئەژنۆی شکاوم

رۆژانی پر لە هەورو هیل.. ئەوەن تاریك

کە گومان لە چاوانی خۆم بکەم

ئاخۆ تۆ بلیی کرابنەوە.

*

ئەو رۆژانەی کە من هەستم پیێ کردن

چۆن رۆژانی "خەرمانان"

ئەو رۆژە دێ منیش

منیش وەك پایز رەنگ زەردو..

پەژموردە بم

* * *

## "هەندێ جار"

هەندێ جار

وا هەست دەکەم

دلی من

رووەو هەلدیریکی پەنهان و نادیار

لیم دەکەوێ و تلۆر دەبیتەوە

لەنیوان
دیرەکاندا
بۆشاییەکی زۆر هەیە
کە ناتوانم پری بکەمەوە
وەلی هەستی پێ دەکەم
ئەوە دلی منەو..
لیم دەکەویتە خوارێ
دەکەویتە
نیوان
بۆشاییو نیوانە ئاوسەکان
فاسیلەکانی بێدەنگی
هی هەموو ئەو شتانەی
کە تۆ نایدرکینی
هەموو ئەو شتانەش
کە من ناتوانم
لە تۆ داوایان بکەم.

سەرچاوە:

*a night without armor*

*poems*

*JEWEL*

*New- york*

## ئەلێکساندەر پوشکین

# گوللە



پوشکین

### و. لە عەرەبییەوە: عەبدولکەریم شێخانی

ئۆردووگامان لە شارۆچکەی (ن) هەڵدابوو و، ژیانی ئەفسەرانیش ئاشکراو دیارە.. سەر لە بەیانیان خوێندن و ئەسپ سواریو دوای ئەوە نیوەڕۆژەکردن لەسەر خوانی فەرماندەی (فوج)، یان لە مەیخانەی جوولەکەیەك و ئێوارانیش بادەنۆشیو قومارکردن.

شارۆچکەی (ن) تاقەماڵێکی وای لێنەبوو کە بە ڕووی میواناندا کرابێتەوە، یان کچێکی لە تەمەنی شووکردنی تێدابێت، لەبەرئەوە لای یەکتری کۆدەبووینەوەو هیچ شتێکمان لە جلە سەربازییەکانی خۆمان بەولاوە، چاوپێنەدەکەوت.

لە یەك کەسی مەدەنیش بەولاوە، کەسێکی دیکەمان لەگەڵ نەبوو کە سوپایی نەبێت کە ئەویش لە تەمەنی دەوروبەری سیو پێنج ساڵیدا بوو، لەبەرئەوە بە پیرمان دادەنا.

شارەزاییەکەی گەلێك سیفەتی لە ئێمە زیاتری پێبەخشیبوو، هەروەها ڕووگرژییە ئاساییەکەیو ڕەوشتە توندوتیژەکەیو زمانە شڕو دڕەکەشی کارێکی زۆری بۆ سەر مێشکە مندالأنەییەکەی ئێمە هەبوو. ئەو پیاوە جۆرە نهێنیەك لە ژیانیدا هەبوو. ئەو کابرایەکی ڕووس بوو، بەلأم ناوێکی بێگانەی هەبوو.. سەردەمێك لە هێزی سوارەدا خزمەتی کردبوو بەختێکی باشیشی بۆ ڕەخسابوو، کەچی کەس نازانیێ چ هۆیەك وایلێکرد کە واز لە خزمەت بێنێت و لە شارۆچکەیەکی وەها ناخۆشدا جێگیربێت و ژیانێکی دەستکورتانەو لە هەمان کاتیشدا دەستبلأوانە بەرێتە سەر: هەمیشە بە دەستە جلیکی رەشی شر لەبەردا بە ریگادا دەرۆیشت، لە کاتیکدا خوانی بۆ هەموو ئەفسەرەکانی فەوجەکەمان سازدەکرد. لە راستیدا خواردنەکەی لە دوو سیێ جۆر بەولاوە تیپەری نەدەکرد، کە ئەویش سەربازیکی خانەنشین لییدەناو ئامادەی دەکرد، بەلأم شەمپانیا لووزەوی دەبەست. هیچ کەس نەیدەزانی سامانەکەی چەندەو دەرامەتەکەی لە کویوە دیت و کەسیش نەیدەویرا لەم رووەوە شتیکی لیبپرسیێ. کتیبی زۆری هەبوو، زۆربەشیان سەربازیو رۆمان بوون و بە رەزامەندیی خۆی بۆ خویندنەوە دەیدانە خەلك و داواشی لە کەس نەدەکرد کتیبەکەی بۆ بگیریتەوەو بەرامبەر بەوەش ئەو کتیبەی وەریدەگرت، نەیدەدایەوە بە خاوەنەکەی.

کاری سەرەکیی ئەو پیاوە نیشانگرتن بوو بە دەمانچە.. دیوارەکانی ژوورەکەی بە گوللە کون کون بووبوون و خانەخانە وەك شانەی هەنگوینیان لیهاتبوو، تاکە خۆشی، کە لەو کوختە شرۆلەی ئەویێ تیدا دەژیا، هەبووبیت، کۆمەلە دەمانچەیەکی چاك بوو. لە دەستراستی و نیشانشکاندنیشدا ئەوەندە کارامە بوو کە پیاو باوەری نەدەکردو ئەگەر تیرو پشك بهاویژرایە کە ئەو دەتوانیێ بە دەمانچە دەنکە قۆخیك لەسەر شەپقەی یەکیك هەلگریێ، ئەوا کەس لە فەوجەکەی ئیمە سیێو دووی نەدەکردو دەنکە قۆخەکەی دەخستە سەر سەری خۆی. لای ئیمە بە زۆری قسە لە بارەی شەرەدەمانچەوە دەکراو سیلڤیۆ (ناوی وا دەبەم) هەرگیز لووتی نەدەژاندە ئەو باسانەوە. جاریکیان لییان پرسی کە ئایا قەت روویداوە شەرەدەمانچەی کردبیێ، بە وشکی وەلأمی دایەوەو وا دیاربوو کە ئەو جۆرە پرسیارانەی بە دل نیەو ئیمە وای بۆ چووین کە لەبەر دەست راستییە ترسناکەکەی، لەوانەیە ویژدانی سەبارەت بە قوربانییەکی بەختەرەش، ئازاری بدات.. بەهەرحالْ هیچ گومانیکمان لەوەدا نەبوو کە ئەو پیاوە جۆرە شەرم بەخۆبوونیکی تیدایە. کەسانی واش هەن کە تەنیا روالەتیان بەسە بۆ ئەوەی ئەو

جۆرە گومانانـەیان لێ دوور بخاتـەوە، بـەڵام لـەو سـەروبەندەدا ڕووداوێکـی لـە ناکـاو ڕوویدا کە هەمومانی سەرسام کرد.

جارێکیـان دەوروبـەری دە ئەفسـەر بوویـن نـانی نیوەڕۆمـان لەسـەر خوانـی سـیلڤیۆ دەخـواردو هـەروەکو جـاران بادەنۆشـیمان دەکـرد، واتـە زۆرمـان خواردبـووەوە. دوای نیوەڕۆژەکـردن هـەوڵمان دا کـە قەناعـەت بـە خانەخوێکـەمان بێنـین ببێتـە میریـاریو یاریەکەمان بۆ بەڕێوەبەرێ.. جارێ ماوەیەکی زۆر هەر خۆداری کرد، چونکە ئەو زۆر بە دەگمەن نەبوایە یاری نەدەکرد؛ دوایی سەرەنجام داوایکرد کە کاغەز ئامادەبکەن و پـەنجا پارچـە دراوی زێڕی لەسـەر مێزەکـە دانـاو دەسـتیکرد بـە کاغـەز دابەشـکردن.. ئێمەش دەورمان لێداو یارییەکە دابەسترا. سیلڤیۆ عادەتی وابوو کە لە کاتی یاریدا کپ و بێدەنگ بوو و هەرگیز چەندوچۆن و چەنگ بەردەی نەدەکردو هیچیشی بۆ کەس لێکنەدەدایەوەو ئەگەر لە پارە داناندا هەڵەیەك لە یاریزانێکەوە ڕووی بدایە، خێرا کەمیەکەی پڕدەکردەوە، یـان زیادەکـەی دەنووسـی. هـەمووشمان ئـەوەمان دەزانـیو ڕێگەی ئەوەمان لێنەدەگرت کە بەو شێوەیەی خۆی دەیەوێ سەروکاری کارەکە بکات، بەڵام ئەفسەرێك کە تازە دامـەزرابوو یـاری لەگـەڵ دەکردیـن و لـە کـاتی یاریەکـەدا لێـی تێکچوو و بـە هەڵـە زیـادیکرد، سـیلڤیۆش دەسـتیدایە پارچـە تەباشـیرێك و بـە پێـی نەریتەکەی خۆی حیسابەکەی ڕاستکردەوەو ئەفسەرەکە وایزانی کە هەڵەی کردووەو دەستی بە لێکدانەوەی کارەکە کرد.. سیلڤیۆ بە بێدەنگی لەسەر کاغەز دابەشکردن ڕۆیشت، ئەفسەرەکە ئارامی لێهەڵگیراو دەستیدایە تەختەسڕەکەو ئەوەی سڕیەوە کە بەلای ئەوەوە پێویست نەبوو. سیلڤیۆ پارچە تەباشیرێکی گرت بە دەستەوەو دووبارە نوسـیییەوە.. ئەفسـەرەکە ئەمـەی بـە سـووکایەتی پێکردنێکی قورس دانا، لـە کـاتێکدا ئەوەندە سەرخۆش بوو و سوور هەڵگەڕابوو لەبەر یارییەکەو پێکەنینی هاوڕێکانی، زۆر بە تووڕەیی تاوی دایە مۆمدانێکی کانزا کە لەسەر مێزەکە بوو وە گرتییە سیلڤیۆو ئەمیش خۆی لادا. ئێمە هەموومان شڵەژاین، سیلڤیۆ ڕاست بووەوەو لە ڕقان ڕەنگی هـەڵبزڕکابوو، لـە کـاتێکدا هـەردوو چـاوی دەبریسـکانەوە گوتـی: "گـەورەی بـەڕێز.. فەرموو بۆ دەرەوەو سوپاسی خواش بکە کە ئەمە لە ماڵەکەی خۆم ڕوویدا".

ئێمـە هیـچ گومانێکمـان لـە ئاکامەکـەی نـەبوو، وامـان دانـا کـە دەبـێ ئـەو هاوڕێیـە تازەمـان بکوژرێـت.. ئەفسـەرەکە چووە دەرێ دوای ئـەوەی گوتـی کـە ئامادەیـە بچێتـە ژێربـاری بەرپرسـایەتی ئـەو سـووکایەتی پێکردنـە بـەو شـێوەیەی کـە بـەڕێز میریـاری یاریەکە دەیەوێ. یاریەکە چەند دەقیقەیەکی دیکە بەردەوام بوو، بەڵام هەستمان بەوە

دەکرد کە خانەخوێیەکەمان حەز بە یارییەکە ناکات. بۆیە ئێمەش یەك لە دوای یەك کشاینەوە. لێك جیابووینەوە بۆ ماڵەوەو باسی ئەگەری ئەوەمان دەکرد کە بەم زووانە فەرمانێك بە چۆڵی دەمێنێتەوە.

بۆ سبەینێ لە مەیدانی ئەسپان پرسیاری ئەوەمان دەکرد ئایا ئەفسەرە کلۆڵەکە هێشتا هەر زیندووە؟ کە خۆی پەیدابوو، هەمان پرسیارمان لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوە کە تا ئێستا سیلڤیۆ هیچ شتێکی پێڕانەگەیاندووە. ئەم کارە سەرسامی کردین. کە چووشین بۆ لای سیلڤیۆ، دیمان لە حەوشەکە یەك لە دوای یەك فیشەك دەگرێتە کاغەزێکی بیللی (ئاس) کە بە دەرگاکەوە چەسپی کردبوو.

وەك نەریتی جارانی پێشوازی لێکردین، بەڵام بە تاقە وشەیەکیش ئاماژەی بۆ ڕووداوەکەی دوێنێ نەکرد. سێ ڕۆژی بە سەردا تێپەڕیو ئەفسەرەکە هەر زیندوو بوو. بە سەرسامییەوە لە خۆمانمان دەپرسی: "ڕێی تێدەچێ سیلڤیۆ شەڕە دەمانچە نەکات؟" بەڵام سیلڤیۆ شەڕە دەمانچەی نەکردو بە ڕوونکردنەوەیەکی کەم ڕازی بوو و ئاشتی بووەوە.

لە سەرەتادا، لە بەرچاوی لاوان، ئەمە زیانێکی زۆری پێگەیاند، چونکە نەوێران زۆر کەمتر دەبێتە مایەی لێبوردن لای ئەو لاوانەی کە بە زۆری ئازایەتی بە بەرزترین پلەی کەرامەتی مرۆڤ دادەنین و هەموو شوورەیییەکەش دەسڕیتەوە. هەرچۆنێ بێ بە بەسەردا تیپەرینی کات، بیرچوونەوە بالی بەسەر هەموو شتیکدا کیشاو سیلڤیۆ هەمان کارتیکردنی پیشووی پەیداکردەوە.

تەنیا من مابوومەوە کە نەمدەتوانی لیی نزیك بکەومەوە. پیش ئەو ماوەیەو لەبەرئەوەی بە ئەندیشەیەکی رۆمانسیانە راهاتبووم، لە هەموو کەسیك زیاتر هۆگری ئەو پیاوە بووبووم کە ژیانی پەرلەیەك بوو بۆ خۆیو وا دەهاتە بەرچاوم کە پالەوانی چیرۆکیکی لیل و نەزانراوە. خۆشیدەویستم، یان بەلای کەمەوە ئەو زبرییە توندوتیژەی کە لە قسەکردنیدا باوبوو، لەگەڵ مندا بەکاری نەدەهیناو بە دەروونیکی ساکارو خوو نەرمییەکی ناباوەوە باسی بابەتی جیاجیای دەکرد، بەڵام ئەو بیرۆکەیەی کە دوای ئەو ئیوارە بەدبەختە لام گەڵالە بوو، ئەویش ئەوەیە کە شەرەفی لەکەدار کرا، نەشۆرایەوە. گلەییەکەش دەکەویتە ئەستۆی خۆی، ئەو بیرۆکەیە بەردەوام زۆری بۆ دینام و ریگەی ئەوەی لیدەگرتم کە وەکو جاران رەفتارو هەلسوکەوتی لەگەلدا بکەم، بۆیە رووم نەدەهات سەیری بکەم. سیلڤیۆ زیرەك و بە ئەزموون بوو ئەمەی بەسەردا

تێنەپەڕیو لێی نەشاررایەوەو واش دیاربوو کە ئەم کارە خەمباری دەکردو، بەلای کەمەوە دوو جار هەستمکرد دەیەوێ قسەم لەگەڵ بکات، بەڵام من خۆم لادەداو ئەویش خۆی لێ دووردەخستەوە. ئیدی لەوساوە بە ئامادەبوونی هاوڕێکان نەبوایە نەمدەدیت و قسە ڕاشکاوەکانی پێشوومان نەما.

زۆر شت هەیە کە خەڵکی پایتەخت بیریان بۆی ناچێ لە کاتێکدا لای خەڵکی لادێ یان شارۆچکەکان شتێکی ئاسایی‌و زانراوە. لەوانە چاوەڕوانی کردنی ڕۆژی پۆستەهاتن کە نووسینگەی نوسراونوسیی فەوجەکەمان لە ڕۆژانی سێ شەممەو هەینی بۆ نامە پڕ دەبوو لە ئەفسەر.. ئەوەتا یەکێك چاوەڕوانی ئەوەیە پارەی بۆ بێت، یەکێك نامەو یەکێکی تر ڕۆژنامەو، بەستەکیش هەر لەوێ دەکرایەوەو هەواڵ بڵاودەکرایەوە.. وایلێهاتبوو نووسینگەی نامەنووسی بووبوو بە وێنەیەکی پڕ جووڵەی ژیان. سیلڤیۆ ئەو نامانەی وەردەگرت کە بە ناونیشانی فەوجەکەی ئێمە دەهاتن، چونکە ئەو بە زۆری هەر لەوێ بوو.

ڕۆژێکیان زەرفێکی درایە دەست و زۆر بە پەلە هەڵیپچڕی. کاتێ کە چاوی بە نامەکەدا گێڕا، هەردووچاوی بریسکەیان دەهات. هەر ئەفسەرە خەریکی نامەی خۆی بوو، بۆیە کەس ئاگای لەو نەبوو: سیلڤیۆ پێی گوتن: "بەڕێزینە.. بارودۆخ وا پێویست دەکات من بڕۆم.. ئەمشەو من ئێرە بەجێدەهێڵم، هیوام وایە بۆ نیوەڕۆژەکردن بۆ دواجار لەسەر خوانی من دەست بە ڕوومەوە نەنێن، لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و ڕوویکردە من: هەرچی چۆنێ بێت چاوەڕوانی تۆش دەکەم".

کە ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر چووە دەرێو ئێمەش لەسەر ئەوە ڕێککەوتین کە لای ئەو کۆبینەوە، ئەوسا چووینە دەرێو هەریەکە بۆ لای ئیشوکاری خۆی ڕۆیشت.

لە کاتی دیاریکراودا گەیشتمەماڵەکەی سیلڤیۆ، دیتم تا ڕادەیەك هەموو فەوجەکە لەوێ بوون و هەموو شتومەك و کەلوپەلەکانیشی کۆکرابوونەوەو لە دیوارە ڕووتەکان بەولاوە، کە ئەوانیش گوللە کونکونی کردبوون، هیچی دیکە نەمابووەوە. لەسەر خوانەکە دانیشتین و خانەخوێکەشمان زۆر دڵخۆش بوو و ئەوەندەی پێنەچوو ئەو دڵخۆشییەی ئەو ئێمەشی هەموو گرتەوە. کە شووشەکان دەکرانەوە، تەقەیان دەهات و پەرداخەکانیش بێ پچڕانەوە کزەکزیان لێهەڵدەستا. زۆر بە گەرمییەوە هیوای سەفەرێکی پڕ خێرو خۆشی‌و سەرکەوتوانەمان بۆ سیلڤیۆ خواست. کە لەسەر خوانەکە هەستاین، ئێوارە درەنگ بوو بوو و کە ئاهەنگەکەش تەواو بوو، سیلڤیۆ

هەمووی بەڕێکردن و کە منیش ویستم بڕۆم، دەستی گرتم و بە دەنگێکی نزم گوتی: "دەمەوێ هەندێ قسەت لەگەڵ بکەم".. ئیدی منیش مامەوە.

میوانەکان ڕۆیشتن و ئێمە بە تەنیا ماینەوە. بەرانبەر یەکتر دانیشتین و بەبێ دەنگی دەستمان بە پایپ کێشان کرد. سیلڤیۆ خەیاڵی ڕۆشتبوو و هیچ نیشانەیەکی ئەو ڕووخۆشییەی پێشووی پێوە دیارنەبوو. ڕەنگە هەڵبزرکاوە خەمبارانەکەی و دوو چاوە بریقەدارەکانی و ئەو دووکەڵە چڕەی لە دەمی دەهاتەدەر، شێوەی شەیتانێکی ڕاستەقینەی پێبەخشیبوو. چەند خولەکێك تێپەڕی.. ئینجا سیلڤیۆ لەپڕ بێدەنگییەکەی شکاندو پێی گوتم:

-"لەوانەیە جارێکی دیکە چاومان بە یەکتر نەکەوێتەوە، بۆیە بە پێویستی دەزانم پێش لێکدابڕانمان ڕاشکاوانە هەموو شتێکت پێبڵێم. ڕەنگە خۆت تێبینی ئەوەت کردبێت کە من کەمتر ڕێز لە ڕای خەڵکی دەگرم، بەڵام تۆم خۆشدەوێ و خەمیشی پێدەخۆم ئەگەر بۆچوونێکی نەشیاو لە دڵ و دەروونتدا جێبهێڵم".

کەمێك وەستاو دەستیکرد بە پڕکردنی پایپە بەتاڵەکەی و منیش بێدەنگ بووم و سەرم داخست.. دوای ئەوە لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گوتی:

-"ڕەنگە لات سەیربووبێ کە من داوام لەو (ر) بێ مێشکە سەرخۆشە نەکرد شەڕە دەمانچە بکەین.. تۆ لەگەڵمای کە گیانی ئەو لەبەردەستی مندابوو و، مافی هەڵبژاردنی چەکیشم هەبوو، لە کاتێکدا من تا ڕادەیەك لە گیانی خۆم ئەمین بووم، دەتوانم ئەو لێبوردەییەی خۆم بە جۆرە نەرمییەك دابنێم، بەڵام نامەوێ درۆت لەگەڵ بکەم، ئەگەر بمتوانیبایە (ر) سزابدەم و گیانی خۆم نەخەمە مەترسییەوە، ئەوا هەرگیز لێی خۆش نەدەبووم".

بە سەرسوڕمانەوە سەیری سیلڤیۆم کرد.. چونکە ئەو پێڵێنانەی سەرسامی کردم. سیلڤیۆ لەسەر قسەکەی خۆی ڕۆیشت و گوتی:

"شتەکە بە تەواوەتی بەم جۆرەیە.. مافی ئەوەم نیە کە خۆم بخەمە بەر مەترسی مەرگ. شەش ساڵ لەمەوبەر زیللەیەکم لێدراوەو ئەوەیش کە زیللەکەی لێدام هێشتا هەر زیندووە.

بەم قسەیە، هەستی شت زانینی بە توندی لا وروژاندم.. لێم پرسی:

-شەڕە دەمانچەت لەگەڵ نەکرد؟ بە دڵنیایی بارودۆخەکە ڕێگەی ئەوەی لێگرتووی!

سیلڤیۆ وەڵامی دایەوە:

-شەڕە دەمانچەم لەگەڵدا کرد.. ئەمەش شوێنەواری شەڕە دەمانچەکەمانە. سیلڤیۆ هەستاو لەنێو قوتوویەکی کارتۆن کڵاوێکی سووری دەرهێنا کە گوڵنگەیەکی زێڕین و شریتێکی ئاوریشمی پێوەبوو لەو جۆرەی کە فەرەنسییەکان پێیدەڵێن کڵاوی پۆلیسان *Bonnet de police* و کردیە سەری. کڵاوەکە بە بەرزی دوو پەنجە لەسەر نێوچەوانەوە بە گوللە کونێکی تێبووبوو. سیلڤیۆ درێژەی بە قسەکانی دا:

-"تۆ خۆت دەزانی کە من لە فەوجی ئەسپ سوارانی (ك) خزمەتم دەکردو ڕەوشتی منیش دەزانی: خووم بە سەرکەوتنەوە گرتبوو، بەڵام لە گەنجێتیمدا ئەمە هەوایەك بوو لە کەللەی دابووم. بەدڕەفتاری‌و کردار زبری لە سەردەمی ئێمەدا مۆدە بوو و منیش یەکەم ڕەفتار زبر بووم لە سوپادا. بۆ بادەنۆشی پێشبڕکێمان دەکردو لە (بۆرتسۆف)ی بەناوبانگم بردەوە کە (دینیس داڤیدۆف) پێی هەڵدەڵێ. شەڕە دەمانچە لە فەوجەکەی ئێمەدا پەیتاپەیتاو بە بەردەوامی دەکراو منیش وەك شایەدێك یان وەك بەشدارێك ئامادەی هەمووی دەبووم. کەوتبوومە بەردڵی هاوڕێکانم و خۆشیان دەویستم و فەرماندەی فەوجەکان بەردەوام دەگۆڕان بە شێوەیەك سەیریان دەکردم وەك سەیری بەڵایەك بکەن کە هەر دەبێ ببێ.

بە هێمنی (یان بە ناهێمنی) دڵم بە ناوبانگەکەی خۆم خۆشبوو، کاتێك کە لاوێکی دەوڵەمەندی سەر بە خانەوادەیەکی خانەدانمان بۆ هات (نامەوێ ناوی بهێنم). من لە ژیانمدا یەکێکی دیکەی وەك ئەو لاوەم بەختەوەرو ورشەدار نەدیوە! ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت: گەنجی‌و ژیری‌و قۆزی و ڕووخۆشیەك تا ئەوپەڕی‌و ئازایەتییەکی پڕ لە نیشانەی بێباکی‌و ناوو ناوبانگ و ماڵ و سامانێك کە لە ژماردن نایە، ڕۆژێك لە ڕۆژان لای ئەو کەمی نەکردووە.. تۆ بڵێی دەبێ چ کارێکی تێکردبین؟! باڵادەستییەکەم کەوتە لەقەلەق. ئەو لاوە هەوڵی ئەوەی دەدا دۆستایەتیم لەگەڵدا ببەستێ، چونکە ناوبانگی من مەستی کردبوو، بەڵام من بە ساردی پێشوازیم لێکردو ئەویش بێ داخ خواردن لێم دوورکەوتەوە. لە دڵی خۆمدا ڕقم لێهەڵگرت، سەرکەوتنەکانی لەنێو فەوج و لە نێوان ئافرەتاندا پاڵی بەرەو نائومێدی پێوەدەنام. واملێهات چاوەڕێی هەلم دەکرد تا لەگەڵی بەشەڕ بێم. کە قسەو پلارم تێدەگرت ئەو هەمیشەو تا ڕادەیەکی زۆر بە پلاری سووکترو ناسکتر لەوەی خۆم، وەڵامی دەدامەوە. ئەو گاڵتەی دەکردو منیش داوم بۆ دەنایەوە. سەرەنجام جارێکیان، لە ماڵی زەویدارێکی پۆلۆنی سەیرم کرد جێ بایەخی هەموو خانمەکانە، بە تایبەتیش خانمی خاوەن ماڵ کە من پەیوەندییەکم

لەگەڵیدا هەبوو. سەرم بردە پەناگوێی‌و بە ئاشکرا قسەیەکی ناشیرینم پێگوت و ئەویش ڕقی هەستاو بە زیللەیەك لاڕوومەتی چوزاندمەوە. هەریەکەمان تاوماندایە شمشێرو ژنەکان دڵیان لەخۆبووەوە.. خەڵك کەوتنە نێوانمانەوەو هەر بەو شەوە چووین بۆ شەڕە دەمانچە.

ئەو ڕووداوە کاتی بەیانی بوو. بە هەرسێ شایەدەکەمەوە لە شوێنی دیاریکراودا ڕاوەستام و بەبێ ئارامییەکی لە باسکردن نەهاتوو چاوەڕوانی نەیارەکەمم کرد. خۆری بەهاری هەڵات و دنیا گەرم داهات، لە دوورەوە چاوم پێیکەوت.. دەهات و چاکەتەکەی لەسەر شمشێرەکەی بوو و تەنیا تاقە شایەدێکی لەگەڵ بوو. ئێمە بەرەو ڕووی چووین و ئەویش بە شەپقەیەکی پڕ لە گێلاسەوە نزیك بووەوە. شایەدەکان دوانزدە هەنگاویان لە نێوانماندا پێوا. دەبوایە من یەکەم جار تەقە بکەم، بەڵام لە ناخەوە ڕقم ئەوەندە هەستابوو بە ئەندازەیەك کە نەمدەتوانی نیشان بگرم و بۆ ئەوەی کاتێکی وا بۆ خۆم بڕەخسێنم کە ڕقەکەم بنیشێتەوە، لە مافی خۆم خۆش بووم بۆ ئەوەی یەکەم تەقە بۆ ئەو بێت. نەیارەکەم بەمە قایل نەبوو، بۆیە بڕیارمان دا تیروپشك بهاوین.. لە ئەنجامدا ژمارەی یەکەم بۆ ئەو بوو، بۆ خۆشەویستی هەمیشەی بەخت. سێرەی لێگرتم و بەر کڵاوەکەم کەوت. ئینجا نۆرەی من هات و سەرەنجام ژیانی لەبەردەستی مندا بوو. پر بە ئارەزوو سەیرم کردو هەولی ئەوەم دا کەمترین سیبەری شلەژانی لیوە بەدیبکەم.. لەبەر رەحمەتی دەمانچەکەی من وەستابوو، دەنکە گیلاسی گەییووی لەنیو کڵاوەکەی هەلدەبژاردو ناوکەکانی بە دەم فرێ دەدا بە رادەیەك کە دەگەیشتە لای من. ئەو بیباکییەی شیتی کردم و لە دلی خۆمدا بیرم کردەوە: من چ سوودیك لەوە وەردەگرم کە ژیانی لیبستینم، لە کاتیکدا ئەو بە تەواوەتی گالتەی بەو ژیانە دەهات. لەپر بیرۆکەیەکی تۆلەکەرەوە لە میشکمدا بریسکەی‌دا. دەمانچەکەم داگرت و پیمگوت: "وا دیارە لەم کاتەدا مردنت بە خەیالدا نایەت.. ئەوەتا قاوەلتی دەکەیت و من ریگەت ليناگرم".

بەرپەرچی دامەوەو گوتی: "نەخیر، هەرگیز ریگەت لینەگرتووم.. فەرموو تەقەی خۆت بکە، بەهەرحاڵ، چۆنت دەوێ وا رەفتار بکە.. من گوللەیەکی تۆ قەرزارم. من هەمیشە ئامادەم و لە خزمەتتدام".

چووم بۆ لای شایەدەکان و بە ئاشکراو روون پیمگوتن کە من نیازم وا نیە ئەمرۆ تەقە بکەم و، ئیدی بەم شیوەیە شەرە دەمانچەکە کۆتایی هات. دەستم لە کار

کیشـایەوەو هاتمـە ئـەم شـارەو لەوسـاوە رۆژیکـم بەسـەردا تینەپـەریوە کـە بـیرم لــە تۆلەکردنەوە نەکردبیتەوە. ئەمرۆش وا کاتی تۆلەکردنەوە هاتووە.

سـیلڤیۆ ئـەو نامەیـەی لـە گیرفـانی خـۆی دەرهینـا کـە ئـەو بەیانیـە بـە دەسـتی گەیشـتبوو و دایـە مـن بیخوینمـەوە. یـەکیك لــە مۆسـکۆوە (وا دیـار بـوو بریکـاری کاروباری بوو) بۆی نووسیبوو کە ئەو کەسەی خۆی دەیناسێ بەم زووانە خەریکە کچە جحیلیکی زۆر جوان مارە دەکات.

سیلڤیۆ گوتی:

"دیارە خۆت دەزانی ئەو کەسـەی خـۆم دەیناسـم کییـە. مـن دەچـم بـۆ مۆسـکۆ.. بـا بزانین ئایـا پیـش ژنهینانیشـی وەك ئـەو جـارە کـە گیلاسـی دەخـوارد، بـە پیر مەرگـەوە دەچیت؟!

لەگەڵ ئەم قسانەدا سیلڤیۆ هەستایە سـەرپێو کلاوەکـەی فریدایـە سـەر زەویو لـە ژوورەکەدا وەك پلنگی بەندی قەفەز دەستیکرد بە هاتوچۆ.

بیئەوەی لە شوینی خۆم ببزووم، گویم لیگرتبـوو و چـەندان هەسـتی لیك جیا لـە دەروونمدا تیك هەلدەنگووتن.

نۆکەرەکەی هاتە ژوورەوەو گوتی کە ولاخەکان ئامادەن. سیلڤیۆ بە توندی دەستی گوشیم و یەکترمان ماچ کردو سواری عارەبانەکەی بوو کە دوو جانتای تیدا دانرابوو، یـەکیکیان دەمانچـەکانی تیدابـوو و ئـەوی دیکەشـیان کەلوپەلـەکانی. جـاریکی دیکـە دوعاخوازیمان لە یەکتر کردو ولاخەکان دەرپەرین و رۆیشتن.

(٢)

چەند سالیك تیپەریو بارودۆخی خیزانیم ناچاریکردم کە بگویزمەوە بۆ گوندیکی هەژار لە قەزای (ن).

کە خـەریکی ئیشوکار دەبووم، هەمیشـە خـەمم بـۆ ژیانـە پرخۆشـیو کامـەرانیو پـر غەلبەغەلبەکەی رابردووم دەخوارد و قورسترین شت لام ئەوەبوو خۆم بەوە رابینـم کـە ئیوارەی پایزو زستان بە تەنیا ببەمە سـەر. بـە هـەر جۆریـك بوایـە بـە قسـەکردن لەگـەڵ کویخای دێ، کاتم دەگەیاندە وەختی نیوەرۆژە و کارو پرۆژەی تازەم بەسەردەکردەوە، بەلام هەر کە ئیوارە دادەهات نەمدەزانی بچمە کوێو روو لەکوێ بکەم. ئەو چەند کتیبە کەمەی کە لەژیر دۆلاب و لە ژووری زەخیرە دۆزیبوومنەوە، هـەموویانم بـە لەبـەرکردن، لەبەرکردبوو. خاتو (کیریلۆڤنا)ی بەریوەبەری مالەکەش ئەو چیرۆك و سـەرگوزشـتانەی

لەبیری مابوون، بۆی دووبارە کردبوومەوە. گۆرانی ژنانیش سۆزیان بە دلم دەبەخشی. ئیدی دەستمکرد بە خواردنەوەی مەیەکی زۆر خەست و کاریگەر، بەلام تووشی ژانەسەری دەکردم و لەوەش دەترسام کە لە خەمان ببمە ئارەق خۆریکی بەردەوام و ئومیدی چاکبوونەوەم لینەکرێ، چونکە گەلیك کەسی لەو جۆرەم لە قەزایەکەی خۆمان دیبوو. لە دوو سێ کەسیش بەولاوە، هیچ دەرو دراوسییەکی نزیکی وام لە دەورو پشت نەبوو، کە ئەوانیش چاوەروانی چاکبوونەوەیان لینەدەکراو زۆربەی قسەکانیان هەر ئاخ و ئۆف بوو، بۆیە دوورەپەریزیو کەنارگیری زۆر لەوە باشتر بوو.

گوندیکی پر خیرو بیر هەبوو کە چوار فەرسەخ لە منەوە دوور بوو کە هی خاتوو (ب) بوو، بەلام جگە لە سەرپەرشتیارەکە کەسی دیکەی لیدانەدەنیشت و خاتوونی (کۆنتیسە) ئەوەتەی شووی کردبوو، لە تاقە جاریك بەولاوە ئەویش لە سالی یەکەمی شووکردنەکەیدا– سەردانی دییەکەی نەکردبوو، تەنانەت ئەو تاقە جارەش لە مانگیك زیاتر نەمابووەوە. بەلام لە دووەم بەهاری نیشتەجێبوونم لەو کەنارگیرییەمدا، دەنگویەك بلاوبووەوە دەیگوت کە کۆنتیسە خانم و میردەکەی هاوین لە دییەکەی خاتووندا بەسەردەبەن. لە راستیشدا لە سەرەتای مانگی حوزەیراندا گەیشتن.

هاتنی دراوسییەکی دەولەمەند بۆ خەلکی گوندەکە رووداویکی گرنگ بوو و خاوەن زەویوزارو کۆیلەکان دوو مانگ پیش روودانی باسی دەکەن و دوای کۆتایی هاتنیشی بە سێ سال هەر ئەوە دەیلینەوە، بەلام من خۆم دان بەوەدا دەنیم کە هاتنی دراوسییەکی جحیل و زۆر جوان کاریکی زۆری لە دەروون و ناخم کرد، لەبەرئەوە ئاگری حەزو پەرۆشی بۆ بینینی ئەو خانمە، لە گیانم بەربوو، هەر بۆیەش دوای نیوەرۆی یەکەم رۆژی یەك شەممەی دوای هاتنیان، رووومکردە گوندی (س) بۆ ئەوەی وەك دراوسییەك و نۆکەریکی گویرایەلیان، خۆم بە هەردووکیان بناسینم.

نۆکەرەکە بۆ نووسینگەی (کۆنت) پیشمکەوت و چوو هەوالی هاتنی منیان پیرابگەیەنێ. ژووره گەورەو فراوانەکەی نووسینگەکە زۆر بە جوانیو دەولەمەندانە رازابووەوە. دۆلابە کتیب لە نزیك دیوارەکان ریزکرابوون و هەریەکەشیان کۆتەل (تیمسال)یکی تا نیوەی برونزی لەسەر بوو. ئاوینەیەکی گەورەش لە سەرەوەی مغەیرییە (کوورە) مەرمەرییەکەی هەلواسرابوو و، زەوییەکەش بە (چووخ)ی سەوز داپۆشرابوو و لەسەر ئەویشەوە قالی (فەرش) راخرابوو. لە گۆشە کلۆلەکەی خۆمدا خۆشگوزەرانیم لەبیرچووبووەوە، بۆیە سام و ترسیکی زۆر دایانگرتم و بە لەرزە لەرز

وەك كابرایەكی لادییی كە بە پارانەوەوە بروانیتە وەزیریك، چاوەروانی كۆنتم كرد. دەرگاكە كرایەوەو پیاویكی تەمەن لە دەوروبەری سیو دوو سالیی قۆزو ریكپۆش هاتە ژووری. بە روویەكی گەش و پر خۆشەویستییەوە، كۆنت لیم نزیكبووەوە. هەولم دا زات بدەمە بەرخۆم و دەمویست خۆمی پیبناسینم، بەلام وا دیاربوو ئەو پیشەكی منی دەناسی. دانیشتین و ئەوەندەی پینەچوو، قسە خۆشەكانی شەرمیان شكاندم و خەریكبووم دەگەرامەوە سەر بارودۆخە ئاساییەكەی خۆم، بەلام لەپر خانمی كۆنتیسە هاتە ژووریو شلەژاوی لە جاری پیشو پتر دایگرتم.. بە راستی زۆر جوان بوو. كۆنت منی پیناساندو منیش هەولی ئەوەم دەدا ئاسایی ببمەوە، بەلام هەرچەندم دەكرد خۆم رووگەشانە پیشانبدەم، پتر هەستم بە شلەژان و پەشۆكاوی دەكرد. جا بۆ ئەوەی دەرفەتیكم بۆ برەخسینن بیمەوە سەرخۆم لەو یەكترناسینە تازەیە رابیم، ئەوان لە نیوان خۆیاندا دەستیان بە قسەكردن كردو وەك دراوسییەكی باش، دۆستانە رەفتاریان لەگەلدا كردم. لەو ماوەیەدا خەریكبووم دەهاتم و دەچووم و سەیری كتیب و تابلۆكانم دەكرد. من هیچ شارەزاییەكم لە تابلۆدا نیە، بەلام یەكیكیان سەرنجی راكیشام كە دیمەنیكی سویسرا بوو. ئەوەی كە سەرنجی راكیشام هونەرەكە نەبوو، بەلكو ئەو دوو گوللەیە بوو كە لە یەك شویندا كونیان كردبوو. روومكردە كۆنت و گوتم:

—دوو نیشانەی دەستراستیانە!

وەلامی دایەوە:

—بەلێ، لە راستیدا زۆر كارامانەن. دوای ئەوە دریژەی بە قسەكەی داو گوتی:

—لە نیشانگرتندا باشی؟

زۆرم پیخۆشبوو كە سەرەنجام قسە لە بابەتیكەوە كرا كە بە دلی من بوو، بۆیە وەلامم دایەوە:

—زۆرباش، ئەلبەت ئەگەر ئەو دەمانچەیەی خۆم دەیزانم پیم بێ، لە دووری سی هەنگاوەوە كاغەزی یاری دەئەنگیوم.

خانمی كۆنتیسە بە بایەخدانیكی زۆرەوە، پرسی:

—بە راستی؟ ئەی تۆ هاورێ، لە دووری سی هەنگاوەوە كاغەزیكی یاری دەئەنگیوی؟

كۆنت وەلامی دایەوە: لە وەختیكی دیكەدا ئەوە تاقیدەكەینەوە. لە كاتی خۆیدا نیشان شكاندنم خراپ نەبوو، بەلام ئەوە چوار سالە دەستم لە دەمانچە نەداوە.

گوتم:

–ئۆی! لەو حالەتەدا گرەو دەکەم کە بەریزت لە دووری بیست هەنگاویشەوە لە کاغەزی یاری نادەیت و نایپیکی، چونکە دەمانچە مەشقی رۆژانەی دەوێو من ئەوە لە ئەزموونی خۆمەوە دەزانم. من لە فەوجەکەی خۆمدا یەکیك بووم لە نیوان باشترین نیشانشکینەکاندا. جاریکیان وا ریککەوت کە مانگیك دەستم لە دەمانچە نەدا، چونکە بۆ چاککردنەوە ناردبوومنە سەر وەستا. ئەی رای بەریزتان چیە؟ دوای ئەوەی کە بۆ یەکەم جار تەقەم کرد، چوار جار لەسەر یەك لە دووری بیست و پینج هەنگاوەوە لە شووشەیەکم نەداو نەمئەنگاوت. ئەفسەریکی زیرەکمان بە پلەی (نقیب) لە هیزی سوارەدا هەبوو، زۆر زیرەك و قسەخۆشیش بوو، پیی گوتم: "برا، وا تیبگەم دەستت ناتوانێ نیشانە لە شووشەیەك بگرێ". نەخیر، بەریز.. نابێ ئەو مەشقانە بە کەم هەلبگری، دەنا نیشانچیتیت لەبیردەچیتەوە. باشترین نیشانشکین کە تووشی هاتبم، بەلای کەمەوە، هەموو رۆژیك دوای نیوەرۆژە کردن، سێ جار نیشانی دەنایەوە. ئەمەی کردبوو بە نەریتیك وەك خواردنەوەی پەرداخە ڤۆدکای پیش نانخواردن.

کۆنت و خانمی کۆنتیسە دلخۆش بوون بەوەی کە گریی زمانم کراوەتەوە.

کۆنت لیی پرسیم:

–چۆن تەقەی دەکرد؟

–خاوەن ریز، بەم شیوەیە: وا ریکدەکەوت کە میشیك لەسەر دیوار هەلدەنیشت.. کۆنتیسە خانم، دەبینم پیدەکەنی؟! بەخوا راستە. میشیکی دەبینیو هاواری دەکرد: "کۆزکا ئەو دەمانچەیەم بۆ بینە!" کۆزکای نۆکەریشی دەمانچەیەکی پر لە فیشەکی بۆ دەهیناو تەقەی لیدەکردو میشەکەی بە دیوارەکەوە پاندەکردەوە.

کۆنت گوتی:

–ئەمە شتیکی سەیرە! ئەو پیاوە ناوی چی بوو؟

–خاوەن ریز.. سیلڤیۆ.

کۆنت لە شوینەکەی خۆی راپەریو هاواری کرد:

–سیلڤیۆ؟ بۆ، تۆ سیلڤیۆت دەناسی؟

–خاوەن ریز، چۆن نایناسم! ئیمە هاوریی یەکتری بووین. وەك برایەك و هاورییەك لە فەوجەکەی خۆمان وەرمانگرت.. ئەوە پینج سالیش تیدەپەرێ بیئەوەی هیچ هەوالیکی بزانم. خاوەن ریز، کەواتە جەنابیشت دەتناسی؟

–دەمناسی.. باشیشم دەناسی. ئەرێ هیچی پینەگوتی؟ بەڵام نا، نا باوەرناکەم؛ باوەرناکەم باسی هیچ رووداوی زۆر سامناکی بۆ کردبیت.

–باسی ئەو زللەیەی کە لاویکی هەلەشە لە ئاهەنگی سەماکردندا لیی‌دا؟ خاوەن ریز وا نیە؟

–ناوی ئەو لاوە هەلەشەیەی پینەگوتی؟

–نەخیر، گەورەم.. نەیگوت.. ئای! دەستم بە قسە کردەوەو گوتم: "گەورەم، ئیستا بیرم بۆ راستیەکە چوو.. دوای ئەوە لەسەر قسەکانم رۆیشتم و گوتم: بمبوورە.. نەمدەزانی، تۆ نەبووی؟"

کۆنت بە دارمانیکی تەواوەوە وەڵامی دایەوە:

–بەلێ، من ئەو کەسەم و ئەو تابلۆ کون بووەش یادگاری دوا چاو بە یەکتر کەوتنمانە.

کۆنتیسە خانم گوتی:

–ئای خۆشەویستەکەم.. توخوا قسە مەکە، چونکە بە بیستنی ئەو رووداوە ترس دامدەگرێ.

کۆنت پیشی پیگرت و گوتی:

–نا، هەموو شتیك دەگیرمەوە؛ ئەو دەزانێ کە چۆن سووکایەتیم بە هاوریکەی کردووەو با ئەوەش بزانێ کە چۆن سیلڤیۆ تۆلەی لیکردمەوە.

کۆنت کورسییەکی بۆ هینامە پیش و منیش بەتاسەوە گویم لە سەرگوزشتەکەی گرت:

"پینج ساڵ لەمەوبەر ژنم هیناو مانگی یەکەمم کە مانگی هەنگوینە لیرە لەم دییەدا بردەسەر. من بە خۆشترین ساتەکانی ژیانم و یەکیك لە تالترین یادگارەکانم، قەرزاری ئەم مالەم.

سەر لە ئیوارەیەك هەردووکمان بە سواری چووینە دەرەوە. لەبەر هەر هۆیەك بێ ولاخی ژنەکەم چەمووشی نواندو پیی چەقاندو ئەویش ترساو جلەوەکەی دایە دەست من و خۆی بە پییان بۆ مالەوە گەرایەوە. من بە سواری پیشی کەوتم و چوومەوە مالەوە. لە حەوشە، عەرەبانەیەکی سەفەرم بینیو پییان راگەیاندم کە کابرایەك بیئەوەی ناوی خۆی بلێ لە نووسینگە دانیشتووەو چاوەروانمەو گوتبووشی کە کاریکی پیمە. چوومە ژوورەوە، لە تاریکیدا کابرایەکی تۆزاویی ریشنم بینی، لیرە لای مغەیرییە (کوورە) کە راوەستابوو، لیی چوومە پیش و هەولیشم دا شیوەو روخساریم

بیربیتەوە.. بە دەنگیکی لەرزۆکەوە پیی گوتم: "کۆنت.. ئەوە نامناسیتەوە؟!" هاوارم کرد: "سیلڤیۆ!" دانیش بەوەدا دەنیم کە تووکی سەرم وەك نەشتەر راوەستا.

کابرا لەسەر قسەکانی رۆیشت و گوتی:

"بە راست.. خۆ هیشتا هەر گوللەیەکم قەرزاریو وا هاتووم و دەمانچەکەشم پرە لە فیشەك.. ئامادەیت؟"

دەمانچەکە لە گیرفانەکەی لاتەنیشتیەوە دیاربوو.. دوانزە هەنگاوم پیواو لە گۆشەیەك لەویَ راوەستام و داوام لیکرد پیش ئەوەی ژنەکەم بگەریتەوە تەقە بکات. دەمانچەکەی لە گیرفانی دەرهیناو نیشانی لیگرتم. چەند چرکەیەکم ژمارد.. بیرم لە ژنەکەم دەکردەوە.. ساتە ترسناکەکە تیپەری! سیلڤیۆ دەستی هینایە خوارو گوتی: "بە داخەوە دەمانچەکەم پر لە ناوکە گیلاس نەکراوە.. گوللەش قورسە. پیم وایە ئەوەی نیوان ئیمە شەرە دەمانچە نیە، بەلکو کوشتنەو منیش وا رانەهاتووم تەقە لە کەسیکی بیچەك بکەم. با سەرلەنویَ دەست پیبکەینەوەو تیروپشك بهاوین تا بزانین کیهەمان یەکەم جار تەقە دەکات". سەرم سووراو گیژبووم. من رازی نەبووم.. سەرەنجام دەمانچەیەکی دیکەمان پر فیشەك کرد؛ دوو پارچە کاغەزی لوول کردو خستنیە ناو کلاَوەکە، هەمان کلاَوی جاری پیشوو کە بە گوللە کونم کردبوو. جاریکی دیکە ژمارەی یەکەمم دەرهینا. هەر بەو زەردەخەنە توانج ئامیزەیەوە کە هەرگیز لە بیرم ناچیتەوە گوتی:

"جەنابی کۆنت.. بەختەوەریەکەت شەیتانیانەیە".

تیناگەم چیم بەسەرهات و بە چ ریگایەك توانی ناچارم بکات کە ئەوە بکەم، بەلاَم تەقەم لیکردو لەو تابلۆیەم دا. لیرەدا بە پەنجە ئاماژەی بۆ تابلۆ کونکراوەکە کردو دەموچاوی وەك ئاگر داگیرسابوو سووربووبووەوەو دەموچاوی کۆنتیسە خانمیش لە دەستەسرەکەی پتر سپی هەلگەرابوو و منیش نەمتوانی هاواری سەرسامی کپ بکەم.

کۆنت لەسەر قسەکانی رۆیشت و گوتی:

"تەقەم لیکرد، بەلاَم سوپاس بۆ خوا لیم نەدا؛ ئەوسا سیلڤیۆ (کە ئەو ساتە بە راستی ترسناك بوو) خەریکبوو نیشانی لیدەگرتم، لەپر دەرگا کرایەوەو ماشا بە هەشتاو هاتە ژووریَو بە قیژاندنیکەوە دەستی لە ملم کرد. ئامادە بوونی ئەو، هەموو ئازایەتییەکی پیبەخشیمەوە. پیمگوت: "ئازیزەکەم، بە راست، نابینی ئەوە گالتە دەکەین.. گالتە؟ چۆن وا ترسایت و زەندەقت چوو؟ برۆ پەرداخیك ئاو بخۆرەوەو

وەرەوە لامان، ئەوسا هاوڕێو دۆستیکی کۆنمت پیدەناسینم". ماشا هیچ باوەری نەکردو بە سیلڤیۆی تۆقینەری گوت: "پیم بلێ.. توخوا میردەکەم راست دەکات کە دەلێ ئیوە گالتە دەکەن؟"

سیلڤیۆ وەلامی دایەوە: "کۆنتیسە خانم، ئەو هەمیشە هەر گالتە دەکات.. جاریکیان هەر بە گالتە زیللەیەکی لیدام و هەر بە گالتەش گوللەیەکی لەم کلاوەم داو ئیستاش هەر بە گالتە تەقەی لیکردم و لیی نەدام و منیش ئیستا ئارەزووی گالتەکردنم هەستاوە".

بەم قسانەو.. بە ئامادەبوونی ماشا! ویستی نیشانم لیبگرێ. ماشا خۆی خستە سەرپیی. من شیتانە هاوارمکرد: "ماشا، شوورەییە، هەستە! تۆش بەریز، واز لە گالتەکردن بە ژنیکی کلۆڵ ناهینیت؟ تەقەی خۆت دەکەیت یان نا؟"

وەلامی دایەوە: "نا، تەقە ناکەم. ئەمەم بەسە. ترس و شلەژانەکەتم بینیو وام لیکردی کە تەقەم لیبکەیت، ئەوەندەم بەسە، تۆ منت هەر لەبیردەبیت و دەتخەمە بەر ویژدانی خۆت و جیت دەهیلم و وازت لیدینم".

"ئەوسا چووە دەرەوە، بەلام لای دەرگاکە راوەستاو سەیریکی ئەو تابلۆیەی کرد کە من پیکابووم و دەتوانم بلیم بیئەوەی نیشانی لیبگریت، تەقەی لیکردو لە چاو ونبوو. ژنەکەم بوورایەوەو ئەویش کەس نەیویرا رایگریت، بەلکو بە ترسەوە تییەوە رامابوون. چووە دەرەوە بۆ بەر مالەوەو بانگی عەرەبانچییەکەی کردو پیش ئەوەی من بیمەوە هۆش خۆم، ئەو رۆیشت".

کۆنت بیدەنگ بوو و بەم شیوەیە کۆتایی ئەو چیرۆکەم زانی کە ئەوسا سەرەتاکەی سەرسامی کردم و چاوم بە پالەوانەکەی نەکەوتەوە. دەلین سیلڤیۆ سەرکردایەتی پەلیک ئەتیریایی * لە بزوتنەوەی (ئەلیکساندەر ئەسپیلانتمیدا دەکردو لە شەریک لە نزیک (سکۆلیاتی) کوژرا.

### سەرچاوە

لە کتیبی (الكسندر بۆشكين– مختارات نثرية)وە وەرگیردراوە.

### پەراویز

*بەناوی ئەتیریا کە کۆمەلەیەکی نهینی بوو بە سەرۆکایەتی ئەلیکساندەر ئەسپیلانتی ئامانجی رزگارکردنی یۆنان بوو.

# ریموند کارور



## و. لە فارسییەوە: ڕەئووف بێگەرد

### -دەربارەی نووسەر-

*ریموند کارور، شاعیر و چیرۆکنووسی ئەمریکایی، لە بیست و پێنجەمی مایسی سالّی ١٩٣٨ لە شاری کلاتسکانیای ئورگان هاتۆتە دنیاوە، زۆربەی تەمەنی مێردمنالّی خۆی لە شاری کیمیا (شارێکی بچووکە دەکەوێتە خۆرهەلاّتی ویلایەتی واشنتۆنەوە) بەسەربردوە، سەردەمی ناخۆشی لاویەتیی خۆی لە شاری پورت ئانجلیس و واشنتۆن تێپەڕاند.*

***کارور لە دوای هەمەنگوایەوە بە گەورەترین چیرۆکنووسی ئەمریکایی دادەنرێت و یەکێکە لە نووسەرە دیارەکانی نەوەی سێیەمی چیرۆکنووسانی ئەمریکا.*** *گەلێك خەلاّتی ئەدەبی لەسەر چیرۆکنووسین وەرگرتوە، وەك خەلاّتی گاگن هایم (سالّی ١٩٧٩) خەلاّتی یارمەتی میللی (دووجار) و باجی هارولد شتراوس سالّی ١٩٨٣. ئەم خەلاّتە ٣٥٠٠٠ دۆلاریە (کە تەنیا بەو نووسەرانە دەدرێت*

*کە بێجگە لە نووسین کاری تریان نیە) گەلێك کاری کردە سەر ژیانی ئابووری کارورو گۆشەیەکی لە ژینا ناخۆشەکەی پڕکردەوە.*

*بەرهەمی کارور وەرگێڕاوەتە سەر بیست و یەك زمانی دنیا، ئەگەرچی کارور لەو پەنجا ساڵەی تەمەنیدا زۆری ئازار چەشت، بەڵام کۆمەڵێك چیرۆکی درەوشاوەی بە یادگار جێهێشت، هەر ئەوەیشە کە بە نەمری دەمێنێتەوە.*

*کارور لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا ژنی هێنا، دوو منداڵ (کریستی و وس)ی لە دوا بەجێما. لەگەڵ ژنی یەکەمیدا ماریان- زۆر جار تێك دەگیران، لەگەڵ ژنی دووەمیدا گالاهر (چیرۆکنووس و شاعیر) ئەگەرچی ماوەیەکی کەم پێکەوە بوون، بەڵام رۆژانێکی خۆشیان تیا بەسەر برد. تەنیا لە ساڵی ١٩٧٦ تا ١٩٧٧ چوار جار لە نەخۆشخانە کەوت و سەرئەنجام لە دووی ئۆگەستی ١٩٨٨ لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بە نەخۆشی شێرپەنجەی سی کۆچی دوایی کرد.*

*هەردوو چیرۆکی (کۆکەرەوەکان) و (بیرۆکە) کە لێرەدا بڵاویان دەکەینەوە نموونەیەکی زیندوی کورتە چیرۆکنوسی ئەم نووسەرەن.*

* * *

## ١- کۆکەرەوەکان[1]

لە کار دەرکرابووم، بەڵام هەموو رۆژێك چاوەڕێی هەواڵێك بووم لە باکوورەوە بگات، لەسەر قەنەفەکە ڕاکشابووم و گوێم بۆ دەنگی باران ڕادێرابوو، جارناجارێك لەسەر قەنەفەکە نیوە خێزێکم دەکرد و لە پشت پەردەوە دەمڕوانی بەڵکو نامەبەرەکە بگات.

هیچ کەس و هیچ شتێك بەسەر شەقامەکەوە نەبوو. ئەمجارەیان هێشتا پێنج دەقیقە بەسەر پاڵ کەوتنەکەمدا تێنەپەڕیبوو کە لە پێش هەیوانەکەوە گوێم لە دەنگی پێی یەکێك بوو، وەستاو لە دەرگای دا، جووڵەم بۆ نەکرد، دەمزانی نامەبەرەکە نیە، دەنگی پێی ئەوم دەناسی، کاتێك کە بێ کار دەبیت و هەمیشە نامەی ئاگادار کردنەوەیان دێتە سنووقی پۆستەکەتەوە یان دەیخەنە ژێر دەرگاکەوە ئیتر تۆ ناتوانیت لە ماڵدا ئەوەندەیش مرۆڤێکی هۆشیارو ئاگاداری هەموو شتێك بیت. تازە هەندێك دێنە بەر ماڵەکەت و کە دەمانەوێت قسەت لەگەڵدا بکەین، بە تایبەتی بۆ کەسێکیش کە تەلەفۆنی نەبێت.

دیسان دەنگی دەرگاکە هاتەوە، بەرزتر، نیشانەیەکی خراپ بوو، سەرێکم کێشا تا بتوانم ناو هەیوانەکە ببینم، بەڵام هەر کەسێك پاڵی دابوە دەرگاکەوەو وەستابوو، ئەمەیش نیشانەیەکی خراپتر. دەمزانی ڕایەخە پلاستیکیەکان جیڕەجیڕ دەکەن و ئیتر هەرگیز نەمدەتوانی بە هێوری بڕۆمە ژورێکی دی و لە پەنجەرەکەیەوە تەماشا بکەم.

جارێکی تر لە دەرگاکە درایەوەو من وتم: کێیە؟

پیاوێك وتی: منم، ئابری بلم. جەنابی سلیتەر تۆیت؟ هەر لەسەر قەنەفەکەوە بە دەنگی بەرز پرسیم: لێرە چیت دەوێت؟

–شتێکم بۆ سلیتەر خانم هێناوە، شتێکی بردۆتەوە، خاتوو سلیتەر لەماڵە؟

وتم: سلیتەر خانم لێرە ناژی.

وتی: باشە، بەڵام بێگومان جەنابتان سلیتەرن؟ جەنابی سلیتەر.. و پیاوەکە کەوتە پژمین.

لەسەر قەنەفەکە هەستام، زنجیری دەرگاکەم شل کردو لایەکیم کەمێك کردەوە. پیاوێکی پیری خڕو قەڵەو بوو، پاڵتاوێکی بارانی (مشەما)ی لەبەردا بوو، باراناو لە جلەکانیەوە دەڕژایە سەر ئەو جانتا سەیرو گەورەیەی کە بە دەستیەوە بوو.

زەردەخەنەیەکی تەوساوی هاتێ و جانتاکەی لەسەر زەویەکە دانا، دەستی هێنایە پێشێ و وتی: ئابری بل.

وتم: من تۆ ناناسم.

کەوتە ڕوونکردنەوە: سلیتەر خانم، سلیتەر خانم کارتێکی پڕکردۆتەوە.

لە گیرفانی بەرکی چەند کارتێکی دەرهێناو ماوەیەك ئەم لاو ئەولای پێ کردن. لەسەر کارتێك دەستی بە خوێندنەوە کرد: سلیتەر خانم، ژمارە ٢٥٥ شەقامی شەشەم باشوری خۆرهەڵات، وایە؟ سلیتەر خانم بردوویەتیەوە.

کڵاوەکەی لابردو لەسەرخۆ سەری ڕاوەشاند، کڵاوەکەی توند بە مشەماکەیدا کێشا، وەك ئەوەی کارەکەی گەیشتبێتە ئەنجام و هەموو شتێك کۆتایی هاتبێت، گەڕانەکەی تەواو بوبێت و کاروان گەیشتبێتە مەنزڵ.

هەر چاوەڕێ بوو.

وتم: سلیتەر خانم لێرەدا ناژی، ئیتر چی بردۆتەوە؟

وتی: دەبێت پیشانتان بدەم، دەتوانم بێمە ژوورەوە؟

وتم: نازانم، ئەگەر زۆر نەبات، من گەلێك کارم هەیە.

وتی: زۆرباشه‌، به‌ڵام ده‌بێت له‌م مشه‌مایه‌ بێمه‌ ده‌رێ. ئه‌م كاڵه‌یه‌یش، نامه‌وێت فه‌رشه‌كه‌تان ته‌ڕبێت، چ فه‌رشێكی چاكتان هه‌یه‌، جه‌نابی..

چاوانی شه‌وقێكیان تێگه‌ڕاو به‌ بینینی دیمه‌نی فه‌رشه‌كه‌ شه‌وقه‌كه‌ نه‌ما، هه‌ڵوێسته‌یه‌كی ناجۆری كرد، پاشان مشه‌ماكه‌ی به‌ری داكه‌ندو ڕایوه‌شاند، له‌ یه‌خه‌كه‌یه‌وه‌ به‌ ده‌ستگیری ده‌رگاكه‌یه‌وه‌ هه‌ڵواسی. وتی: ئێره‌ی بۆ چاكه‌، نه‌فره‌ت له‌م هه‌وایه‌، چه‌مایه‌وه‌و ته‌ره‌قه‌ی كاڵه‌كانی كرده‌وه‌، جانتاكه‌ی خسته‌ ژورێ، كاڵه‌كانی داكه‌ند، جووتێك ده‌م پێ (نه‌عل)ی له‌پێدا بوو.

كه‌ ده‌رگاكه‌م داخست و چاوی پێم كه‌وت چۆن له‌ ده‌م پێكانی ڕاماوم وتی: ده‌بلیو، ئێچ، ئودن به‌ درێژایی یه‌كه‌م سه‌فه‌ری بۆ سه‌رتاسه‌ری چین ده‌م پێی له‌ پێدا بوو، هه‌رگیز داینه‌ده‌كه‌ندن.

شانم هه‌ڵته‌كاند، جارێكی دی كه‌وتمه‌وه‌ چاوه‌ڕوانی كردنی نامه‌به‌ره‌كه‌و ته‌ماشایه‌كی شه‌قامه‌كه‌م كرد دیسان ده‌رگاكه‌م داخسته‌وه‌.

ئابری بل له‌ فه‌رشه‌كه‌ ڕامابوو، لێوی هه‌ڵقورچاند، پاشان پێكه‌نی، دیسان پێكه‌نیه‌وه‌ و سه‌ری ڕاوه‌شاند.

لێم پرسی: به‌ چی پێده‌كه‌نیت؟

وتی: هیچ، خودایه‌، كه‌وته‌وه‌ پێكه‌نین. خه‌ریكه‌ شێت ده‌بم. وابزانم تام لێ هاتوه‌.

ده‌ستێكی خسته‌ سه‌ر ته‌وێڵی، قژی خاو ببوه‌وه‌و جێ شوێنی كڵاوه‌كه‌ی به‌ ده‌وران ده‌وری سه‌ریه‌وه‌ دیاربوو.

وتی: به‌ ڕای تۆ تام لێ نه‌هاتوه‌؟ نازانم، له‌وه‌ ده‌چێت.

هه‌ر چاوی له‌ فه‌رشه‌كه‌ بڕیبوو، ئه‌سپرینت نیه‌؟

وتم: چیته‌؟ هیوادارم له‌ ماڵه‌كه‌ی مندا نه‌خۆش نه‌كه‌ویت. من كارم هه‌یه‌.

سه‌ری ڕاوه‌شاند، له‌سه‌ر قه‌نه‌فه‌كه‌ دانیشت، ده‌م پێكانی هه‌ر له‌ پێدا بوو، چاویشی هه‌ر به‌ فه‌رشه‌كه‌وه‌ دورابوو.

چوومه‌ مۆبه‌قه‌كه‌وه‌، كوپێك ئاوم تێكرد و له‌ شووشه‌یه‌كدا دوو دانه‌ ئه‌سپرینم ده‌رهێنا. وتم: فه‌رموو، بێگومان دوای ئه‌مه‌ ته‌شریف ده‌به‌ن.

له‌سه‌رخۆ وتی: تۆ له‌ باتی سلیتر خانم قسه‌ ده‌كه‌یت؟

وتم: نا، نا. له‌ بیری كه‌، ئه‌وه‌ هه‌ر له‌بیركه‌. من ئه‌م قسانه‌م كرد. ده‌م و چاوی سڕی و ئه‌سپرینه‌كانی خوارد، چاوی به‌ هه‌موو ژووره‌ ڕووته‌كه‌دا گێڕا، پاشان كه‌مێك هه‌وڵی دا تا نوشتایه‌وه‌و زنجیری جانتاكه‌ی كرده‌وه‌. قرته‌قرتێكی لێوه‌هات.

ناو جانتاکە چەند خانەیەکی تیابوو کە لە ناویاندا چەند لوولەیەکی درێژ، فلْچە، سەر لوولەی بریقەدار و شتێکی شینی چەرخدار دەرکەوتن کە قورس دەهاتنە بەرچاو. لەسەرخۆ، وەك دوا نزوولەی قەشەیەك وتی: دەزانیت ئەمە چییە؟

زیاتر لێی نزیك بوومەوە. من دەڵێم گسکی کارەباییە، من ئەهلی کڕین و فرۆخت نیم، هەرگیز نەچوومەتە ناو کاری کڕین و فرۆشتنی گسکی کارەباییەوە.

وتی: لێگەڕێ با شتێکت پیشان بدەم.

کارتێکی لە گیرفانی بلووزەکەی دەرهێنا، وتی: تەماشای ئەمە بکە. کارتەکەی دامێ، کەس باسی کڕین و فرۆشتن ناکات، بەڵام تەماشای ئەم ئیمزایە بکە، ئەمە ئیمزای سلیتەر خانمە یان نا؟

تەماشای کارتەکەم کرد، دامە بەر ڕوناکیەکە، هەڵم گێڕایەوە، بەڵام هیچ لە پشت کارتەکەوە نەنووسرابوو، وتم: باشە، مەبەستت چییە؟

وتی: لەناو سەدان کارتی چکۆڵەی وەك ئەم کارتەدا تەنیا ئەوەی سلیتەر خانم شانسی هێنا و بەرندە بوو. بەرندەی ژەمێك گسك دانی بەلاش و شۆردنی فەرشەکان بە شامپۆ، ئەمانە بۆ سلیتەر خانم دەرچوە و فێڵ و فەرەجی تیا نیە، من هاتوومەتە ئێرە تەنانەت دۆشەکەکانیشتان پاك بکەمەوە. جەنابی.. ئەگەر بزانیت، لە ماوەی چەند مانگێکدا چ شتگەلێك لەناو دۆشەکدا کۆدەبێتەوە سەیرت لێ دێت. لەهەر شەوو ڕۆژێکی تەمەنماندا، گەردیلە گەلێکی وجودمان جێ دەهێڵین، پێستە ناسکەکانی ئێرەو ئەوێمان، ئەم پارچە وردانەمان بۆ کوێ دەچێت لە نێوان مەلافەکانەوە دەڕۆنە ناو دۆشەکەوە، ئەوە جێگایانە، هەروەها دەچنە ناو سەرینەکانەوە، سەرین و دۆشەکەکان وەك یەکترن.

ئەو لە سەروبەندی دەرهێنان و بەستنی سەری گسکەکەدا بوو، سەری گسکەکەی بە لوولە درێژەکەوە بەست، بە چیچکانەوە دانیشتبوو لەژێر لێوەوە ورتەورتی دەکرد، شتێکی وەك خاکەنازی بە لوولەکەوە بەست و ماتۆڕە شینە چەرخدارەکەی پێ دەرهێنا، پاڵێوەکە کە دەیویست ئەویش بخاتە ناو دەزگاکەوە دای بە من تا سەیری بکەم، پرسی: ئوتومبیلت نیە؟ وتم: نا، ئوتومبیلم نیە، ئەگەر هەمبوایە تا جێگایەکم دەبردیت.

وتی: ئەمە زۆر خراپ بوو، ئەم گسکە بچووکە سیمێکی بیست مەتری پێوەیە، ئەگەر ئوتومبیلت هەبوایە ئەم گسکە بچووکەت ڕادەکێشاو دەت بردە بەردەم

ئوتومبیلەکەت و هەرچی پارچە کومبار و دۆشەك و کوشنەکانت هەیە گسکت دەدان، تا نەیبینیت باوەڕناکەیت چەند لە ئێمە گوم دەبێت، ساڵانە چەند لە وجودی ئێمە لەناو ئەم دۆشەکە جوانانەدا کۆدەبێتەوە.

وتم: جەنابی بل، من وای بۆ دەچم ئەگەر کەرەسەکانت کۆبکەیتەوەو بڕۆیت چاکتر بێت. من ئەم قسەیەم بە هیچ نیەتێکی خراپ نەکرد. بەڵام ئەو لەناو ژوورەکەدا بە دوای پلاکی کارەبادا دەگەڕا، کە لە دواییدا یەکێکی لەودیو قەنەفەکەوە پەیا کردوە، دەزگاکە لە سەرەتادا دەنگی تەقە تەقێکی لێوە هات وەك پارچە مەڕمەڕێکی تیا بێت یان پارچەیەکی لێ شل بووبێتەوە وابوو. بەڵام دوای کەمێك بە ئاسانی کەوتە کار.

**ریلکە** بە درێژایی تەمەنی پیری خۆی لە کۆشکێکەوە دەچوە کۆشکێکی تر، لە ماڵی مرۆڤە چاکەکاندا.

ئێستا بەرزتر قسەی دەکرد و لە نێوان ژاوەژاوی گسکە کارەباییەکەدا گوێم لە دەنگی بوو.

**ریلکە** بە دەگمەن سواری ئوتومبیل دەبوو، شەمەندەفەری پێ چاکتر بوو. یان تەماشای ژیانی **ڤولتێر** بکە لە گوندی سیرە لەگەڵ مادام شاتدل، مەرگێکی بە دەمامك، چ ئارامیەك! دەستی ڕاستی بەرزکردەوە. ویستم پێچەوانەی قسەکانی بوەستم. نا، نا، وانیە، وایە؟ مەڵێ وایە، بەڵام کێ دەزانێت؟ بەم قسانەوە گەڕایەوەو بە دوای خۆیدا گسکەکەی بەرەو ژورێکی تر برد.

ئێرە، تەختە خەوێك و پەنجەرەیەك، کووپەیەك کە متیلی تیا بوو لەسەر زەویەکە دانرابوو، سەرینێك و دۆشەکێکی متیلدار، بەرگی سەرینەکەی کردەوە و زۆر بە خێراییش متیلی دۆشەکەکە، چاوی بڕیبوە دۆشەکەکە، بە تیلەی چاو تەماشایەکی کردم، چوومە موبەقەکەو کورسیەکم هێنا، لەبەر دەرگاکە دانیشتم و کەوتمە تەماشاکردنی، یەکەمجار بۆ تاقیکردنەوەی هێزی مژینی گسکەکە خستیە سەر لەپی دەستی. نوشتایەوەو پلەیەکی تری زیادکرد، وتی: بۆ کاری لەم بابەتە دەبێت پلەیەکی تری بۆ زیادبکرێت. جارێکی دی هێزی مژین و ڕاکێشانەکەی تاقی کردەوە، ئینجا لوولەی گسکەکەی تا بەردەم تەختە خەوەکە بردو سەری نایە سەر دۆشەکەکە. سەری گسکەکە بە دۆشەکەکەوە چەسپی و دەنگی لێدانەکەی زیاتر بوو، سێ جار بە چاکی گسکی دۆشەکەکەی دا. وتی: ئەمە تەنیا بۆ نومایش بەکاردێنین، لە کاتی ئاساییدا هەموو ئەم ئامێرانە سەر لە کیسەی گسکەکەوە دەردەهێنن. پارچەیەکی لە

پاشماوەکانی سەر پاڵیوەکەی لەناو دەستیا وردکرد، بە هەڵە نەچووبم قوتوویەکی پیسی بوو. حاڵەتێکی بێ توانایی لەخۆگرتبوو.

وتم: ئەمە دۆشەکی من نیە.

لەسەر کورسیەکە بۆ پێشەوە نوشتامەوەو هەوڵم دا وای پیشان بدەم کە منیش پەیوەندیم بەو شتانەوە هەیە.

وتی: ئێستا نۆرەی سەرینەکەیە. پاڵێوە بەکارهاتوەکەی خستە پێشی پەنجەرەکەو چەند چرکەساتێك لە دەرەوەی ڕوانی.

سەری وەرگێڕاو وتی: دەمەوێت ئەم سەری سەرینەکە توند بگریت.

لەسەر کورسیەکە هەستام و دوو لای سەرینەکەم گرت، وام هەست دەکرد هەردوو گوێچکەی شتێکم گرتوە.

لێم پرسی: ئاوا؟

سەری لەقاند، ڕۆیشتە ناو ژوورەکەو بە پاڵێوێکی ترەوە گەڕایەوە.

پرسیم: ئەمانە نرخیان چەندە؟

وتی: تا ڕادەیەك هیچ. ئەمانە لە کاغەزو کەمێك پلاستیك دروست دەکرێن، نرخێکیان نیە.

گسکەکەی بە پێی داگیرساند و کە ویستی بیکێشێتە سەر سەرینەکە توند گرتم. دوو سێ جار گسکەکەی بە سەریدا هێنا، پاشان کوژاندیەوە. پاڵێوەکەی دەرهێنا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت دایە بەر ڕوناکیەکە، لە پاڵ ئەوی تردا لەبەر پەنجەرەکە داینا، پاشان دەرگای کۆمیدی دیوارەکەی کردەوەو تەماشای ناوەوەی کرد. بەڵام بێجگە لە سپرایەکی مشك کوژ هیچی تری تیا نەبوو.

لە هەیوانەکەوە دەنگی پێ هات، جێ نامەیەك کرایەوەو داخرا، تەماشای یەکترمان کرد، گسکەکەی هەڵگرت و بردی و منیش بە دوایدا چووینە ژوورەکەی دی. لەسەر فەرشەکەو نزیك بە دەرگاکە تەماشای نامەکەمان کرد کە لەوێ کەوتبوو، ویستم بەرەو لای نامەکە بڕۆم کەچی گەڕامەوەو لێم پرسی:

—ئیتر چیت دەوێت؟ خەریکە درەنگ ئەکەوم، ئەم فەرشە شایانی ئەوە نیە کاتی بۆ بەفیڕۆ بدەیت، فەرشێکی دەزووی پێنج بە چوارە لە ڕاگ سیتی کڕیومە. نرخی ئەم یاریانەی نیە.

وتی: تەپڵەکی جگەرەی پڕت هەیە؟ یان گوڵدانێکی قوڕین، شتێکی وەك ئەمانە؟ مشتە خۆڵێکیش هەر دەبێت.

تەپڵەکێکی پڕم بۆ هێنا، لێی وەرگرتم، چی تیابوو خاڵی کردە سەر فەرشەکەو، بە دەم پێکانی قاچی ئاغزەو سوتوە جگەرەکانی بەسەر فەرشەکەدا ساوی. دیسان بە چیچکانەوە دانیشت و پاڵێوەیەکی تازەی لە گسکەکەی بەست. بلووزەکەی داکەند و فڕێی دایە سەر قەنەفەکە، ژێر باڵی ئارەقەی کردبوو، ورگە زلەکەی پشتێنەکەی داپۆشیبوو، سەری گسکەکەی کردەوە و ئامێرێکی تری لێ بەست، پلەی گسکەکەی ڕێك و پێك کرد، بە پێی خستیە گەڕو، سەرانسەری ئەو فەرشە دەزوەی چەند جارێك پاك کردەوە. دیسان ویستم بەرەو لای نامەکە بچم، بەڵام وەك بزانێت چی ئەکەم هەراو زەنایەکی بە گسك و لوولە درێژەکە و گسکدان دروست کرد کە لە شوێنی خۆمدا وەك بزمار چەقیم.

کورسیەکەم بردەوە موبەقەکە، دانیشتم و کەوتمەوە تەماشای کارەکانی، دوای ماوەیەك گسکەکەی کوژاندەوەو قەباغەکەی کردەوەو بێ سێ و دوو پاڵێوە پڕ لە خۆڵ و مووە چنگێك شتی تری بۆ هێنام، سەیری پاڵێوەکەم کرد، هەستام و هەموویم کردە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە، ئیتر ئەو یەك ژەمی دەستی بەکار کرد، بێ ئەوەی هیچ بڵێت یان شتێك ڕوون بکاتەوە بە شووشەیەکەوە کە شلەیەکی سەوزی تیا بوو هاتە موبەقەکەوە، شووشەکەی خستە بەر بەلووعەکەو پڕی کرد لە ئاو. وتم: بێگومان لەوە ئاگادارن کە پوولێکم لە گیرفاندا نیە، ئەگەر هەموو ژیانم بەم کارەوە بەسترابێت ناتوانم تاقە دۆلارێك بدەم. دەبێت لیستی حیسابەکەیم بۆ بنێرێت، ئەو لیستەی ناتوانم بیدەم، ئیتر ئاوا، تۆ لێرەدا کاتی خۆت بە فیڕۆ دەدەیت.

ویستم بە ڕاشکاوی قسەکانمی پێ بڵێم کە هیچ بەدحاڵیەکی تێ نەکەوێت، بەڵام ئەو سەرگەرمی کارەکەی بوو، ئامێرێکی تری بەسەری لوولەکەوە بەست، شووشە پێچراوەکەی بە سەرێکی تازەوە نا، لەسەرخۆ، بە گسکەکە بەسەر فەرشەکەدا کەوتە هاتوچۆ، لە دوایەوە هەندێك لەو شلەمەنیە سەوزەی بەسەر فەرشەکەدا دەڕژاند، کەفێکی زۆری دەکرد و بە فڵچەیەك فەرشەکەی دەشت.

من چیم لە دڵا بوو بە ڕاستی پێم وتبوو، ئیدی بە خەیاڵی ڕەحەتەوە لەسەر کورسی مۆبەقەکە دانیشتبووم لەوم دەڕوانی، جارجارێکیش لە پەنجەرەکەوە تەماشای بارانم دەکرد. تاریکی لەسەرخۆ دادەکەوت، گسکەکەی کوژاندەوە، لە گۆشەیەکی ژوورەکەو نزیك بە دەرگاکەدا وەستابوو.

لێم پرسی: قاوە دەخۆیتەوە؟

هەناسەبڕكێی بوو، دەموچاوی پاك كردەوە.

ئاوم خستە سەرئاگرو كە كولا دو فنجان قاوەم تێكرد، ئەویش شتەكانی كۆكردبوەوەو خستبوونیە جانتاكەیەوە، ئینجا نامەكەی لەسەر زەویەكە هەڵگرت، ناوی سەر نامەكەی خوێندەوەو بە وردی تەماشای ناونیشانی نێرەرەكەی كرد، نامەكەی لە ناوەڕاست نووشتاندەوە و خستیە گیرفانی پشتەوەی پانتۆڵەكەی و من وێكڕا لێم دەڕوانی، یەعنی هەر دەمتوانی ئەوە بكەم، قاوەكە لە ساردبوونەوەدا بوو.

وتی: نامەكە بۆ پیاوێكی بەڕێزە بە ناوی سلیتەرەوە. خۆم چاری دەكەم. وتی: لەوە دەچێت واز لە قاوەكە بێنم. چاكتر وایە پێ نەخەمە سەر فەرشەكە، چونكە هەر ئێستا بە شامپۆ شتم.

وتم: تەواو ڕاستە. پاشان وتم: تۆ ئێستا لەوە دڵنیایت ئەو نامەیە بۆ ئەو كەسەیە كە وتت؟

ڕۆشت لەسەر قەنەفەكە بلووزەكەی هەڵگرت و كردیە بەری و دەرگای پێشەوەی كردەوە. هێشتا هەر باران دەباری، پێی خستەوە ناو كالەكەی و تەرەقەكانی بەست، مشەماكەی لەبەركرد، گەڕایەوەو تەماشای ناوماڵەكەی كرد.

وتی: دەتەوێت نامەكە ببینیت؟ پێ دەچێت بڕوات بە قسەكەم نەكردبێت؟

وتم: زۆر سەیرە.

وتی: باشە، بەڵام وا چاكە بڕۆم، وەلێ هەر لە بەردەم دەرگاكەدا وەستابوو. وتی: گسكەكەت دەوێت یان نا؟

تەماشای ئەو جانتا گەورەیەم كرد كە ئیدی داخراوو ئامادەی ڕۆشتن بوو.

وتم: نا، پێ ناچێت بمەوێت. من دەبێت زوو لێرە بڕۆم، لە كۆڵم نابێتەوە.

وتی: زۆر چاكە.. و دەرگاكەی داخست.

***

## ٢- بیرۆکە(٢)

شێومان تەواو کردبوو، من لەپشت مێزی مۆبقەکەوە دانیشتبووم سەعاتێکی ڕێک بوو کە گڵۆپم کوژاندبوەوەو چاوەچاوم بوو. ئەگەر بیویستایە ئەمشەویش دەستبەکار بێت ئەوا جێی خۆی بوو، واتا لە وەختیشی تێپەڕیبوو، سێ شەوە من ئەوم نەدیوە. وەلێ ئەمشەو چەتری ژوری نووستن هەڵدرابوەوەو گڵۆپیش دەسووتا. ئەمشەو سەرحاڵ بووم.

دوایی ئەوم بینی، دەرگا تۆڕیەکەی کردەوەو هاتە ناو هەیوانی پشت خانوەکەی، تیشێرتێك و پانتۆڵێکی لەبەردابوو. نازانم ئەگەر مایۆیەکی مەلە یان شتێکی تری پۆشی بێت. لە پێشا سەیرێکی ئەملاولای کرد، پاشان بە خێرایی لەهەیوانەکەوە خۆی خستە تاریکیەکەوەو کەوتە گەڕان بە پاڵ دیواری حەوشەکەدا. ئەگەر لە پێشا چاوم لێی نەبوایە هەرگیز نەمدەبینی. لەبەردەم پەنجەرەیەکی ڕوناکدا وەستاو تەماشای ژوورەکەی کرد. بانگم کرد: "ڤیرن! ئامادەبە ڤیرن، هاتۆتە دەرەوە، زووکە دەی"

ڤیرن لە ژووری دانیشتندا ڕۆژنامەی دەخوێندەوەو تەلەفزیۆنەکە داگیرسابوو. گوێم لە دەنگی کەوتنی ڕۆژنامەکەی بوو. ڤیرن وتی: "ئاگاداری خۆت بە نەتبینێت، زۆر لە پەنجەرەکە نزیك مەبەرەوە".

ڤیرن هەمیشە ئەمە دەڵێت: زۆر لە پەنجەرەکە نزیك مەبەرەوە. وا دەزانم لەم مەسەلەی چاوەچاوکردنەدا کەمێك دوودڵە، بەلاّم دەزانم چێژی لێ وەردەگرێت، یەعنی خۆی ئەمەی وتوە.

-"بە تاریکی ناتوانێت بمانبینێت" منیش هەمیشە وای وەلاّم دەدەمەوە. وا سێ مانگە ئەم کارە بەردەوامە. وردتری بڵێم لە سێی سیپتامبەرەوە. واتا ئەمە یەکەمین شەو بوو کە من لە پشت پەنجەرەکەوە بیبینم، پێش ئەمەیش چەند وەخت ئەم کارەی کردوە نازانم.

ئەوشەوە لەوەدا بوو تەلەفون هەڵبگرم و خەبەری پۆلیس بدەم کە کتوپڕ ناسیم. ڤیرن زۆری وتبوو تا لە مەسەلەکە بگەم، تا ماوەیەك دوای ئەوەیش من هەر گوێم پێ نەدەدا، بەلاّم لەو شەوە بەدواوە من بەردەوام تەماشای ئەکەم و دەتوانم بڵێم بەسەریەکەوە هەردوو، یان سێ شەو ئەمە کاریەتی، هەندێك جار زیاتریش.

تەنانەت جاری وایە کە بارانیش دەبارێت هەر ئەو کارە دەکات. یەعنی ئەگەر دنیا بارانیش بێت من گرەوی لەسەر ئەکەم کە ئەو هەر دەردەکەوێت. کەچی ئەمشەو هەوا ساف و بایش هەڵی کردبوو، مانگیش بە ئاسمانەوە بوو.

هەردووکمان لە پشت پەنجەرەکەوە چیچکەمان کردبوو، ڤێرن گەرووی پاك کردەوە. وتی: "تەماشاکە"

ڤێرن کەوتە جگەرەکێشان و کە پێویست بوایە سووتوەکەی دەکردە ناو لەپی دەستیەوە. کە دەیویست مژێك لە جگەرەکە بدات دەستی لە پشت شووشەکە دوور ڕادەگرت، ڤێرن هەموو وەختی خوا جگەرە دەکێشێت. ئەم کارە بێ کۆتاییە، تەنانەت کە دەیشخەوێت تەپڵەکی جگەرەکە لە ژوور سەریا دادەنێت. من کە نیوەشەو بە خەبەر دێم ئەویش هەڵدەستێ و جگەرە دەکێشێت.

ڤێرن وتی: "خودایە"

دوای دەقیقەیەك بە ڤێرنم وت: "ئەو ژنە چی هەیە کە ژنانی دی نیانە؟" چوارمشقی لەسەر زەویەکە دانیشتبووین و تەنیا سەرمان لە پەنجەرەکەوە دیاربوو. تەماشای پیاوێکمان دەکرد کە لە ژووری خەوتنەکەی خۆیدا چاوەچاوی بوو.

ڤێرن وتی: "ئەوەیە کە هەیە" ڕێك لە پاڵ گوێما گەرووی پاك کردەوە.

ئێمە هەر بەو جۆرەی خۆمان تەماشای پیاوەکەمان دەکرد.

ئێستا تارمایی یەکێکم لە پشت پەردەی ژوورەکەوە دەبینی، بێگومان بووم کە ژنەو جلەکانی دادەکەنێت. بەڵام نەمدەتوانی وردەکاریەکانی ببینم، زۆرم لە چاوم کرد، ڤێرن بە چاویلکەکەیەوە لە من باشتر هەموو شتەکانی دەبینی. لە پڕا پەردەکە لادراو ژنەکە پشتی لە پەنجەرەکە کرد.

خۆم وەڵامی پرسیارەکەمم باش دەزانی بەڵام لە ڤێرنم پرسی: "ئێستا دەیەوێت چی بکات؟"

ڤێرن وتی: "خودایا!!"

وتم: "ڤێرن، پرسیم دەیەوێت چی بکات؟"

ڤێرن وەڵامی دایەوە: "باشە، جلەکانی دادەکەنێت، دەتەوێت چیتر بکات؟"

پاشان گڵۆپی ژوری نووستن کوژایەوەو، پیاوەکە سەری داخست و بە پاڵ حەوشەیماڵەکەیدا تێپەڕی، دەرگا تۆڕیەکەی کردەوەو لەسەرخۆ چوە ژورێ، دوای کەمێك گڵۆپی ماڵەکە کوژایەوە.

ڤیرن کۆکی، دیسان کۆکیەوەو سەری ڕاوەشاند، گلۆپەکەی داگیرساند، ڤیرن هەروا بە چیچکانەوە دانیشتبوو، دوایی هەستا، وەستاو جگەرەیەکی پێکرد، ڕووم لە ڤیرن کردو وتم: "ڕۆژێك بەم پاشەڕۆکە دەڵێم من وا بیر لەو دەکەمەوە "ڤیرن بە تەوسەوە پێکەنی.

وتم: "بە ڕاستی ئەمە دەڵێم، ئاخری ڕۆژێك لە ناوبازاڕا دەیگرم و ڕووبەڕوو هەموو شتێکی پیٚ دەڵێم"

ڤیرن وتی: "من کاری وا ناکەم. ئاخر بۆ ئەمە دەکەیت؟"

لە قسەکانیەوە وا دەردەکەوێت کە ئەو بیری لەوە نەدەکردەوە من قسەکانم بە جیدی بێت. چرچی لە دەم و چاوی خست و لە نینۆکەکانی ڕاما، زمانی لەناو دەمیا گێڕا، وەك ئەو کاتانەی کە دەیەوێت بە چاکی بیر لە شتێك بکاتەوە چاوی وێك هێنا. پاشان گۆڕاو چەناگەی خوراند.

وتی: "تۆ هەرگیز کاری وا ناکەیت"

وتم: "ئەیبینیت"

لە دوایەوە چوومە ژووری میوان، دەممان لە یەکدی گیربوو. هەندێك جار وامان لێدێت.

وتم: "تۆزیٚ لێم ڕاوەستە"

ڤیرن جگەرەکەی لەنێو تەپڵەکە گەورەکەدا کوژاندەوە. لە پاڵ کورسیە چەرمەکەیدا وەستاو کەمێك تەماشای تەلەفزیۆنی کرد.

وتی: "ئەمەیش هیچ کاتێکی خوایی شتێکی وای تیا نیە" دوایی شتێکی تری وت.

وتی: "ڕەنگە ئەم کابرایە شتێکی لەویٚ هەبێت"

ڤیرن جگەرەیەکی تری داگیرساند. "کیٚ چووزانێت"

وتم: "ئەو کەسەی بێتە پشت پەنجەرەی من سەروکاری لەگەڵ پۆلیسدا هەیە، بێجگە لە کاری گرانت".

ڤیرن شانی هەڵتەکاند و وتی: "کیٚ چووزانێت"

برسیم بوو، تەماشای سوچێکی موبەقەکەم کردو پاشان دەرگای یەخچاڵەکەم کردەوە.

بە دەنگی بەرز وتم: "ڤیرن، هیچ ناخۆیت؟"

وەڵامی نەدایەوە، دەنگی لەناو دەست شۆریەکەوە دەهات. بە خۆم وت بێگومان ئەویش برسیەتی، شەوان لەم کاتەدا برسیمان دەبێت.

لەسەر مێزەکە چەند پارچە کالباسم داناو قووتوویەکی سوپیشم کردەوە، چەند پارچە نانی وشك و هەندێك ڕۆنی بادەم، گۆشتی سارد، خەیاری سوێرکراو، زەیتون و چپس و پەتاتەیشم لەسەر مێزەکە دانا، ئینجا کەوتمە بیری پیتزاکەوە، ڤیرن بە خاولی حەمام و شۆرتێکەوە لە دەست شۆریەکە هاتە دەرێ، قژی تەڕو ئاو لە پشتی سەری دەتکا، بۆنی ئاوی ئاودەستی لێدەهات. تەماشای شتی سەر مێزەکەی کرد، وتی: "تەنیا کاسەیەك زوڕات لەگەڵ شەکری سووتاوی کەمە" پاشان لە پشت مێزەکەوە دانیشت و ڕۆژنامەکەی لەپاڵ دەفرەکەیدا پان کردەوە.

نانمان خوارد، تەپڵەکەکە پڕ ببوو لە ئاغزە جگەرەو ناوکە زەیتون، ڤیرن کە لە خواردن بوەوە دەمی کرایەوەو وتی:

-"ئەم بۆنە خۆشە هی چیە؟"

ڕۆیشتم ئەو دوو پیتزایەی کە پەنیرەکانیان بە سەرەوە ببوو بە ئاو لە فڕن دەرمهێنان.

ڤیرن وتی: "زۆر جوان هەڵکەوتوون" بەڵام زۆری پێ نەچوو وتی: "ئیدی من ناتوانم بخۆم، دەمەوێت بڕۆم بخەوم"

وتم: "منیش دێم، بەڵام دەبێت مێزەکە پاك بکەمەوە"

کە ویستم پاشماوەی ناو دەفرەکان بکەمە ناو سەتڵەکەوە مێروولەم بینی، ورد تەماشام کردن، لە شوێنێکەوە لە پشت لوولەی ژێر دەفرشۆرەکەوە دەهاتن، بە ڕیز بە کەنار سەتڵی پاشەڕۆکەکاندا دەهاتن و دەچوونە ناوی، لە چەکمەجەیەکدا مێرو کوژێکم پەیا کردو دەرەوەو ناوەوەی سەتڵی پاشەڕۆکەکەم بە چاکی سپرای پژێن کرد، ژێر دەفرشۆرەکە تا ئەو شوێنەی دەستم دەیگەیشتێ دژی مێروەکانم سپرای کرد. پاشان دەستم شت و بە چاکی تەماشای هەموو لایەکی مۆبەقەکەم کرد.

ڤیرن نوستبوو پرخەی دەهات، بەڵام هەر لە ماوەی سەعاتێك و دواندا هەڵدەستاو دەچوە سەرئاو و جگەرەی دەکێشا، تەلەفزیۆنە بچووکەکەی خوار تەختە خەوەکە داگیرسابوو، بەڵام وێنەکانی سەروخواریان دەکرد و نەدەوەستان. پێم خۆشبوو باسی مێروولەکان بۆ ڤیرن بکەم.

به هێوری خۆم ئاماده کرد بۆ نوستن، وێنەی تەلەفزیۆنەکەم چاك کردو چوومە ژێر لێفەکەوە. ڤیرن هەمیشە هەر لە خرو پفی خۆیدا بوو.

ماوەیەك سەیری تەلەفزیۆنم کرد، بەرنامەیەکی تەنز بوو کە من هەرگیز حەزی پێ ناکەم. دیسان کەوتمەوە بیری مێروولەکان. دوای کەمێك وام بە بیردا هات کە مێروولەکان تەواوی ماڵەکەیان داگیر کردوە. بە خۆم وت وا چاکە ڤیرن هەستێنم و پێی بڵێم کە خەوێکی ناخۆشم دیوە. بەلاّم ئەوەم نەکرد. هەستام کە بچم مێرووکوژەکە هەڵگرم، دیسان تەماشای ژێر دەفرشۆرەکەم کردەوە، وەڵێ هیچ مێروولەیەکی تیا نەمابوو، هەموو گڵۆپەکانم داگیرساند بە جۆرێك کە گشت لایەك بوو بە ڕوناکی.

هەموو شوێنێکم سپرای کردەوە.

پاشان چەتری سەر مۆبەقەکەم لاداو تەماشای دەرەوەم کرد، درەنگ وەخت بوو، بای دەهات و گوێم لە هاژەی گەڵاو لقەکان بوو.

وتم: "ئەو پاشەڕۆکە! بیرۆکەیەکی نوێیە"

لە ڕاستیا قسەی خراپترم کردبوو، ئەو شتانەی ناتوانم بیانڵێمەوە.

پەراوێز:

(١) Collectors کە ناونیشانی ئەم چیرۆکەیە، وەك زۆرێك لە ناونیشانی چیرۆکەکانی تری کارور تاقە مانایەکی نیە، لێرەدا Collectors هەم بە مانای کۆکەرەوەیە، واتا ئەو کەسانەی کە شت کۆدەکەنەوە، هەم بەو کەسانەیش دەوترێت کە کالاّیەك لە لایەن کۆمپانیایەك یان کەسێکەوە دەنێرێتە بەرماڵی یەکێك و دەیدەن بەو کەسە.

(٢) The idea

سەرچاوە

وەرزنامەی زندەرود، ژمارە ٢٠-٢١ پایز و زستانی ١٣٨٠

رامین جەهانبەگلو

# گفتوگۆ لەگەڵ ئەمانوێیل لێڤیناس دا




و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی

*ئێوە لە ساڵی ١٩٠٦دا لە لیتوانیا هاتوونەتە دونیاوە، سەبارەت بە منالێتان لە لیتوانیا چیتان بیرماوە؟

–من لە خێزانێکی جوولەکەدا هاتمە دونیاوە، کە فەلسەفە و زانستیان بەرز دەنرخاند. باوکم لە کۆڤنۆ (*Kovno*) کتێبخانەی هەبوو، هەربۆیە منیش هەمیشە لەگەڵ کتێبدا ژیاوم. گەرچی لە لیتوانیادا دەژیاین، بەڵام من لە ژینگەیەکی کەلتووریی رووسیدا گەورە بووم. لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە زمانی رۆشنبیران؛ زمانی رووسی بوو، لیتوانیایی زمانی خەڵکەکە بوو. جوولەکەکان بە رووسی لەگەڵ منالەکانیاندا قسەیان دەکرد. یەکەمین بیرەوەری گرنگی من جەژنی سێسەدەمین ساڵی بنەماڵەی

ڕۆمانۆڤ بوو لە ساڵی ١٩١٣دا، ئەوکاتە من تەمەنم شەش ساڵان بوو، ئێستاش بیرم دێ شەقامەکانی شارەکەمان بە ئاڵای پادشایی پڕکرابۆوە. دووەمین بیرەوەریی گرنگم سەبارەت بەو ڕۆژگارە، دەستپێکردنی یەکەم جەنگی جیهانی بوو لە ساڵی ١٩١٤دا. ئەوکات ئێمە لیتوانیامان جێهێشتبوو تا بچین لە خارکۆڤ– لە ئۆکرانیا– بژین. شەش مانگی خایاند تا گەیشتینە خارکۆڤ، لەبەرئەوەی لە سەفەرەکەماندا لە چەند شارێکی تریش لامان دا. لە خارکۆڤ چوومە قوتابخانەیەکی ڕووسی. لەوێ بوو کە بۆ یەکەمجار هەستم بە مەزنی ئەدەب و فیکری ڕووسی کرد.

*لەو ماوەیەدا کام نووسەری ڕووسی پتر کاریگەریی لەسەرتان هەبوو؟

–ئادەمیزاد لە تەمەنی دە ساڵیدا هەم دەکەوێتە ژێر کاریگەریی فۆلکلۆر و، هەم ئەدەبی ڕەسمی و، هەم کتێبە مێژووییەکانیشەوە. من گەرچی جوولەکە بووم، وەلێ لەنێو چیرۆکە ڕووسیەکاندا گەورە بووم. بەڵام ستایشی نووسەرانێکی ڕووسی گەورەی وەکو پووشکین و تۆلستۆی و تۆرگنێڤیشم دەکرد. بەمجۆرە. من وەکو مناڵێکی ڕووسیی ئاسایی گەورە بووم.

*پاش چەند ساڵێك، شۆڕشی بەلشەفیکی ڕووی دا و ئێوەش سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ لیتوانیا؟

–وەختێ شۆڕش ڕووی دا، ئێمە ناچار بووین ئۆکرانیا جێبهێڵین و بگەڕێینەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونم کە لیتوانیایە. لەوێ خوێندنی ناوەندیم لە خوێندنگایەکی یەهودیی ڕووسی زماندا تەواوکرد. لەو ڕۆژگارەدا لە لیتوانیا قوتابخانەی یەهودی هەبوون کە تیایاندا خوێندن بە زمانی ڕووسی بوو. بەم جۆرە، دوا تاقیکردنەوەم هاوتای دیپلۆمی فەرەنسا بوو و لەلایەن دەوڵەتەوە بە ڕەسمی دانپیانراو بوو. ئەوەشم بەبیر دێ کە ئەودەمە بە ئامادەبوونی نوێنەری حکوومەتی لیتوانیا تاقیکردنەوەکانمان ئەنجام دا.

*گەرچی ئەوسا مناڵیش بوویت؛ بەڵام ئایا بەربڵاویی شۆڕشی بەلشەفیك کاریگەریی لەسەرتان هەبوو؟

–کە شۆڕشی ڕووسیا لە شوباتی ١٩١٧دا دەستی پێکرد من زۆر لاو بووم، ساڵی دوای ئەوە چوومە قۆناغی ئامادەیی. باوکم و دایکم کە لە جوولەکە بۆرژواکان بوون، لە شۆڕشەکە زۆر دەترسان.

بەلای ئەوانەوە ڕابەرە بەلشەفیکەکان شێت بوون و گەرچی زۆربەی ئەو ڕابەرانەش جوولەکە بوون؛ بەڵام ئەوە هیچی لەو بۆچوونەی ئەوان نەدەگۆڕی. بەڵام

من لە کاری نووسەرانیکی رووسی وەکو دۆستۆیڤسکی و تۆلستۆی و تۆرگنیڤ– ەوە فێری بیرکردنەوەی فەلسەفیانە بووم. رۆمانی رووسی پرە لە پرسیاری فەلسەفی سەبارەت بە مانای ژیان و دردۆنگی میتافیزیکی.

من شەیدای شۆرش بووم. وەکو لاویك نەمدەتوانی بەرامبەر بەهەولەکانی شۆرش بێ دەربەست بم. هەستم دەکرد لە ساتیکی گەورەی میژووی مرۆڤایەتیدا دەژیم. لەگەڵ ئەوەشدا بە شیوەیەکی کردەیی وەکو شۆرشگیریك بەشداریم لەو شۆرشەدا نەکرد، بەڵام ئەوەی لە دەورو پشتمدا رووی دەدا زۆر سەرنجراکیش و هەژینەر بوو. تا ئەو رۆژەی کە لە حوزەیرانی ١٩٢٠دا باوکم و دایکم بریاریان دا بگەرێینەوە بۆ لیتوانیا. من ئەوەم پێ خۆش نەبوو، هەستم دەکرد پشت دەکەمە هەراوزەنای میژوو. بەڵام وەکو منالیکی جوولەکەش پیم قبوول نەبوو خیانەت لە خیزان و پەروەردەی خۆم بکەم. بۆیە لە سالی ١٩٢٠ تا ١٩٢٣ لەگەڵ باوکم و دایکمدا لە لیتوانیادا ژیام.

*بگەرێینەوە سەر فیربوونتان. ئایا "کتیبی پیرۆز" لە پەروەردەکردنی ئیوەدا وەك جوولەکەیەك رۆلیکی گەورەی دیوە؟

لە منالیمدا "کتیبی پیرۆز" بوونی هەبوو. بەردەوام "کتیبی پیرۆز" بەشیك بووە لە خویندنەوەی من. لە شەش سالیمدا باوکم و دایکم منیان بۆ وانەی عیبریی تەوراتی دەنارد. هەربۆیە، لەو کاتەوەی چوومە ئامادەیی، عیبریم دەخویندەوەو دەمتوانی دەقە یەهودییەکان تەرجەمە بکەم. بەڵام ئەو رۆژگارە لیکدانەوەکانی "کتیبی پیرۆز"یان فیر نەدەکردین. دواتر من پەیم بە گرنگیی ئەو لیکدانەوانە لە تیگەیشتنی "کتیبی پیرۆز"دا کرد.

*ئایا لەو رۆژانەدا کتیبی فەیلەسووفە یەهودییەکانیشت دەخویندەوە؟

–لە قۆناغی ئامادەییدا وانەی فەلسەفە نەبوو، بەڵام من وردە وردە خۆم خولیام بەرامبەر بە فەلسەفە لا پەیدا بوو. لەوانەیە بەلاتەوە سەیر بیت، بەڵام من لە کاری نووسەرانیکی رووسی وەکو دۆستۆیڤسکی و تۆلستۆی و تۆرگنیڤ– ەوە فیری بیرکردنەوەی فەلسەفیانە بووم. رۆمانی رووسی پرە لە پرسیاری فەلسەفی سەبارەت بە مانای ژیان و دردۆنگی میتافیزیکی.

*دوای ئەوەی دیپلۆمتان وەرگرت، لە سالی ١٩٢٣دا هاتنە فەرەنسا و چوونە زانکۆی ستراسبۆرگەوە. بۆچی ستراسبۆرگتان هەلبژارد؟

–باوکم و دایکم ئەوییان بۆ هەلبژاردم. دەزانیت ئەو رۆژگارە ستراسبۆرگ شاریکی پلە دوو بوو. نە زۆر گەورە بوو، نە زۆریش بچووك. پاشان ئەودەمە لە ستراسبۆرگدا کەلتووری ئەلمانی پایەیەکی بەرزی هەبوو، لەبەرئەوەی خەلکەکە بە ئەلمانی دەدوان. باوکم و دایکم ستراسبۆرگیان هەلبژارد، چونکە لە لیتوانیاوە نزیکترین شار بوو.

*کاتێ چوویت بۆ ستراسبۆرگ؛ فەرەنساییت دەزانی؟

-نەء، ئەوەندەم نەدەزانی. بەڵام بەرلەوەی فەلسەفە بخوێنم زمانی فەرەنساییم خوێند. هەروەها کەمێك لاتینیش.

*لە زانکۆی ستراسبۆرگ بە پرۆفیسۆر مۆریس پرادین (*Pradines*) و بلۆندل (*Blondel*) ئاشنا بوویت؟

-بلۆندل مامۆستایەکی دیار و تا بلێی سنگفراوان بوو. بیر و بۆچوونەکانی لە تیۆرەکەی دۆرکهایمەوە زۆر نزیك بوو. زۆر هۆگری کەلتووری رووسی بوو، هەرچۆن هۆگری هەموو کەلتوورەکانی تریش بوو. گەرچی بلۆندل جوولەکەش نەبوو، بەڵام زۆر بایەخی بە لێکدانەوەکانی "کتێبی پیرۆز" دەدا. هەڵبەت مۆریس پرادینیش مامۆستای گەورەی فەلسەفەی گشتی بوو. زۆرباش ئاگای لە دەروونناسی و فەلسەفەی نوێ بوو. پرادین تیۆرەکەی لیڤی- بروول (*Levy-Bruhl*)ی لە روانگەیەکی ئەقڵانیانەوە شی دەکردەوە.

*ئەو رۆژانە چ کەشوهەوایەك بەسەر زانکۆی ستراسبۆرگدا زاڵ بوو؟

-کەشوهەوایەکی پڕ لە ئارامی و رەوابینی. دەتوانم پێتان بڵێم کە من وەکو جوولەکەیەك، هیچ مامۆستایەك یان قوتابیەك هەراسانی نەکردم. تەنانەت مامۆستایەکم هەبوو کە راسترەویکی مەسیحی چالاك بوو؛ ناوی کارترۆن بوو. لەو رۆژگارەدا و بە حوکمی ئەو دۆخە سیاسییەی کە بەسەر ئەورووپادا زاڵ بوو؛ خوێندکارەکان زۆر سیاسیتر بوون لەمڕۆ. زۆربەی هاوپۆلەکانم مەیلیان بەلای چەپدا هەبوو. ژمارەیەکی زۆر لە خوێندکارەکانیش هەواداری چەپی مەسیحی بوون.

*لە زانکۆی ستراسبۆرگ زیاتر نووسینەکانی کێت دەخوێندەوە؟

-لەو رۆژگارەدا، فەلسەفەی تازە فەلسەفەکەی بیرگسۆن بوو. هەموو باسی بیرگسۆن و چەمکی "زەمانە" (*DUREE*)یان لای بیرگسۆن دەکرد. منیش کەوتبوومە ژێر کاریگەریی فەلسەفەکەی بیرگسۆن و بۆچوونی بۆ چەمکی "زەمەن". تەنانەت ئێستاش ناوبەناو بیرگسۆن دەخوێنمەوەو هێشتا هەر لەو بڕوایەدام کە فەلسەفەی هاوچەرخ بەبێ فەلسەفەکەی بیرگسۆن هیچ مانایەکی نییە.

*دوای ئەوەی لیسانسی فەلسەفەتان وەرگرت، دەستتان بە پایاننامەی دکتۆرا کرد و، ئەوکاتە بوو کە ئەدمۆند هۆسێرلتان کەشف کرد.

-خانمێکی لاو کە ناوی گابریل فایفەر بوو، لە "دەزگای لێکۆڵینەوەی فەلسەفی ستراسبۆرگ" کاری دەکرد، رایسپاردم کە بۆ کارکردنم لەسەر تیۆرەی "ئیدراك"،

کتیبی "تویژینەوە مەنتیقیەکان"ی هۆسیرل بخوینمەوە. ئەم کتیبە زۆر قورس بوو، بەلاّم دەرگایەکی تازەی لە ئاست بیرکردنەوەی فەلسەفیدا بە رووی مندا کردەوە. بیرۆکەی ئەوەی کە ئەو نیگایەی لەسەر شتیك دەگیرسیتەوە، هەمان ئەو نیگایەیە کە ئەو شتە دەپیۆشیت و، هەروەها بیرۆکەی پەرینەوە لە شتەوە بۆ "مەبەست" و لە "مەبەست"ەوە بۆ هەر شتیك کە ئەو مەبەستە وەکو ئاسۆیەکی تیفکرین لەخۆ دەگریت، هزری راستەقینەی دیاردەناسیە، ئەمانە کۆمەلیك ئیمکاناتی زۆریان تیدابوو. لەبەرئەمە بوو کە پەیوەندیم لەگەڵ هۆسیرلدا بەست و لە سالی ١٩٢٩دا بۆ بینینی و بۆ ئامادەبوون لە وانەکانیدا چووم بۆ فرایبۆرگ. مانەوەم لە فرایبۆرگ هەلی پەیوەندیکردنی راستەوخۆی لەگەڵ هۆسیرلدا بۆ رەخساندم.

*هۆسیرل چۆن بنیادەمیك بوو؟ تایبەتمەندیەکانی چی بوون؟ سەبارەت بە کەشوهەوای وانەکانی چیت لە یادە؟

–هۆسیرل لە رووی وانە وتنەوەوە لە زانکۆ بنیادەمیکی زۆر تەقلیدی بوو، بەلاّم بابەتی زۆر تازەی دەوروژاند. هۆسیرل وا دەهاتە بەرچاو کە ئەرکی فەلسەفی خۆی بە ئەنجام گەیاندوە، هەرچەندە وای پیشان دەدا کە هیشتا لە سەرەتای تویژینەوەکانی دیاردەناسیدا ین و، هیشتا کار و لیکۆلینەوەی فەلسەفی دیکە ماوە تا ئەو ئەرکە بگاتە ئاکام. هەربۆیە گفتوگۆکردن لەگەلیدا دژوار بوو. لەبەرئەوەی ئەگەر پرسیاریکت لی بکردایە؛ ئەو بە دریژی لە روانگەی سیستمی فیکریی خۆیەوە وەلاّمی دەدایەوە. هیچ شتیکی چاوەروان نەکراو لە ئارادا نەبوو، وات هەست دەکرد کە بەرلەوەی ئەو قسە بکات تۆ دەزانیت وەلاّمەکە چییە، لەبەرئەوەی وەلاّمەکە دەچوە نیو رەوتی پەرەسەندن و خستنەرووی فیکری هۆسیرلەوە.

*با بیینە سەر هایدیگەر. تۆ لەبەر هۆسیرل هاتیت بۆ فرایبۆرگ، بەلاّم هایدیگەرت کەشف کرد.

–من لەگەڵ هەموو ئەو ریزە زۆرەمدا کە بۆ هۆسیرلم هەبوو، زوو دەستبەرداری بووم و کەوتمە شوین هایدیگەر. بەلاّم من تاقە کەس نیم ئەمەم کردبیت. هایدیگەر لە هەمان ئەو زانکۆیەدا وانەی دەوتەوە کە هۆسیرلیشی لیبوو، بەلاّم قوتابیەکانی هایدیگەر لە قوتابیەکانی هۆسیرل زیاتربوون. هەموو شالاّویان دەبرد بۆ ئەو هۆلە گەورەیەی کە هایدیگەر وانەی تیا دەوتەوە. ئەمەش بۆ هۆسیرل زۆر ناخۆش بوو. ئەم دۆخەش تا رادەیەك پەیوەندیی نیوان شوپنهاوەر و هیگلم وەبیر دینیتەوە، کاتێ لە

هۆسیرل لە رووی وانە وتنەوەوە لە زانکۆ بنیادەمیکی زۆر تەقلیدی بوو، بەلاّم بابەتی زۆر تازەی دەوروژاند.

زانکۆی بەرلین بوون. زۆربەی قوتابییەکان دەچوونە وانەکانی هیگلەوە و شۆپنهاوەر بە تەنیا دەمایەوە، لەگەڵ چەند قوتابییەکدا کە لە دەرەوەی زانکۆوە دەهاتن. دیسانەوە دیتەوە یادم کە بۆ ئامادەبوون لە وانەکانی هایدیگەردا؛ دەبوایە لە بەیانییەوە جێت بگرتایە بۆ وانەی پاش نیوەڕۆی. وانەکانی هایدیگەر زۆر درەوشاوە بوون. هزری ورد و زۆر تۆکمە بوو. بە شێوەیەکی بلیمەتانە و مامۆستایانە شیکردنەوە فینۆمینۆلۆژییەکەی هۆسێرلی بەکاردەهێنا. بەم جۆرە، لەهەر وانەیەکیدا شتێکی تازەی بۆ ئێمە پێ بوو. ناتوانم پێت بڵێم کە شیکردنەوەکانی هایدیگەر بۆ (بوون) و (بوونەوەر) و جیاوازی ئۆنتۆلۆژیا بەناوبانگەکەی ئەو لە کتێبەکەیدا (بوون و زەمەن)؛ تا چ ڕادەیەك منیان سەرسام دەکرد.

*ئەی سەبارەت بە هایدیگەر چیتان لەیادماوە؟ بە شەخسی دەتانناسی؟

–قەت بە شەخسی ئەوم نەناسیوە. هەرگیز لە دەرەوەی سیمینارەکانی پەیوەندیی دۆستانەم لەگەڵیدا نەبوە. تۆ خۆت دەزانیت کە هایدیگەر کەسێکی پلەوپایەخواز بوو، لەبەرئەوەی دژە (سامی)یش بوو؛ زۆر جێی متمانە نەبوو، بەڵام پەیوەندییەکی گەلی باشی لەگەڵ مامۆستا و قوتابییەکاندا هەبوو. هەڵکەوتوویەکەی شتێکی دیاربوو. بۆ منیش سەرچاوەیەکی بەپێت بوو.

*بەڵام هایدیگەر کاریگەرییەکی زۆری لەسەر ئێوە جێهێشتوە.

–بەڵێ، زۆر. (بوون و زەمەن) کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من جێهێشت. هەستم دەکرد لە ڕێی هایدیگەرەوە دەرگایەك بۆ من بە ڕووی هەموو شتێکدا کرایەوە. هایدیگەر خاوەنی هێزێکی وا پرشنگدار بوو کە هەموومانی دەخستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە ئێمە هەموومان شەیدای هایدیگەر ببووین و پێی سەرسام بووین. ئەو بە جۆرێك قسەی دەکرد کە کەسی تر بەر لەو وەها قسەی نەکردبوو.

*ئەمڕۆش هێشتا ئێوە هەر بە هەمان ئەندازە شەیدای هایدیگەرن؟

–بە ڕاستی پێت بڵێم، سەختە لام بڵێم شەیدای ناسیونال سۆسیالیستیکم. بەڵام بلیمەتیی فیکری و فەلسەفی هایدیگەر حاشاهەڵنەگرە. من هەستم بەمە کردوە و بەردەوامیش هەستی پێ دەکەم. ئەمەش بەهێزترین کاریگەریی بوە لە ژیانمدا کە پێم قبووڵ بوە. وابزانم ئەو کاتانەی من هایدیگەرم تیا ناسی (واتە ساڵانی ١٩٢٠–١٩٣٠) ئەو نازی بوو، بەڵام ئەوەندە باسی ئەوەی نەدەکرد. ئەبێ ئەوەشمان بیرنەچێت کە لە هەلومەرجە مێژوییەکانی نازیزمدا، هایدیگەر بڕوای وابوو کە نیشتمانەکەی باری

> (بوون و زەمەن) کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من جێهێشت. هەستم دەکرد لە ڕێی هایدیگەرەوە دەرگایەك بۆ من بە ڕووی هەموو شتێکدا کرایەوە.

چارەنووسی (بوون)ی بەکۆڵەوەیە. لە ڕاستیدا هایدیگەر ماوەیەك باوەری بە هیتلەر هەبوو. لەوانەیە لە هیتلەردا ئومیدی بەجیهانیکی تازە هەبووبیت. بەهەرحال بەلامەوە سەختە ئەم شتانەم بیرچیتەوە.

*بە بروای ئیوە هەنووکەییبوونی هایدیگەر لە چیدایە؟

–وتنی دژوارە. وای دەبینم ئەوەی لە هایدیگەر دەمینیتەوە دیاریکردنی ئەو پرنسیپەیە کە جۆری مرۆڤ پیگەی سەرهەلدان و دروستبوونی ڕووداوی فەلسەفیە. بە بروای هایدیگەر، ڕووداوی فەلسەفی پەیوەستە بە بونیادی "بوون"ەوە. لە دوای هایدیگەرەوە تەواوی فەلسەفە لەسەر بناغەی ئەم بونیادی "بوون"ە گەشەی سەندوە. بە بۆچوونی ئەو مەسەلەی ئەسل و سەرەتا لە مرۆڤدا وەکو بوونەوەریك دەبینینەوە. بەلام بوونی مرۆڤ وەکو بوونەوەریك، بریتیە لە تیگەیشتنی "بوون". بێ هیچ دوودلییەك؛ فەلسەفەی هایدیگەر بەرەنجامی تازەی هزری یۆنانی و ڕادیکالیزەکردنی سەرلەنویی پرسیاری فەلسەفیە.

*ئایا ئیوە خۆتان بە فەیلەسووفیکی هایدیگەری دەزانن؟

–هایدیگەری نا. بەلام دواجار هایدیگەر کۆمەلیك مەسەلە دەخاتەروو کە منیش پیم قبوولن. ئەو مانایەی کە چەمکی "بوون" لە فەلسەفەی هایدیگەردا هەیەتی؛ بە بروای من زۆر گرنگە. جگە لەوە، هایدیگەر بەشیکە لە ژیانی فەلسەفی من. کاریگەرییەکی زۆری لەسەر من هەبوە و ناتوانم نکوولی لەو کاریگەرییە بکەم. ئیستاش هەر جاریك کتیبی "بوون و زەمەن" دەخوینمەوە، هەست دەکەم دەکەومە ژیر سیحری ئەوەوە.

*ئیوە لە شوینیکدا نووسیوتانە کە هایدیگەر فیری کردم بوون وەکو زرنگانەوەیەکی زمانی دەرك پێ بکەم.

–ئا.. ئیوە ئەم ڕستەیەتان لەبەرکردوە، زۆر ڕاستە، دەزانیت کە "بوون" بەر لە هەر شتیك کرداریکە. لەگەڵ ئەوەشدا لەم بونیادە ڕیزمانیەدا چەمکی بنەرەتیتر کە مرۆڤە دیتە پیشەوە.

لە ڕەوتگەی چەمکی "بوون"ەوە، چیدی مرۆڤ دەرکەوتەیەکی پەتیی دەروونناسیانەی گیانەوەرانە نییە. لەبەرئەوەی ئەگەر مرۆڤ نەبوایە؛ چەمکی "بوون"یش نەدەبوو.

بە بروای هایدیگەر، ڕووداوی فەلسەفی پەیوەستە بە بونیادی "بوون"ەوە. لە دوای هایدیگەرەوە تەواوی فەلسەفە لەسەر بناغەی ئەم بونیادی "بوون"ە گەشەی سەندوە.

*با بگەڕێینـەوە سـەر یادەوەرییـەکانتان. دەتوانیـت باسـی ڕووبەڕووبوونەوەکـەی نێوان ئەرنسـت کاسیرەر و مـارتین هایدیگـەرمان لـە داڤۆس بۆ بکـەیت کـە لـە سـالی ١٩٢٩دا ڕووی دا؟ ئێوە ئاگاتان لەم ڕووبەڕووبوونەوەیە بوو.

–جۆرە کۆڕێك بـوو سـەبارەت بـە کـانت و دیاردەناسـی (فینۆمینۆلۆجیا). جگـە لـە هایدیگەر و کاسیرەر، فەیلەسووفی فەرەنسـی جـان کاڤایسـیش لـەوێ بـوو کـە دواتـر نازیستەکان بە تاوانی ئەوەی ئەندامی بزووتنـەوەی بەرەنگارییـە، گوللـەبارانیان کـرد. مـن بـۆ بەشـداریکردن لـەم کۆبوونەوەیـەدا؛ بـە ڕاسـپاردەی هایدیگـەر بۆرسـیکم لـە ستراسبۆرگ وەرگرت. من ئیستاش هەندێ شتی گرنگم سەبارەت بەوە لەیاد ماوە، بە تایبەتیش ڕووبەڕووبوونەوەکەی هایدیگەر و کاسیرەر. کاسیرەر باسـی شیکردنەوە هایدیگەرییەکەی کانتی دەکرد و هایدیگەریش بۆچوونەکانی خۆی سەبارەت بە کانت دەخسـتەڕوو. تـا ڕادەیـەك کاسـیرەر نوینـەری نـەریتی کلاسـیك و ئەریسـتۆکراتی ژینگەی زانکۆیـی ئـەلمانیا بـوو. هەمیشـە لـە دواوە بـوو و بیدەنـگ بـوو. لـە کـاتیکدا هایدیگـەر نوینـەری یـەکبوونی فەیلەسـووف و نیشـتمان بـوو. ئیسـتاش هایدیگـەرم دیتەوە یاد، کاتێ جلوبەرگی سکی (هەلخلیسکان لەسـەر بـەفر)ی لەبـەردەکرد لەگـەڵ کڵاوی ئەوانەی بەسەر شاخدا سەردەکەون و هەموو ڕۆژێك بە مەبەستی پیادەڕۆیشتن، دەچوو بۆ کۆسارەکان.

هایدیگەر زۆر وەرزشـەوان بـوو، لـە کاتیکا کاسیرەر زۆر ئـارام بـوو و حالـەتیکی ئەریستۆکراسـیانەی هـەبوو. یادەوەریـەکی تـرم بریتیـە لـە شـانۆنامەیەك کـە لەگـەڵ قوتابیـان و مامۆسـتاکاندا سـەبارەت بـە ڕووبەڕووبوونەوەکـەی هایدیگـەر و کاسـیرەر پیشـکەشمان کـرد. پرۆفیسـۆر بۆلنـۆ دەوری هایدیگـەری دەبینـی و منیـش دەوری کاسیرەر. بۆیـە منیـان بـۆ ئـەو دەورە هـەلبژاردبوو، چونکـە قـژم لـە قـژی کاسـیرەر دەچوو. هەموو سەروقژمیان کردبوو بە پۆدرەی سپی.

*ئیسـتا بـا بیینـە سـەر بـەردەوامبوونتان لەسـەر ڕیـی خۆتـان و ڕۆژگـاری دوەم جەنگی جیهانی.

–پاش تەواوکردنی دکتۆراکەم، چووم و لە پاریس نیشتەجێ بووم. منیان کرد بە بەڕیوەبـەری "ئـەکادیمیای یـەهودیی خۆرهـەلات". کـە مامۆسـتای بـۆ قوتابخانـە خۆرهەلاتیـەکان ئامادە و پـەروەردە دەکرد. دەسـتم بـە نووسـینیش کـرد. یـەکیك لـە نووسـینە فەلسـەفیەکانی ئـەو ڕۆژگـارەم نـاوی هـەلاتن (*de l,evasion*) بـوو. بابـەتی ئـەم کارەم پیشبینی کردنی ئایدیۆلۆجیای هیتلـەری بـوو کـە وردە وردە هـەموو شوینیکی

گرتــەوە. کاتــێ ئیســتا دەچمــەوە ســەر ئــەو دەقــە و دووبــارە دەیخوێنمــەوە، هــەموو قورسایی ئەو نائومێدییە هەست پێ دەکەم کە ئەو ڕۆژانە لە ئاست ئەو ڕووداوە مێژووییانەدا هەستم پێ دەکرد کە لە ئەلمانیادا ڕوویان دەدا. چوار سال دوای ئەو نووسینەم و لە سالی ١٩٣٩دا خۆم لەناوجەرگەی ئەو ڕووداوانەدا بینیەوە. بووم بە وەرگێری ڕووسی و ئەلمانی لە سوپای فەرەنسادا. پاش شکستی فەرەنسا لە ١٩٣٩دا لە شاری ڕین زیندانی کرام و گواسترامەوە بۆ ئەلمانیا.

*تۆ وەکو زیندانییەکی جوولەکە هیچت لەسەر نەبوو؟

–مــن بــارێکی زۆر تایبــەتیم هــەبوو. لەبەرئــەوەی ئەلمانیــەکان دەیــانزانی مــن جوولەکەم، بەڵام جلوبەرگی سەربازیی فەرەنسایی منی لە مردن لە گرتووخانەی دیلەکان ڕزگار کرد.

ســەربازە جولەکــەکانیان لــە ســەربازە فەرەنســیەکان جیــادەکردەوە، بــەڵام لەگــەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیمە لە بڕیارەکانی ڕێکەوتنامەی جنیڤ بەهرەمەند بووین.

*ماوەی دیلیتیت چۆن بەسەربرد؟

–من لە ئۆردوگایەکدا بووم لە هانۆڤەر. ئەوانە ئازاری ئیمەیان نەدەدا لەسەر جوولەکە بوونمان، بەڵام لە بەیانیەوە تا ئیوارە ناچار دەکراین لە دارستاندا کاربکەین.

*کاتتان بۆ خوێندنەوە هەبوو؟

–وەکو زیندانیەکانی دی بە تەنها مافی ئەوەمان هەبوو بەستەو نامەمان بۆ بێت. کتێبیشمان پێ دەگەیشت، هەلبەت نازانم لە کویوە و لە کێوە. تەنانەت لەو ڕۆژانـــــی دیلیتیەشمدا دەرفەتی سەرلەنوێ خوێندنەوەی هایدیگەرم هەبوو. هیگل و پروست و ڕۆسۆشم دەخوێندەوە. دۆخیکی نموونەیی نەبوو، بەڵام توانای بەرگەگرتنیم هەبوو. هەرچۆنیك بوو وەختی خۆم بەفیرۆ نەدەدا. دەزانیت، جەنگ و زیندان هەلویستگەلیکن کە تیایاندا مەسەلە ئۆنتۆلۆجیەکان وەکو پێداویستیەکی ئاکاری خۆیان دەسەپێنن.

*ئیستا کە هاتینە سەرباسی ئاکار (ئەخلاق)، هەستتان چی بوو بەرامبەر ئەو کوشتارەی نازیستەکان لە ئۆردوگاکانی دیلەکاندا ئەنجامیان دا؟

–لــە زینــدان، هیــچ شــتیکمان لەمانــە نــەدەزانی، دواتــر تیگەیشــتین. قــابیلی تەسەور نەبوو، تەنانەت بۆ دیلەکانی جەنگیش. جیاوازیی نیوان ئیمەی سەربازانی جوولەکەی زیندانی لە زیندانی ئەلمانیەکاندا و ئەو جوولەکانەی کە بۆ کوورەکانی سووتاندنی مرۆڤ لە ئاشڤایتس دەنیردران؛ ئەوە بوو کە هەرچەند لەگەڵ ئیمەدا

مامەلـەیان خـراپ بـوو، بەڵام وەکـو سـەربان، یاسـا نیودەولەتیـەکان بـەرگریان لــە ئیمـە دەکــرد. لــە کاتیکــا ئــەوانیان بــە چــاوی حەیوانــەوە تەماشــا دەکــرد و کــەس نەبوو بەرگرییان لێ بکات. لەگەڵ ئەمانەشدا. ئاشڤایتس بـۆ هـەتا هەتایـە پەلەیەکـە بە ویژدانی مرۆڤایەتیەوە.

*یەکـەمین کتیبیـك کـە تیـایدا بـیروبۆچوونی خۆتــان روون دەکەنــەوە کتیبیکــی بچکۆلەیـە بە نـاوی "لـە بوونـەوە تـا بوونـەوەر" کـە لـە کـاتی جـەنگدا و لـە زینـدانـدا نووسیوتانە.

–بەلی وایـە. کاتێ کـە زینـدانی بـووم لـە ئۆردوگایـەکدا؛ دەسـتم بـە نووسـینی ئـەم کتیبە کرد و پاشتر لە پاریس بڵاوم کردەوە. وای بۆ دەچم ئەوەی گرنگە لـەم کتیبـەدا وەسفکردنی مەسەلەی بوونە لە بیناویدا. ئەو مەسەلەیەی کە لەم کتیبەدا دەخریتەروو شتیکە کە من ناوم لیناوە "هەیە" (یـان بوونـی هەیـە). کاتـێ لـە "هەیـە" دەدویـم، مەبەستی لایەنی ناشەخسی بوونە. دەبێ وریـابین کـە بینـاوی و بیدەربەسـتی چـەمکی "هەیــە" لەگــەڵ بەخشــندەیی چــەمکی "*es gibt*"ی هایدیگــەردا تیکــەل نەکــەین. لەبەرئەوەی لە "*es gibt*"دا فرمانی ئەلمانی "*geben*" هەیە کـە بـە مـانی "پیـدان" دیـت. بە بۆچوونی هایدیگەر "*es gibt*" رەحمەتیکەو دراوە. لە کاتیکا چەمکی "هەیـە" لـە جۆریك بێ مانایی (*non- sense*)ی بیناو و ناشەخسیەوە سـەرچاوە دەگریـت. دەبێ بـە جۆریـك لــە "هەیــە" بگــەین، وەکـو ئــەوەی دەلیــین "رۆژە". لــەم رســتەیەدا چــەمکی بەخشندەیی نییـە. ئـەم ئەزموونـە ترسـناکە، بـە ناشەخسـی کردنـە، ترسـیکی تـەواوە بەرامبەر بە بوون.

*ویرای ئەمەش، لەودیو ئەم دلەراوکیی بیناوی و ترسەوە لە بوونیکـی بینـاوەوە، ئیوە بۆ یەکەم جار لە کارەکانتاندا باسی مەسەلەی "ئەوی دیکەیی" دەکەن.

–راسـتە. دەرچوونــی راســتەقینە لــە چــەمکی "هەیــە" لــە "بــوون لــە پینــاوی ئەوی دیکـەدا" خـۆی حەشـاردراوە. بێمانـایی بـوون بـە تەنـها لـە ئاسـتی قبوولکردنـی بەرپرسـیاری بـۆ ئـەوی دیکـەدا نـامینیت. تەنــها کــاتیك "مــن" لــە کۆتــی "هەیــە" رزگـاری دەبیـت کـە پەیوەندییـەکی بێ مەبەسـتانە لەگـەڵ ئـەوی دیکـەدا دروسـتبکات. ئـەوی دیکـە، واتـە چوونـە دەرەوە لـە خـود. هـەموو ئـەو شـتانەی دواتـر نووسـیمن؛ ریشـەیان دەچیتـەوە سـەر ئـەم بیرۆکـەی "بــوون لــە پینــاوی ئــەوی دیکــەدا"، کــە لــەم کتیبەدا لیی دواوم.

تەنها کاتێك "من" لە کۆتی "هەیە" رزگاری دەبێت کە پەیوەندییەکی بێ مەبەستانە لەگەڵ ئەوی دیکەدا دروستبکات. ئەوی دیکە، واتە چوونە دەرەوە لە خود.

*بابەتی "ئەوی دیکە" لە کتیبیکی تری ئیوەشدا دەبینین کە ناوی "زەمەن و ئەوی دیکە"یەو بریتیە لە چوار وتارتان کە لە "قوتابخانەی فەلسەفە"ی جان ڤالدا وتوتانەتەوە. دەتوانیت باسی ئەم کتیبەتمان بۆ بکەیت؟

–لەگەڵ جان ڤالدا زۆر هاوڕێ بووین و لەو بروایەدا بووم کە فەیلەسووفیکی گەورەیە. جان ڤال ئەم قوتابخانەیەی لە نزیك سۆربۆنەوە دروستکردبوو تا دەرفەت بۆ فەیلەسووفە نائەکادیمیەکان برەخسینیت قسەی خۆیانی تیا بکەن. ئەوەبوو داوای لە من کرد چەند وتاریك لەسەر بابەتەکانی کار و هزری فەلسەفیم بخوینمەوە. منیش بابەتی "زەمەن"م وەکو دەرگایەك بەسەر "ئەوی دیکە"دا هەلبژارد و هەولم دا ئەوە بخەمە روو کە زەمەن بەرەنجامی کرداری یەك "من"ی تەنیا و گۆشەگیر نییە، بەلکو بەرەنجامی پەیوەندیی تاکە کەسە بە ئەوی دیکەوە. ئەم کتیبە دەیەویت زەمەن لە چوارچیوەی ئەزموونی پەتی دریژبوونەوەدا نەبینیت؛ بەلکو لە پەیوەندیدا بە "ئەوی دیکەوە".

*کەواتە بە بروای ئیوە کۆمەلایەتیبوون (*Socialite*) دەرچوونە لە خود بۆ بینینی ئەوی دیکە. ئایا لیرەدا چەمکی "بەرپرسیاری" دیتە پیشەوە؟

–بەرپرسیاربوون واتە بیدەربەست نەبوون لە ئاست ئەوی دیکەدا.

بەر لەوە هۆسیرل بەرپرسیاریتی لە ئاست حەقیقەتدا خستەروو،. بە بۆچوونی من بەرپرسیاریتی لە ئاست حەقیقەتدا، بەبێ بەرپرسیاریتی لە ئاست ئەوی دیکەدا؛ بوونی نییە. پەیوەندیی نیوخودیتی (*intersubjectivite*) تەنها لە ئاکاردا بە مانای بەرپرسیاریتی هەیە. بە واتایەکی دی، مەسەلەی تاکەکەسی تەنها لە شیوەی پەیوەندیی نیوخودیتیدا هەیە. خودیتی (*Subjectivite*) بریتی نییە لە بوون لە پیناوی خۆدا؛ بەلکو بریتیە لە بوون لە پیناوی ئەوی دیکەدا.

*ئەی بەرپرسیاریتی ئەوی دیکە بەرامبەر بە من چییە؟

–بەرپرسیاریتی ئەوی دیکە بەرامبەر بە من بەخۆیەوە بەندە. پەیوەندیی بەرابەر نییە. ئەوی دیکە بەر لە من. من هەم لەبەرئەوەی بۆ ئەوی دیکە هەم.

هەمیشە بەرپرسیاریتی من زیاترە لە بەرپرسیاریتی هەموو ئەوانی دیکە. هەروەکو ئەوەی دۆستۆیڤسکی لە (برایانی کارامازۆڤ)دا دەلیت: "ئیمە هەموومان بەرامبەر بە هەموو بەرپرسیارین لە هەموو شتیك و هەموو کەسیك و من لە هەموو ئەوانی دیکەش زیاتر بەرپرسیارم".

بە بۆچوونی من بەرپرسیاریتی لە ئاست حەقیقەتدا، بەبێ بەرپرسیاریتی لە ئاست ئەوی دیکەدا؛ بوونی نییە.

*بە رای ئێوە پەیوەندی لە نێوان چەمکی "بەرپرسیاریتی" و بابەتی "روخسار"دا هەیە. چۆن دەتوانین پەیبردن بە روخسار بە پێداویستیەکی ئاکاری لەقەلەم بدەین؟

–ئەوی دیکە روخسارە، روخساریش مانای تایبەتی ئەوە. هەر بۆیەشە باشترین رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەوی دیکەدا لە ڕێی روخسارییەوە دەبێت. رووبەڕوو سەیرکردنی ئەوی دیکە، تەماشاکردنی روخساری، بەشیاوکردنی کۆتایی پێنەهێنانی پەیوەندیی ئاکارییە. روخسار ئەو شتەیە کە یەکێك لە ماناکانی ئەوەیە کە "تۆ هەرگیز ناکوژیت" و تەواوی پەیوەندیی ئاکاریش دەچێتە ژێر رکێفی ئەم نەشیاوبوونەی کوشتنەوە. لە یەکەمین جیلوەی روخساری ئەوی دیکەدا، ئەم فەرمانەی تەورات هەیە کە "تۆ هەرگیز ناکوژیت"، روخسار فەرمانێکیشە بۆ لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیاریتی ئەوی دیکە و بە تەنیا جێنەهێشتنی.

*بە رای ئێوە روخسار خاوەنی تایبەتمەندیی "پاکژی"یشە. ئەم چەمکی "پاکژی"ە چۆن هاتۆتە ناو فەلسەفەی "ئەوی دیکە"ی ئێوەوە؟

–من لەو بڕوایەدام کە پەیوەندیی نێوان ئادەمیزادەکان بە تەنها لە پاکژیی بووندا بۆ یەکدی هەن. لە روخساردا جۆرە پاکژیەك هەیە، بەڵام بە تایبەتی لە رەفتاریکیشدا هەیە کە بە مەبەستێکی ئاکاری لەگەڵ روخسارێکی تردا دەبێت. لە پەیبردن بە روخساردا بێگومان پەیبردن بە بیرۆکەی پاکژیش هەیە. بەرپرسیاریتی تاکەکەس بەرامبەر بەوی دیکە دەستەبەری پاکژیی باری سەرشانی ئەوە لە رووبەڕووبوونەوەیدا لەگەڵ روخسارێکی رووت و نامۆی کەسێکی دیکەدا.

*ڤیتگنشتاین دەڵێت: "روخسار رۆحی جەستەیە" ئێوە لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

–بە بڕوای من ئەم دەستەواژەیەی ڤیتگنشتاین خاڵیە لە ئاکار. راستیەکەی ئەوەیە کە روخسار پەنجەرەیەکە بە رووی ئەوی دیکەدا، ئادەمیزاد واتە ئیمکانی پاکژبوون. لە بوونی "زیاتر بایەخدان بە ئەوی دیکە وەك لە خەمی خۆت"دا پاکژییەکی شاراوە هەیە. مەبەستی من لە روخساری ئەوی دیکە بەرپرسیاریتی من بەرامبەر بەو و هەر ئەمەش کرۆکی باسی عەدالەتە.

*مەبەستتان لە عەدالەت چییە؟

–مەبەستی من لە عەدالەت؛ چاوەڕێ کردنی داوەرییەکە کە ئەوی دیکە بە تاقانە و دانسقە دەزانێت. عادیلبوون واتە دۆزینەوەی بەرزی و جوانی لە ئەوی دیکەدا بەبێ گرنگیدان بە بەرژەوەندیی تایبەتی. واتە بە گوێرەی حەقیقەت داوەریکردن و بە عیشقەوە رەفتارکردن لەگەڵ ئەو کەسەدا کە دەچێتە ژێر

مەبەستی من لە عەدالەت؛ چاوەڕێ کردنی داوەرییەکە کە ئەوی دیکە بە تاقانە و دانسقە دەزانێت. عادیلبوون واتە دۆزینەوەی بەرزی و جوانی لە ئەوی دیکەدا بەبێ گرنگیدان بە بەرژەوەندیی تایبەتی.

داوەرییەکەوە. بە واتایەکی دی عادیلبوون واتە کەمکردنەوەی ئەو مەودایەی کە عەدالەت لە چاکە جیادەکاتەوە.

*تۆ لەو بڕوایەدایت کە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان، کۆمەڵگای عادیلن؟

—ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان کۆمەڵگای لیبرالن، بەڵام پێویستیان بە کۆمەڵگای کراوەتر هەیە. لەبەرئەوەی بوونی عەدالەت لە کۆمەڵگای لیبرالدا خۆی لە خۆیدا بوونێکی بنجبڕانە نییە. پێویستە بەردەوام لە ناوجەرگەی ئەم کۆمەڵگایانەدا بزووتنەوەی وا دروست ببن کە ببنە مایەی هەستکردن بەوەی کە هێشتا عەدالەت عادیلانە نییە. لەوانەیە هەر ئەمەش خەسڵەتی جیاکەرەوەی دیموکراسی بێت، لەبەرئەوەی ریشەکانی دیموکراسی لە جۆرێک ئازاری ویژداندایە بەرامبەر بەو عەدالەتەی لە ئارادایە. دیموکراسی دەزانێت کە تەواو عادیل نییە و لەبەر ئەمەشە پەنا دەبرێتە بەر چاکەخوازی و گەر ئەوە فەرامۆش بکات کە دەتوانێ عادیلتر بێت، ئەوکات مەترسیی ئەوەی لێ دەکرێ بگۆڕێ بۆ سیستمێکی تۆتالیتار و لەم حاڵەتەشدا ئەوی دیکە وەکو بوونەوەرێکی دانسقە و تاقانە و تاکێکی زیندوو لەناودەبات و خۆی لە دونیایەکی رێکخراو و بەرێوەبراودا نوقم دەکات.

*لە شوێنێکدا بەرچاوم کەوتوە کە لە کتێبەکەی "ڤاسیلی گرۆسمان"ەوە، —واتە کتێبی (ژیان و چارەنووس)— هەندێ شتت لەم بارەیەوە وەرگرتوە.

—من گرۆسمان بە نووسەرێکی زۆر باش دەزانم. ئەو رۆماننووسێکی گەورەیە کە بە وردی سەیری قەیرانە سەرەکییەکانی ئەم سەدەیەمان (واتە سەدەی بیستەم) دەکات. گرۆسمان گەورەترین قەیرانی مانەوی لە ئەورووپای مۆدێرندا دەبینێتەوە. گرۆسمان پێمان دەڵێت کە چۆن هزرێکی دلفراوانی وەکو سۆسیالیزم— کە دان نانە بە ئەوی دیکەدا و سیستمێکە لەسەر چاکە بنیات نراوە— هەر ئەوەندە بگۆڕێت بۆ رێبازێکی سیاسی و رێکخراوێک و سیستمێکی زەینی، دەبێت بە سیستمێکی ترسناکی ستالینی. ئەوەی کە گرۆسمان پیشانمانی دەدات نائومێدییەکی تەواوە کە بەرەنجامی سیستمی ترسناکی ستالینیزمە. لەگەڵ ئەمەشدا بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە شتێکی پۆزەتیڤمان دەستگیر دەبێت، کە ئەویش هێزێکی کەمی چاکەخوازییە، ئەو چاکەخوازییانەی کە لە شێوەی کاری بچووک و تەنیادا دەردەکەون، لە نێوان دوو کەسدا روودەدەن و ناچنە چوارچێوەی سیستمێکەوە. وەکو دیمەنی کۆتایی کتێبێک کە تیایدا کۆمەڵێک کەس دژی سەربازێکی ئەڵمانی هەڵساون و بەڵام لەولاوە ژنێک دوا

—ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان کۆمەڵگای لیبراڵن، بەڵام پێویستیان بە کۆمەڵگای کراوەتر هەیە.

پارچە نانی خۆی دەدا بە سەربازە ئەلمانیەکە. ئیدی ئەمەش جۆرە پیاچوونەوەیەکە بە ئاکاردا، بەبێ خۆهەلواسین بە سیستمیکی ئاکارییەوە.

*ئەمە هەمان ئەو بیرۆکەیەیە کە ئیوە لە کتیبی "هەمەکیتی و بێکۆتایی"دا دووبارە دەچنەوە سەری.

–من بەرلەوەی کتیبی "ژیان و چارەنووس"ی گرۆسمان بخوینمەوە؛ ئەو کتیبەم نووسی. بەلام هزری "چاکەخوازی" بەو شیوەیەی کە گرۆسمان لەو کتیبەیدا باسی کردوە، لە کتیبەکەی منیشدا هەیە. ئەوەی ویستوومە لەو کتیبەدا بیخەمەروو ئەوەیە کە ناتوانین میژووی فەلسەفە بۆ جۆرە هەمەکیتیەك کورت بکەینەوە کە تیایدا هۆشیاری بە خود هەمان هۆشیاریە بە گشت. من دژی ئەو بیرۆکەیەم کە پیی وایە دواجار ئەکرێ تەواوی ئەزموونەکان لە یەك مەعریفەو لە یەك هزری رەهادا کۆبکەینەوە و هەمەکیتییەکی پێ ببەخشین. من هەولمداوە ریگایەکی دی بۆ گەیشتن بە مانای بێ کۆتایی بکەمەوە.

*ئەمە هەمان ئەو شتەیە کە تۆ پیی دەلییت (*non- sythetisable*) [واتە ئەو شتەی قبول ناکات لەگەڵ شتیکی تردا ئاویتە بیت و لەگەلیدا ببیت بە یەك و–].

–ریك وایە. ئەوەی من پیی دەلیم (*non- synthetisable*) پەیوەندیی ئەخلاقیی نیوان مرۆڤەکانە، رووبەرووبوونەوەی نیوان دوو کەس کە بە ئاویتەبوون کۆتایی نایەت. خودیتی راستەقینەی مرۆڤ ئاویتەبوون [بە مانای لەدەستدانی تاکیتی و–] قبوول ناکات. لایبنیتز ئەمە ناودەنیت قبوولنەکەری دیاریکردن، واتە تاکە کەسەکان دەتوانن کۆببنەوە بەبێ ئەوەی بە تەواوی بە یەکەوە گریدراوبن.

*بەم جۆرە تۆ لە فەلسەفەکانی هەمەکیتی جیادەبیتەوە.

–لەم کتیبەدا هەولدەدەم ئەوە پیشان بدەم کە ئەرکی ئاکاری بە زەرورەت پیویستی بە ئۆنتۆلۆجیا نییە. دەبێ لەوە بگەین کە ئاکار جۆریکە لە فەلسەفەی یەکەم، لەبەرئەوەی ماهیەتیکی پیشینەی هەیە. ئاکار لە سەروو بیرکردنەوەیەکی ئەبستراکتەوە نییە. لە ئاکاردا وەکو بەرپرسیاریتیەك؛ سەرچاوەی خودیتی مرۆڤە.

*ئیمە لە رووبەرووبوونەوەماندا لەگەڵ روخساریکی تردا، رووبەرووی "بێ کۆتایی" دەبینەوە. روخسار نیشانەیەکە بۆ بێکۆتایی. کاتێ بەرپرسیاری بەرامبەر بە روخساریك دەنوینین کە دەمانەوێ بیناسین؛ بێکۆتایی سەرهەلدەدات. بە واتایەکی دی، کاتێ کەسیك بەرامبەر بە کەسیکی دی دەلیت "من هەم" شایەتی بۆ بیکۆتایی دەدات. لە دروستی و راستگۆیی ئەم شایەتیەدایە کە ئەو بیکۆتاییەی لە دەرەوەدایە،

ئیمە لە رووبەرووبوونەوەماندا لەگەڵ روخساریکی تردا، رووبەرووی "بێ کۆتایی" دەبینەوە. روخسار نیشانەیەکە بۆ بێ کۆتایی.

دەگۆڕی بۆ بیکۆتاییەکی ناوەوەیی. بەڵام ئایا بەدەستهێنانی بیکۆتایی بۆ هەموو کەسیك وەکو یەکە؟ ئایا هەموو کەسیك دەتوانیت لە ڕەوتی کاری ئەخلاقیدا بیکۆتایی بەدەستبهێنیت؟

–ئاکار (ئەخلاق) حەقیقەتیکی هاوبەشی نیوان هەموو مرۆڤەکانە. هەموو کەسیك دەتوانێ ئەم ئەرکە ئاکاریە بە تەنها لەناو خودی خۆیدا بدۆزیتەوە. ئەم ئەرکە ئاکارییە قابیلی ئالوگۆڕە و بەر لە هەر شتیکیش بیرکردنەوەیە لە بوون لە پیناوی ئەوی دیکەدا لە ڕووداویکی شیاوی پاکژیدا.

*بەڵام ئایا ئەم بەرپرسیاریتیە لە ڕوخساری هەموو کەسیکدا دەخوینینەوە، تەنانەت لە ڕوخساری جەللادیکیشدا؟

–نابێ وشەی "ڕوخسار" بە مانایەکی سنووردار لیکبدەینەوە. دەبێ لەم ڕووەوە ورد بین. مەبەستی من لە "ڕوخسار" دەم و لووت و ڕەنگی چاو نییە. ڕوخسار دەلالەتی بێ تان و پۆیە. ڕوخسار مانایە لە دەرەوەی کەسیتی کەسیکدا. ڕوخسار ئیمکانیکە بۆ ئادەمیزاد تا لەو تەنیایی خۆیدا مانا بدۆزیتەوە. هەر ئەویکی دیکە تەنیا و تاقانەیە و لە تەنیاییەکەیدا جیاوازە لە جۆری ئادەمیزاد و فرەیی مرۆیی. هەرکاتیکیش من سەیری ئەو ڕوخسارەی ئەوی دیکە دەکەم، لیی بەرپرسیارم. ئەمەش هەمان ئەو سیستمی پاکژییەی بوون لە پیناوی ئەوی دیکەدایە. ئەگەر من جەخت لەسەر کەسیتی فلان یان فیسار کەس بکەم، هەموو شتیك لەم سیستەمەدا بەرەو باشی دەگۆڕیت.

پاکژی مومکینیك نییە، گەر بوونی خۆی بە هۆکار و ڕیشەی بوونی خۆی بزانیت. ئەمە ڕستەیەکی پاسکالم بیردینیتەوە کە هەمیشە دەیلیمەوە و کردوومە بەسەر لەوحەی کتیبی "بە جۆریکی تری بوون یان لەودیو ماهیەتەوە"، ئەویش ئەمەیە: "جیی من لەبەرهەتاودا ئەوەیە کە سەرەتاو وینەی زەوتکردنی هەموو گۆی زەوی بم".

*بۆ کۆتایی هینان بەم گفتوگۆیە، حەزدەکەم دوا پرسیارتان لی بکەم. کاتیکی زۆرمان نەبوو تا سەبارەت بە خولیای ئیوە بۆ لیکۆلینەوە لەسەر جولەکە قسەبکەین، بەڵام هەموان دەزانن کە ئیوە لەم بوارەدا، چ لە فەرەنسادا و چ لە دەرەوەی فەرەنساشدا، بە ناچاری بوونەتە سەرچاوەیەکی ناسراو..

–پیشتریش ئەمەیان بە من گوتوە. بەڵام بە ڕاستی بیلیم، من کاری خۆم لە تازەکردنەوەی شوناسی جولەکەدا نابینمەوە. هەر لەبەرئەوەی من لە تۆژینەوە

فەلسەفیەکانمدا ئایەتەکانی تلمود بە نموونە دەهێنمەوە، ئیتر مەرج نییە من بە تازەکەرەوەی جوولەکەیی لە قەڵەم بدەن.

*ویرای ئەمانەش، تۆ کتیبی پیرۆز زۆر دەخوینیتەوە.

-من هەمیشە وتوومە کە ئەوروپا واتە "کتیبی پیرۆز" و یۆنان. ناتوانین بەبێ "کتیبی پیرۆز" لە خۆرئاوا بگەین. "کتیبی پیرۆز" فیرمان دەکات کە دراوسیکانمان وەکو خۆمان خۆش بویت و تاکەکەس کاتێ دەستپیدەکات کە لەگەڵ ئەوی دیکەدا پەیوەندی پەیدا دەکات. لەبەر ئەمەیە کە "کتیبی پیرۆز" گرنگە.

*ئایا خۆتان بە بیرمەندیکی ئایینی دەزانن؟

-ئاین لە فەلسەفە ناچیت. پایەکانی ئاین لەسەر کۆمەلیك حەقیقەت بەندن کە یەکجار و بۆ هەتاهەتایە دابەزیون. فەلسەفە وا نییە، کەسی فەیلەسووف بەپیی ئایین کارناکات، بەلکو وەکو کەسیکی باوەردار کە کاری فەلسەفەش دەکات، کارە ئاینیەکانی ئەنجام دەدات. لەبەرئەمەشە کە من هەرگیز نەمویستوە نەریتی فەلسەفی خۆرئاوا لەگەڵ تەوراتدا بە یەك چاو تەماشا بکەم. هەرگیز لای من رووی نەداوە کە نەریتی هزری خۆرئاوایی مافی ژیانی نەبوبیت هەر لەبەرئەوەی کە من ئەزموونی تەوراتی بە ئەزموونی سەرەکیی مرۆڤایەتی دەزانم. ئەم دوو نەریتە، کە لە من و لە بیری مندا لەگەل یەکتردا گونجاون، بیگومان دەگەریتەوە بۆ ئەزموونەکانم لە ژیاندا.

*حوزەیرانی ١٩٩٤*

**سەرچاوە:**

نقد عقل مدرن- رامین جهانبگلو- چاپ اول ١٣٧٦- تهران

# تێگەیشتنی ئاینیانەی ئەریك فرۆم

نووسینی: جان دیاتریک

وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا سیوەیلی



لەبەرئەوەی لەناو سۆیۆلۆژیاو لەناو ئاكامەكانی سۆلۆژیاشدا، دیاردەی ئاین زۆر جار و بە شێوەیەكی بەرچاو یان وەك پەیوەندی مرۆڤ بە خواوە یان پەیوەندی بە "پیرۆز"ەوە پێناسە كراوە، كەچی ئەریك فرۆم پێناسەیەكی "وظیفي" بۆ ئاین دەخاتەڕوو. بنەڕەتەكانی ئەم پێناسەیە بریتیە لە تیۆرە ئەنترۆپۆلۆژیەكەی دەربارەی پێداوستییەكان *needs*: لە ڕەوتی مێژووی خۆیدا، مرۆڤ گەشەی داوە بە خود-هوشیارییەك *Self-Consciousness* كە تیایدا خۆی وەك [تاك]ێك دەبینێتەوە، وەك بەشێك لە سروشت، لە هەمان كاتدا سەربەخۆشە لێی، واتە جیایە لە سروشت. بەدەر لەم جیاكارییەی ئەنجامەكانی پاشكۆیەتی یان دابڕان، و لە نێوان چەندانی تردا، ناخ *Psych*ی مرۆڤ پێویستی بە چوارچێوەیەكی هەواداری ئوبژێكتی خۆ تەرخان كردن هەیە. ئەم ئۆبژێكتی خۆ تەرخانكردنەش پێویستی بەوە نیە كە شت *thing* بێت بەڵكو زیاتر بریتیە لەوەی مرۆڤ بەرەو كوێوە كۆششەكانی یان ململانێكانی ناخی خۆی لەناو چوارچێوەی پەیوەندییەكانیدا ئاڕاستە دەكات. بەم شێوەیە، ئاین لەم پێویستییەوە گەشە دەكات و وەڵامی ئەم پێویستیە دەداتەوە، لەبەر ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ مەیلی سروشتی مرۆڤ: ئاین سەرەكیترین سیستەمی بیركردنەوەی كۆمەڵگایەكە، كە چوارچێوەیەكی حەزو ئۆبژێكتێكی تەقەلا بە تاك دەبەخشێت لەناو ئەم كۆمەڵگایەدا. ئەم پێناسەیە بە شێوەیەكی بەربڵاو لەبەرچاو گیراوە، لەبەرئەوە فرۆم دەتوانێت لەو دیاردانە تێبگات كە لە زمانی ژیانی

ڕۆژانەدا کەسێك دەتوانێت بە توندییەکەوە پێیان بڵێت ئاینەکان –بۆ نمونە وەك فاشیزم یان ستالینیزم– ڕێك لەبەر ئەو ڕاستییەی کە ئەم سیستمانە دەچنە ناو هەگبەی پێداویستی مرۆڤەوە، کە ئاینی تەقلیدی لە کۆمەڵگاکانی تردا کەیفیان بەمە دێت.

بە شێوەیەکی زۆر لێکچوانە، فرۆم نایەوێت باوەڕ *Faith* بە یەکەمین شت بە پێی ناوەڕۆکەکەی لەبەرچاو بگرێت، بەڵکو وەك ئاراستەیەکی سەرەکی مرۆڤ سەیری دەکات، ئەویش بە پێی هەلومەرجە دەرونشیکارییەکان: وەك کاراکتەر جیاکەرەوەیەکی بنەڕەتی بەرەو خودی کەسێك، کەسانی تر و جیهان. کەیف هاتنی ئەو بە باوەڕ و هەروەها ئاینیش، کەیف پێهاتنێکی سایکۆلۆژییە. پرسیارەکە ئەوەیە: چۆن باوەڕ کاریگەرییەکی دەبێت بۆ سەر مرۆڤ و تەندروستییە مێشکییەکەی، ئایا باوەڕ یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ گەشەپێدانی کەسێتی خۆی، یان پەرش و بڵاوی دەکات؟ لە پەیوەندیدا بەم پرسیارەوە، فرۆم لە ڕوحیەتی ڕۆشنگەرییەوە لە ڕەخنەیەکی ئاینییەوە، ستاندارێکی ئاکاری بۆ ئایین گەڵاڵە دەکات کە لە مەرجە ئایدیالەکانی نێوان باوەڕێکی دەسەڵاتگەرا، کە لە ملکەچی کردن بۆ هێزێکی بێگانەدا هەیە، لە ئاکامدا هێزە مرۆڤییەکانی باوەڕی مرۆڤی، کە یارمەتیدەرە لە گەشەکردنی ئەقڵ و خۆشەویستیدا، پەرشوبڵاو دەکات.

پێوەدانگە ئاکارییەکان، لێرەدا وەك ئەوەی کە لە لایەن خوا *God* وە چەسپێنراوە یان وەك ئەوەی لە لایەن خواوە دامەزرێنراوە، وەك بیانوویەك بۆ بوون، وەرنەگیراوەو لەبەرچاو نەگیراوە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کە بە هۆی لێکۆڵینەوەیەکی ئەنترۆپۆلۆژییەوە لە دەردی سروشتی مرۆڤ کۆبکرێنەوە. بەم جۆرە فرۆم خۆی دەخاتە ناو ترادیسیۆنی ئایدیایەکی عەلمانی یاسای سروشتییەوە کە لە سەر ڕێژە *ratio* سەرچاوەی گرتوە.

فرۆم بیردەکاتەوە بۆ ئەوەی چەند ڕەگەزێکی باوەڕی دەسەڵاتگەرایی و مرۆڤی لە سەرتاپای هەموو ئاینەکاندا بدۆزێتەوە. فرۆم دان دەنێت بە چەند فۆرمێکی باوەڕی مرۆڤدا– کە خودی خۆی کاری تێکرابوو لە لایەن پێغەمبەرەکانی (پەیمانی کۆن)ەوە *The Old Testament* کە ئازایەتی و ملکەچ نەکردن و ڕەخنەگرتنیان تیادا بوە بۆ سیستمی بتپەرستی، کە تیایدا مرۆڤ شتی دەستکردی خۆی دەپەرست، ئەمەش وەك ناموبوونێکی مرۆڤە لە هێزەکانی خۆی. سەرەڕای ئەمە، لە سیۆلۆژیای نێگەتیڤدا لەژێر ڕاستی ناوەندی یەکێتی خودا *Unity of God* دا هەموو دەستەواژە پۆزەتیڤەکانی لەمەڕ خوا نەفی دەکرێت و ڕادەیەگەیەنرێت، کە ئێمە تەنها دەتوانین دەربارەی ئەوەی کە (خوا چی نیە) بزانین. هەموو ئەو دەستەواژە پۆزەتیڤانەی کە دەربارەی خوان بە شێوەیەکی هەمەگیر وەك کۆمەڵە دەستەواژەیەك دەربارەی کاریگەری خوا لە جیهاندا لە لایەن خەڵکەوە وەرگیراوە. بەم شێوەیە ئەوان لە هەمان کاتدا نمونەیەکن بۆ کرداری مرۆڤ و دووبارە بانگێشتی خۆی دەکاتەوە. ئەمە پاش ئەوەی کە لە خۆی نامۆ بوو، کاتێکیش کە لە دەستەواژە ئەنترۆپۆمۆرفەس *avthropomrphous* ەکاندا دەربارەی خوا تواناو گونجانکارییەکانی

خۆی دەگویزیتەوە بۆ خوا. تەصەوفیش دەتوانیت ئەمە بە دەست بهینیت، چونکە موتەسەوف هەول دەدات کە لە هەموو پاشکۆیەتیەك بەرەو دنیاو خودی خۆی جیاببیتەوە، بە مەبەستی یەکبون لەگەڵ خوادا، یان وەك لە بودیزمدا- توانەوەی هەموو بوون بۆ (هیچ شتیك ***nothingnees***).

بەم شیوەیە فرۆم بە قوولی کارتیکراو بوە لە لایەن چەند رەگەزیکی تەصەوفی رۆژهەلاتیەوە بە تایبەتی ماستەر ئیکهارت و چەند رەگەزیکی (زەن بودیزم) و خودی خۆی هەموو رۆژیك تیرامانی قوولی ئەنجام دەدا. تیۆلۆژیای نیگەتیڤ و تەصەوف، لە ئاکامدا دەتوانن ببنە هۆی نا- باوەرگەرایی ***thesim -non***، کە دەستبەرداری ئایدیای وینای (شەخصی)یە دەربارەی خوا و زۆرجار دەبیتە دەربری دەرکەوتەیەکی ترانزیندنتالی (متعالی)، وەك سروشتی خۆشەویستی (لیرەدا هەرچەندیك فرۆم لەبەرچاو بگیریت، دەبیت پانسیزمی سپینۆزاو مەفهومی ئاکاری گۆهین دەربارەی خودا باس بکریت. هەروەها فرۆم ئاماژە دەدات بەو گۆرانکارییە جیاوازانەی بودیزم، تاویزم، و کۆنفوشیوزم).

کاتیك کە فرۆم دەستەواژەی (خوا) لە تاقیکردنەوەی سیزم (بىرواگەريدا) بەکاردەهینیت، ئەوا ئەو بە شیوەیەکی هەمەکی و وەك هیمایەك بۆ توانست و گونجانکاریەکانی خودی مرۆڤ خۆی لیی تیدەگات. لە مەیدانی کەلتوری رۆژئاوایی ئیمەدا دەستەواژەکانی "خوا" "ئاین" و "ئاینی" لە لایەن وینا شەخسیەکانی لەمەر خواوە قۆرخ کراوە، فرۆم لە جیاتی "ئاینی" بە شیوەیەکی جوزئی قسە لە ئەزموون دەکات لە پیناو باشتر تیگەیشتن لە دەرهاویشتەکانی ئەزموون کە لەسەر دەربرینی ئاینی و ئایدیای ئاینی سەرچاوەی گرتوە. لیرەدا فرۆم دەتوانیت ئاینگەرایی مرۆڤی و ئەزموون یەکسان بکات. ئەزموونی پیشینەش دواتر لەگەڵ ئەزموونی ژیان وەك گرفتیك تیکەوە دەگلین کە پرسی مانای ژیان بەرز دەکاتەوە ئەویش لە شیوەی هەرەمیك بۆ بەهاکان کە بەرزترین بەهاش بریتیە لە بەرەوپیش چوونی هیزەکانی خودی مرۆڤ کە ئەمەش ریی‌و شوینیکە کە وەك کۆتایی نەك وەك هۆکار کە لە مرۆڤ تیدەگات. ئەمە کرانەوەیەکە بەرەو جیهان و زالبوون بەسەر نەرجسیەتی مرۆڤیکدا. جەنگین لە دژی بتپەرستی وەك نامۆبوونی مرۆڤ لە خودی خۆی هەموو کات مەسەلەیەکی یەکلایی کەرەوە بوە بەلای فرۆمەوە، ئەم مەسەلەیە بابەتیکە بۆ زۆر لە مەسیحیەکان و بە تایبەتیش کەسیکی وەك ئەلفانسۆ ئایور.؟ هەر ئەمەش بوە کە بۆتە بنەرەتیکی باو بۆ هیومانیزمی مەسیحی و رادیکالی. جیاوازی گرنگ لەو پرسیارەدا خۆی حەشار دەدات کە ئایا ئاکاری مرۆڤانەی لەو شیوەیە هۆکاریك یان بەلگەیەك دەدۆزیتەوە دەربارەی بوونی ئەو لە خوا یان لە مرۆڤدا.

# دەسەڵات لە قوڵاییدا تێکناشکێت

## هەتا دەرکەوتنی هاووڵاتیان نەکەوێتە پێش دەرکەوتنی دەوڵەتەوە..

ناوی کتێب: مێژوویەک بۆ دەسەڵات
ناوی نوسەر: جیرار ماندل
خوێندنەوەی: جۆرج تەرابیشی
وەرگێڕانی: فەرەیدون پێنجوێنی

(جیرار ماندل) یەکێکە لەو تاکوتەرا بیرمەندە فەرەنسیە هاوچەرخانەی کە خاوەنی تێڕوانینێکی گەورەیە. ئەو، سێ دانە میتۆد لە یەکتر هەڵدەپێکێت: دەرونشیکاری، ئەنترۆپۆلۆجیا، سۆسیۆلۆجیای سیاسی؛ جگە لە نەزعەیەکی ئەقڵانی ڕیشەیی دەرککردوو بەوەی نەستی مرۆیی (اللاشعور البشري) کۆگایەکی گەورەیە بۆ ناماقووڵ (اللامعقول) کە ئەمە ئەو نەزعەیە سەرکەوتووتر دەکات بەلای دەسەڵاتی ئەقڵدا. (جیرار ماندل) هەر لە کتێبی (یاخی بوون دژی باوك)ەوە کە هاوکات لەگەڵ شۆڕشی ساڵی (١٩٦٨)ی قوتابیانی ئەوروپادا بڵاوبۆوەو بۆ زیاتر لە بیست زمان وەرگێڕرا (بۆ زمانی عەرەبی نەبێ)، خۆی لە بواری گۆڕەپانی (فیکری فەرەنسی) و بگرە (فیکری جیهانی)یشدا سەپاند.

کتێبە تازەکەی کە تیایدا پێشنیازی خوێندنەوەیەکی (جیاوان) دەکات بۆ مێژووی دەسەڵات، بە شێوەیەك لە شێوەکان هەر درێژەی تێزە مەرکەزیەکەیەتی کە لە کتێبی (یاخی بوون دژی باوك)دا خستوویەتیەڕوو، بەڵام لەگەڵ ئەم جیاوازییەدا: بابەتی یاخی بوون لەمیاندا خودی باوك نیە، بەڵکو وەزیفەو پێویستیە سەرەکیەکەیەتی: دەسەڵات. دەسەڵاتیش، تەنانەت لەو فەرهەنگانەشدا (فەرهەنگ بە مانای: ڕۆشنبیری/ و. کوردی) کە باوکیان کوشتوە؛ هەروەها لەو ئاینانەشدا کە باوکەکەی سەرزەوییان گۆڕیوە بە باوکەکەی ئاسمان؛ بە زەرورەت باوکسالارانەیە. (جیرار ماندل) لەم ڕووداوی یاخی بوون لە دەسەڵاتی باوکەوە، دووپاتی دەکاتەوە کە مرۆڤایەتی پێنج نوێگەری (حداثة)ی بەخۆوە دیوە؛ نەك یەك نوێگەری.

مادەم بشێت نوێگەری وەها پێناسە بکرێت کە بریتیە لە (دابڕان لە کەلتوور)؛ هەروەها مادەم (کەلتوور) لە ناوەڕۆکە ئایدۆلۆجی و ئاینی و

سیاسی و دەروونیەکەیدا وەك یەك، هەر کەلتووری باوك بیت؛ (ماندل) ناچیت (بەو جۆرەی کە تا ئیستا باوبووە) ئەم چرکەساتی دابرانە ببەستیتەوە بە (چاخی رینیسانس)ەوە، واتە بە چاخی داهینانی چاپخانەو دۆزینەوەی ئەمریکاو شۆرشی کۆپەرنیکی و ریفۆرمی ئاینییەوە؛ بەلکو دوو هەزار سال دەیگیریتەوە بۆ دواوەو زەمەنی نویگەریی یەکەم دەباتەوە سەر ئەسینای سەدەی پینجەمی پیش زاین.

بۆچی؟ چونکە دەستوری ئەسینا، بەو جۆرەی کە *[ئەقلستانس]ی* فەرمانرەوای سالی ٥٠٦ی پیش زاین دایرشت، بەردی بناغەی دیموکراتیەتی لە میژووی مرۆڤایەتیدا دانا.

ئەقلستانس دژی نەریتی خیزانگەرایی سیاسی (العائلیة السیاسیة) و دژی خیزانە گەورە عەشایەریەکان، مافی هەلبژاردنی بەخشیە تاکەکەس، بە چاوپۆشی لە جی و ریی کۆمەلایەتی و پیشەیی.. هەروەها بە چاوپۆشی لە نفوزی خیزانەکەی. بەو جۆرە ئەسینا لە جیاتی پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی و گەلەکۆییەك (اجماعیة) دامەزراو لەسەر بنەمای پەیوەندی خزمایەتی و ئینتیمای خیزانی و خیلەکی؛ پاش ئەوەی دابەش کرا بەسەر سەد بازنەی هەلبژاردندا، بوو بە *[کۆمەلگەیەك]* کە لە تاکە کەس پیك هاتبوو و جگە لە پەیوەندیی *[هاوولاتی بوون]* واتە پەیوەندی ئینتیما بۆ شار، هیچ پەیوەندییەکی دیکە ئەو تاکە کەسانەی نەبەستبوو بە یەکەوە، بەلام ئەم چرکەساتی نویگەریی یەکەمە لە چارەی نەنوسرابوو زۆر تەمەن بکات.

بە پیچەوانەی ئەوەوە کە باوو بروا پیێ کراوە، دیموکراسیەتی ئەسینایی، سەدەی زیرینی لە سەردەمی (بیرکلیس)دا نەگوزەراندوە کە لە نیوان سالانی ٤٥٤ و ٤٣٠ی پیش زایندا فەرمانرەوایی کردوەو پازدە جار لەسەر یەك خۆی هەلبژاردۆتەوە.. بەلکو لە سەروەختی ئەودا ئەسینا بەرەو *[ئیمپریالیزم]* رۆیشت و پەیوەندییەکی کۆمەلی و گەلەکۆیی نویێ کە بریتی بوو لە ئەسیناچیتیەکی دامەزراو لەسەر بنەمای پەیوەندیی دوژمنایەتی و شەر لەگەل باقی شارەکانی دیکەی یۆنان، جیی نەزعە تاکەکەسیەکەی پیشووی گرتەوە.

چرکەساتی نویگەریی سیاسیی دوەم، خۆی لە کۆماری رۆمانیادا دەبینیتەوە.. دەسکەوتی گەورەی ئەم کۆمارە وەکو *[هانا ئارنت]* روونی کردۆتەوە، ئەوە بوە کە دەسەلاتیکی بە عەلمانیکراوی دامەزراندوە.. رۆمانیەکان تەنانەت لە مامەلەیاندا لەتەك خواوەندەکانیشیاندا کە دایانگرتبوونە سەر زەوی و لە خزمەتی دەولەتدا تەوزیفیان کردبوون، دنیایی بوون.. جگە لەوە لە پیشبرکیدا بوون بەرەو دابەشکردنی دەسەلات و دامالینی مۆرکی رەها لیی؛ ئەمەش لە ریی داهینانی سیستمی ئەنجومەنی پیران و قونسولەکان و پرەنسیپی یەکسانیی هاوولاتیان لە بەردەم یاساداو دانانی *[بەهای مەدەنی]* لەسەری سەرەوەی بەهاکانەوە.

بەلام ئەم چرکەساتی نویگەریی سیاسی دووەمەش لە چارەی نەنووسرابوو زۆر تەمەن بکات.. شەرەکانی فەتح و زۆربوونی کۆلۆنیالەکان و زۆربوونی لە رادەبەدەری ژمارەی کۆیلەکان و شەرە

ئەهلیەکان و ململانێی نێوان سەرکردە سەربازیەکان لەسەر دەسەڵات، جگە لە فشاری خێڵە بەربەرەکان بۆ سەر سنوورەکان؛ هەموو ئەوانە لە ساڵی ٢٩ی پێش زایندا، بوونە هۆی رووخانی کۆمارەکەو گۆرانی رۆما بۆ ئیمپراتۆریەتێك کە کۆمەڵێك ئیمپراتۆری لە یەك کاتدا بەخوا کراو و میراتگرو خوێنخۆری وەکو نیرۆن و کالیگۆلا فەرمانڕەواییان دەکرد.

چرکەساتی نوێگەریی سێیەم، نە پەیوەندیی بە گەشەی سیاسییەوە هەیەو نە بە دەرکەوتنی مێژوویی دەوڵەتێکی نوێوەو، نە تەنانەت بە رەوتێکی ئایدیۆلۆجی یاخود فکریی تازەشەوە؛ بەڵکو لە دەوری تاقە یەك کەس کە *[قەدیس ئۆغەستینۆس]*ەو، یەك دانە کتێب لە کتێبەکانی کە *[دانپیانانەکان]*ە چەق دەبەستێت.. ئەم بەناوبانگترین پەتریرکەی کەنیسەی لاتینی کە لە بنەچەدا خەلکی سەرووی ئەفریقیایە، لە ریی دانپیانانە تایبەتیەکانی خۆیەوە چەمکیکی نویی هینایە ناو فیکری مرۆییەوە کە چەمکی *[من/ الانا]*یە.. راستە ئۆغەستینۆس لەو سەردەمەدا ژیاوە کە مەسیحیەت سەرکەوتنی بەدەست هیناوەو بۆتە ئاینی دەولەت (٣٤٥-٤٣٠)، بەلام خویندنەوە تایبەتیەکەی بۆ کتیبی پیرۆز، بە پلەی یەکەم خویندنەوەیەکی ناوەکی بوە (قراءة داخلیة) و لەسەر بنەمای *[پشکنینی ویژدان]* دامەزراوە. لەگەڵ دەرکەوتنی ئۆغەستینۆسدا، ئەو زانستی دەروونشیکارییەی کە لە ئەفلاتون و ئەرستۆوە بەجیمابوو، لە زانستیکی بابەتی و ناشەخسییەوە گۆراو بوو بە زانستیکی زاتی و هەڵهینجراو (استنباطی). تاکە کەس بوو بە سەروەری مەملەکەتە زاتیەکەی خۆی و، پیش دەسەلاتی دەولەت و دەسەلاتی کەنیسە، ویژدانی تایبەتی خۆی بوو بە دادگای.. هەر لە میانەی درەوشانەوەی چەمکی *[من]* و هۆشیاریی زاتەوە، ئۆغەستینوس هەزار ساڵ کەوتە بەرەوەی نویگەریی ئەوروپییەوە.. بەلام ئەم کەوتنە بەرەوەیە، ریك بە هۆی زوو کەوتنە بەرەوەی خۆیەوە، بێ ئایندە مایەوەو دەبوو ئاخری چاوەروانی چرکەساتی نویگەریی چوارەم بکریت، لە چاخی رینیسانسی ئەوروپیدا، بۆ ئەوەی رابوون بەرپا بکاتەوە.

ئەوەی دەسکردی تاکەکەسی سەدەی پینجەم بوو لە سەدەی ٥ی پ. ز دا لە دوا ساتەکانی نیوان سەدەی پازدەو شازدەدا بوو بە دیاردەیەکی گشتی، رینیسانسی ئەوروپی لەسەر بنەمای تاکگەرایی تاکەکەس سەری هەلدا. بگرە کۆمەلناسی ئەلمانی *[جۆرج سیمل]* دوودل نیە لەوەی سەرجەمی رینیسانسەکە بگیریتەوە بۆ *[قەیرانی پۆشاك]* لە فلۆرەنسای دوادوای سەدەی پازدەهەمدا.. لەو رۆژگارانەدا تاکگەرایی بە رادەیەك پیی لی راکیشابوو کە لەگەڵ خۆیدا یەکبەرگی (زی موحد)ە بە میراتی جیماوەکەی سەدەکانی ناوەراستی تەفروتونا کرد.. ئیدی پیاوانیش نەك هەر تەنها ژنان، ئازادبوون چ جلوبەرگیکیان بویت بیپۆشن.. بەلام هەر تەنیا پۆشاك روالەتی گوزارشتکردن نەبوو لە دابران لە نەریت؛ ئەو چاپخانەیەش کە سەدەیەك لەوەوبەر *[گۆتەنبیرگ]* دۆزیبوویەوە، ئالوگۆریکی ریشەیی بەسەر کردەی خویندنەوەدا هینابوو، نەخوازەلا کتیبی پیرۆز.. لە ریی بە گشتیکردنی

(تعمیم) کتێبەوە، تاکەکەس ئازاد کرا لەوەی کە بە خۆی دەقە پیرۆزەکان بخوێنێتەوەو راڤەیان بکات، بەبێ پشتبەستن بە کاهین و دەسەڵاتی کەنیسەو سەرچاوە کەلتووریەکان.. ئەم رزگارکردنەی کردەی خوێندنەوە، پێشەکییەکی گەورەی ئەو ریفۆرمە ئاینیە بوو کە *[لوسەر]* سەرکردایەتی کرد و چاوی ئامانجی لەسەر دەسەڵاتی پاپا بوو لەو روەوە کە دەسەڵاتێکی سەروویین (فوقی) و ناشەخسیە.. دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکاش کە بواری رەخساند بۆ سەدان هەزار و پاشان ملیۆنەها کۆچبەری ئەوروپایی تاکو پەتی رابردوویان بپچرێنن و بە دەستی خۆیان جیهانێك لەو جیهانە نوێیەدا بۆ خۆیان دابمەزرێنن و بە پێی یاساگەلێك رێکی بخەن کە ئەویش هەر داهێنراوی خۆیان بوو، هاوزای ئەو ئالوگۆرەی بواری ئەقل بوو.. ئەمیستا هیچ جێیەك نیە، وەکو ئەو وڵاتە یەکگرتوانەی ئەمریکا کە هاووڵاتیان بەر لە پەیدابوونی دەولەت، تێیدا پەیدابوون؛ دەسەڵات بە مانا سەلەفیەکەی شکستی تێدا خواردبێت.

بە بەراورد لەگەڵ نوێگەریی سەردەمی رینیسانسداو پاش ئەوە سەردەمی رۆشنگەری کە سروشتێکی ئەقڵانیی هەبوو و تا رادەیەکی زۆریش ئەقڵانی بوو، نوێگەریی پێنجەم، نوێگەریی سەردەمی رابردوو، سروشتێکی ئابوریانەی هەیەو تا رادەیەك (رادەیەکی کەمیش نە) نائەقڵانیە.

چرکەساتی نوێگەریی پێنجەم، لەسەر ئاستی ئەوروپی–ئەمریکی، هاوزای سەرکەوتنی سیستمی سەرمایەداریی ئابووری بوو؛ واتە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی پێکرد.. لەسەر ئاستی هەموو جیهانیش، لە ناوەراستی سەدەی بیستەمەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە گلۆبالیزەیشن. بەهەرحال ئەم نوێگەرییەی کە لە سایەیدا دەژین، بوو بە هۆی هەلوەشاندنەوەو لەتوپەت بوونی سەرجەم سیستمی بەهاکان و پرەنسیپی دەسەڵاتی خستە ناو دۆخی قەیرانیکی کراوەوە.. هەروەها بوە هۆی *[بەکاڵاکردن]ی* پەیوەندیە مرۆییەکان و جێ چۆلکردن بە سەرجەم عیبادەتەکانی دیکە بۆ (پولپەرستی). ئەو جۆرە ئەقڵانیەتەی کە ئەم نوێگەریە پەرەی پێ دا، رێك ئەقڵانیەتی ئامرازیە (العقلانیة الاداتیة).

نوێگەریی ئابووری سەرمایەداری، رێچکەیەکی بەرهەمهێنەرانەی پەتی گرتە بەرو لە یەك کاتدا پێکەوە ئالەتی کرد بە (خوا) و (ئەقل)ی جیهانی هاوچەرخ. ئەم شێوازە تاق و تەنیایەی ئەقڵانیەتی ئامرازی، پشتی کردە ئەو تاکەکەسانەش کە لە سیستمە بەهاییەکانیان داماڵراون و لە رووبەرووبوونەوەی ناماقولدا (مواجهه اللامعقول) دەستەوسان و بێ بەرگری ماونەتەوە.

ئەمە مانای ئەوەیە نوێگەری هاوچەرخ گەشەیەکی عادەت بەزینی لەسەر ئاستی سەرجەم تەکنیکەکانی هەڵاتن و رووبەرووبوونەوەی *[خود]* کە ئیتر ئەو خودە دوای هەلوەشاندنەوەی سەرچاوەکانی و شکست هێنانی سیستمە بەهاییە بەرگریەکەی، توانای ئەوەی نەماوە شان بکات بە بەرخۆیدا.. قەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا رووی نەداوە، وەکو ئەمرۆ لەسەر ئاستی جەماوەری، ئەوەندە مادەی سرکەرو مادەی هێمنکەرەوەو مەی (ئەمە جگە لە جگەرە) بەکاربهێنری. تەنها لە سالی

دوو هەزارداو لە کۆمەڵگە پیشەسازیەکاندا، بری بەکارهینراوی مادەی سرکەری (بروزاك) کە تەرخانە بۆ نەهیشتنی خەمۆکی بە [دوو بلیۆن و نیو بلیۆن دۆلار] خەملینراوە.

هەروەها پیویست بون بە بەرپەرچدانەوەی بۆشایی دەروونیش ئەو شتەیە کە ئەو نەخۆشیە گەورەیەی دیکەی ناو نەخۆشیەکانی نویگەری شی دەکاتەوە: قەڵەوی. نیوەی ئەمریکاییە باکوریەکان گرفتاری (زڵی و کیش قورسی)ن؛ چارەکیکیشیان واتە نزیکەی (شەست و هەشت ملیۆن کەس) گرفتاری قەڵەوین.

ئەگەر سەدەی بیستەم ئەو سەدەیە بیت کە لە بەتاککردنی تاکەکەسدا (تفرید الفرد) تا ئەوپەری رۆیشتوە، سەیر نیە ئەو سەدەیەش بیت کە ئایدۆلۆجیا کۆمەلی و گەلەکۆییەکانی وەکو فاشیزم و نازیزم و کۆمۆنیزمی لی کەوتبیتەوە.. ئەگەریش نویگەریی رۆژئاوا ئەو نویگەریە بیت کە "نەخۆشیەکانی منالی" دەرهاویشتووە (منالی قەولی ماندل کە لە گوزارشتە لینینیە بەناوبانگەکەی خواستوە)، ئەوا نویگەریی ئیسلامیش بەشبەحالی خۆی نەخۆشی [منالیی] خۆی لی کەوتۆتەوە کە خۆی لە ئوسولیەتدا دەردەخات.

بەهەرحال داروخانی سەرچاوەو سیستمی بەهاکان، لە هەموو جییەك دروستبوونی شیوەگەلیکی تازەی (منالیی) لە پاشکۆیەتی (لە پیناوی قەرەبووکردنەوەی بەرگریی زاتیدا) هینایە ئارا کە جیی پاشکۆیەتیە تەقلیدیەکەی دەسەلاتی گرتەوە.

دواجار: ئایا [ماندل] پیشنیازی چ دەرەتانیك دەکات بۆ دەرچوون لەم قەیرانەی دەسەلات؟ هەروەها پیشنیازی چ چارەسەریك دەکات بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشی [منالی]ە؟

لیرەدا خوینەر ناتوانیت ئەو هەستە لە خۆی دامالیت کە (ماندل) لە کۆتایی کتیبەکەیدا جلەوی کردوە بەرەو ریگەیەکی داخراو.. ئەو هەموو رەخنەکانی لە شیوە تەقلیدیەکانی دەسەلات، لە دەوری ئەوە خول دەخوات کە دەسەلاتیکی باوکسالارە.. کەچی خۆیشی لە هەموو رەخنەکانیدا بۆ نویگەریی پینجەم، پی لەسەر ئەوە دادەگریت کە نویگەرییەکی بونیادگەرایە (حداثة بنوية).

ئەگەرچی [ماندل] زۆر سەرکەوتوانە قەرەی چوار نویگەریەکەی یەکەم کەوتوە لەو روەوە کە گوزارشتگەلیکی ئەقلانی بوون لە [یاخی بوون لە باوك]، دەیەویت لە ریی رەخنەکردنی نویگەریی پینجەمەوە، وەك یاخی بوویەك لە نویگەریی فەرزەندەکان (حداثة الابناء) خۆی داکوتی. بۆ بەرزکردنەوەی ئەم ناکۆکیە دەتوانین بلیین: ئەوەی ماندل خەونی پیوە دەبینی، نویگەرییەکی لە یەك کاتدا باوکسالاری و بونیادگەرایشە.

لیرەدا پرسیاریك قوت دەبیتەوە:

ئایا ئەم بە ئەقلانیکردنەی نویگەریی و ژیار (حضارة) و بە گوزارشتی باوکەکان و فەرزەندەکان، نامانگەرینیتەوە بۆ ئەو [نەزعە خیزانگەرایییە سیاسیە]ی کە ماندل خۆی بە [نەخۆشی پیریتی دەسەلات]ی داوەتە قەلەم؟.

لە: جریدة الحیاة/ ٣١ی ئازاری ٢٠٠٢ ەوە.

# کەس بێگوناهـ نیە

## -جاك دێریدا سەبارەت بە ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر ئەدوێت-

و: ئازاد بەرزنجی



ڕۆژی ٢١ی سێپتەمبەری پار، لە ڕێوڕەسمێکدا لە کلێسای باولی شاری فرانکفۆرت، خەڵاتی تیۆدۆر ئادۆرنۆ بۆ ساڵی ٢٠٠١ درا بە فەیلەسووفی فەرەنسایی جاك دێریداو، بەمجۆرە ڕێز لە کارو هەوڵەکانی یەکێك لە دیارترین فەیلەسووفە هاوچەرخەکان نرا کە لە پێناوی نوێکردنەوەی فەلسەفەدا تەقەللا دەکەن.

دێریدا دامەزرێنەری میتۆدی بونیادشکێنی (*deconstruction*)ە. خەڵاتی ئادۆرنۆ لە ساڵی (١٩٧٧)ەوە هەرسێ ساڵ جارێك و بۆ ڕێزنان لە کاری کەسانێك کە لە بوارەکانی فەلسەفەو مۆسیقاو شانۆو فیلمدا چالاکن، ئەبەخشرێ. لەو کەسێتییە ناسراوانەی کە تا ئێستا ئەم خەڵاتەیان پێ بەخشراوە بریتین لە: فەیلەسووف و کۆمەڵناسی ئەڵمانی یۆرگن هابرماس (١٩٨٠)، ڕابەری ئۆرکستراو ئاوازدانەر میشێل گیلن (١٩٨٦) و هەروەها دەرهێنەری سینەمایی جان لۆك گۆدار (لە ساڵی ١٩٨٥دا) دوای وەرگرتنی خەڵاتەکە، ڕۆژنامەی (زۆد دویچە تسایتۆنگ)ی ئەڵمانی لە ٢٤ی سێپتەمبەردا ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵ جاك دێریدادا، سەبارەت بە ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر سازدا.

*سەبارەت بە ڕووداوەکانی ١١ی سێپتەمبەر چۆن بیردەکەنەوە؟

–ئەم گورزە تیرۆریستیانەیە سەرلەنوێ و بە شێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی کێشەی بە جیهانیبوونمان دەکاتەوە، بەڵام ئەمجارەیان لە ڕێی جەنگەوە. ئەم چ جەنگێکە کە ناتوانرێ لەگەڵ دەوڵەتێکی میللی و ڕکابەردا کە قابیلی ناسین بێت؛ ڕابگەیەنرێ؟ جەنگێك کە هاوکاتە لەگەڵ بزاڤە زیاد

لە پێویستە سەرمایەدارەکانەوە. ئەوە دەزانین کە بەر لە وەشاندنی ئەم گورزانە، لە ئالوویرەکانی بازاڕی بۆرسدا قازانجێکی زۆر کۆکرایەوە. هەموو ئەمانە ناچارمان دەکەن کە سەرلەنوێ چاو بە جیهانیبوون و سەرمایەداری و جەنگدا بخشێنینەوە.

*چۆن ئەم ڕووداوەت زانی و ئەم کارەساتە لای تۆ چی دەگەیەنێت؟

-وەکو هەموو خەڵك منیش شڵەژام. جگە لەوە من خۆم پەیوەندییەکی تایبەتیشم لەگەڵ نیۆیۆریکدا هەیە. من بە زۆری لەو شارەدا بووم و خۆشمویستوە. من لە ناخی دڵەوە هەست بە هاوخەمی دەکەم لەگەڵ قوربانیەکاندا، بەڵام ئەم هەستەش نابێ وا لە مرۆڤ بکات کە لە ئاست بەرپرسەکانی ئەم کارەساتەدا کوێر بێت.

*بە ڕای ئێوە کی لەم کارەساتە بەرپرسە؟

-بێگومان بە پلەی یەکەم ئەو کەسانەی ئەو کارەیان ئەنجامداوەو ئەوانەش کە دەیانپارێزن. بەڵام سیاسەتێکی دیاریکراویش بەرپرسە کە ماوەیەکە لە لایەن ئەمریکاو ئەوروپاوە بەرامبەر بەم بەشەی جیهان پەیڕەوی دەکرێ.

*لە هەڵوێستێکی لەم جۆرەدا فەیلەسووف چ ئەرك و بەرپرسارێتییەکی لە ئەستۆدایە؟

-بەرپرسیارێتی گشتی هاوولاتییەکی سیاسی، بەڵام ئەرکێکی تریشی هەیە کە ئەویش لێکۆڵینەوە لەو زاراوانەیە کە پێشتر ئاماژەم بۆ کردن. ئەو بۆی نیە لە پرسیارە ڕەخنەییەکانی خۆی کەم بکاتەوە. تەنانەت گەر خۆی لە پەنا قوربانیە بێگوناهەکانیشدا ببینێتەوە. من لەو بڕوایەدام کە مرۆڤی خۆرئاوایی لە ئێستادا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ قوربانیی ئەم ڕووداوەیەو لە هەمان کاتیشدا بێگوناه نیە. من لێرەدا بە هیچ جۆرێك مەبەستم ئەوە نیە بەرگری لەو کەسانە بکەم کە ئەم کارە بەربەریەیان ئەنجام داوە. من لە خۆم دەپرسم ئایا کەسێکی وەکو بن لادنیش لە هەمان سەنگەردا نیە کە دەیەوێ دژی بجەنگێت؟ ئەویش سەرمایەدارێکی گەورەو بەشێکە لە تۆڕی دەسەڵات و پارە.

*ئەی چۆن دەکرێ دژ بەو و دژ بەو تۆڕە خەبات بکرێ؟ لە ڕێی دەسەڵاتی عەسکەرییەوە؟

-دەشێ کاری تیۆریستی لەم جۆرە پێویست بە وەڵامێکی پۆلیسی و عەسکەری بکات. بەڵام وەڵامی لەم جۆرەش بەس نیە، تا گۆڕانکارییەك لە سیاسەتدا ڕوونەدات بۆ لەناوبردنی زەمینەی تیرۆر. ئەگینا بە دڵنیاییەوەو ئەم شتانە سەرلەنوێ ڕوودەدەنەوە. پێویست بوو لە ڕای گشتیدا بوارێك بۆ ئەنجامدەرانی ئەم کارە نەهێڵرایەتەوەو بۆ ئەمەش دەبوایە سیاسەتی ئەمریکاو ئەوروپا بەرامبەر وڵاتە ئیسلامیەکان بگۆڕایە.

*لەم وتارەدا کە خوێندتانەوە باستان لە "سیاسەتی خەون" کردوە. ئەم سیاسەتە لە چ شتێك پێکهاتوە؟ ئایا لە ئێستادا تەواوی جیهانی خۆرئاوا تاقە خەونی ئاسایش نیە؟

-دەبێ وریابین لەوەی کە "سیاسەتی خەون" سیاسەتێك نیە بۆ خەون و خەونبین. ئەو خەونەی کە من باسی لێ دەکەم خەونی بیرکردنەوەیە، نەك خەونی گشتی هەنووکەیی بۆ ئاسایش و

ولاتپەرستی یان تۆلەکردنەوە. دەبێ لەم کابوسە دابڕین و سیاسەتی بیدارکردنەوە بخەینە جیی. لەم رووەوە پێویستە بیداربینەوە.

*ئایا دەتوانین لە دۆخیکی وادا چاو لە ئاسایش بپۆشین؟

-بە هیچ جۆریك. چاوپۆشین لە ئاسایش (ئەمنیەت) هەلسوکەوتیکی نابەرپرسانەیە. بە بڕوای من پۆلیس و سوپا پیویستن. من نالیم دەسبەرداری چەك بین، بەلام بە تەنها چەك بەس نیەو کاریگەیش نیە، نە بۆ ئەمنیەت و نە بۆ عەدالەت. شەر وەکو ئەوەی لە ئیستادا خەریکە روودەدات؛ نابیتە تاقە وەلام. لیرەدا خەونەکە ئەوەیە کە: دەبێ بیر لە چارەسەریکی دیکە بکەینەوە.

*ئەو چارەسەرە دەبێ چۆن چارەسەریك بیت؟

-شتیکی لەم جۆرە ناکرێ لە رستەیەکدا گوزارشتی لی بکرێ. ئەم مەسەلەیە تەنها پەیوەندی بە پۆلیس و سوپاوە نیە؛ بەلکو بە هەموو هاوولاتیانەوە لە ئەمریکاو ئەوروپادا. سەبارەت بەوەی کە پیویستە چی بکرێ؛ من شتیکم نیە بیلیم.

*ئیوە لە تازەترین کتیبتاندا سەبارەت بە "سیاسەتی هاورییەتی" دواون. ئەمرۆ شتیکی لەم بابەتە تا چەند مومکینە؟

-ئەو هاورییەتیەی من مەبەستمە وەکو ئەو خەونەی کە لە وتارەکەمدا ئاماژەم بۆ کردوە، ناموکینە. ناموکینیك کە پیچەوانەو نەفیکەرەوەی مومکین نیە. دەبێ ئەم ناموکینە ئەنجام بدرێ و پیویستە سەبارەت بە ناموکین بیربکەینەوەو ئەنجامی بدەین. خۆ ئەگەر بە تەنها ئەو کارانە ئەنجام بدەین کە مومکینن، کەواتە لە واقیعدا هیچمان نەکردوە. ئەگەر من تەنها ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنم کە دەتوانم بە ئەنجامی بگەیەنم، لە راستیدا هیچم نەکردوە.

*ئایا ١١ی سیپتەمبەریش لەم ناموکینەوە سەری هەلنەدا، کە نەدەکرا پیشبینی بکرێ؟

-نەخیر، ئیمە لیرەدا رووبەرووی بزاوتیکی پڕ رق و کینە بووینەتەوە، کە بە هەموو دلرەقیەوە دەکرا پیشبینی بکرێ. ئەم رووداوە هەموو دونیای دوچاری سەرسورمان کرد، بەلام شتیك نەبوو پیشبینی نەکرێ. سالانیکی زۆرە لە جیهانی عەرەبیدا بەرەنگاربوونەوە لە گەشەسەندندایە. سالانیکیشە کە تۆرەکانی تیرۆر بە شیوەیەکی بەرتەسك لە رووی سەربازی و داراییەوە پەیوەندی بە یەکەوە دەکەن. دوو سێ رۆژ بەر لە رووداوەکە لە بازاری بۆرسەدا مامەلە کردنیك روویدا. کەواتە بە شیوەیەکی گشتی قابیلی پیشبینیکردن بوو. ئەمە بەرنامەیەك بوو، پیکەوە پەیوەستبوونی چەند توخمیك کە لە واقیعدا مومکین بوون.

لە تۆری ئینتەرنیتیی "شهروند"ەوە.

# ئیلیاکازان

## حەزی لەوە بوو بەرهەمە ئەدەبیەکان بگوازێتەوە بۆ شاشەی سینەما

و. لە عەرەبییەوە: شۆڕش محەمەد حسێن



"ئیلیاکازان" ئەفراندنەکانی پەیوەست بوە بە بەرهەمەکانی تنسی ویلیامزو شتاینبك و ئارسەر میلر.. ئەو گرنگی بە ژیانی کەسێتی ئەکتەرەکانی دەداو لە کاتەکانی پشوودا چاودێری دەکردن.

دەرهێنەری سینەمایی (ئیلیاکازان) تامۆچێژێکی تایبەتی دایە سینەمای ئەمریکی، ئەویش لە رێی تێکەڵکردنی بەرهەمی ئەدەبی و نووسینی گرنگترین نووسەرە هاوچەرخەکان لە بواری رۆمان و شانۆدا، لە نمونەی تنسی ویلیامزو ئارسەر میلەرو جون شتاینبك و سورنتون وایلدر.. سەرەڕای ئەو بەرهەمانەی خۆی نووسیویەتی، کازان و ئورسون ویلز بە گرنگترین تازەگەرانی بزاڤی سینەمای ئەمریکی دادەنرێن لە چل و پەنجاکاندا، لەگەڵ جیاوازی گەورە لە نێوان شێوازی کارکردنی هەردووکیاندا. لە ناوەڕاستی چلەکان تا ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی پێشوو (کازان) نزیکەی ٢٠ فیلمی لە شاکارە سینەماییەکانی جیهان پیشکەش کرد، لەوانە:

گالیسکەیەك ناوی ئارەزوە، بژی زاباتا، بەرەی ئاو، رۆژهەڵاتی عەدەن، رێکەوتننامە، پیاوکوژان، ئەمریکا ئەمریکا..

کازان هەوڵ دەدات هەموو دیمەنێك لەناو فیلمەکەی بگەیەنێتە ترۆپك، تەنانەت ئەگەر ئەو دیمەنە لە یەك چرکەشدا بێت، ئەم ترۆپکە بچوکانە کۆدەبنەوە تا ترۆپکە گەورەکەی فیلمەکەی لێ پێك بێت.

### ژیاننامە

ساڵی ١٩٨٨ کازان یاداشتنامەکانی بڵاوکردەوە، لە پاڵ ژیاننامەی خۆی و کارە

هونەریـــەکانی داکۆکیکردنێـــك لـــە هەڵوێســـتەکەی ساڵی ١٩٥٢ی لەخۆ گرتبوو. ئەو دەمەی هاوکاری کرد لەگەڵ لیژنەی لێکۆڵینەوە لە چالاکیەکانی دژ بە ئەمریکا، کە لەو هێرشە بەناوبانگەی مارکسیەتەوە هـــەڵقولا دژ بەوانـــەی بـــە چەپـــە ئەمرکاییـــەکان ناســـرابوون. ژمارەیـــەکی زۆر لـــە نووســـەرانی هونەرمەند تیایدا بوونە قوربانی، لەوانـە (ئارسـەر میلەرو چارلی چابلن). هەروەها باس لەوە کرابوو کە کازان چەند نـاوێکی داوە بـە لیژنەکـە لەوانـەی لـە کایەی هونەریدا کاریان دەکرد، وەك چۆن (رۆنـاڵد ریگـان)ی ئەکتـەری نەناسـراو کـە لـە پاشـان بـوە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتوەکان ئەو کارەی کرد. بەڵام کـــازان کـــە لـــە ســـاڵی ١٩٠٩ لـــەدایکبوە، ئـــەو چەرمەسەریە ناخۆشانەی خێزانەکەی بەبیر دێتـەوە کە بە منداڵی لە تورکیاوە کۆچیان کردوە، هەروەها ئەو بەربەستانەشی دێتـەوە یاد، پێش ئـەوەی وەك بەهرەیەکی هونەری تایبەت جێپێی خۆی بکاتـەوە، بەهرەیەك کە پرۆژەیەکی ئەفراندنی گەورەی پێیە.

ڕەخنـــەگران لێکۆڵینـــەوەی دووروو درێژیـــان دەربارەی تایبەتمەندی ئەزموونی کازان نووسیوەو ڕەخنەگری سینەمایی (مایکل سیمان) گفتوگۆیەکی درێژی لەگەڵدا سازداوە کە زۆر لە وردودرشتی ئەو ئەزموونەی تێدایە.

### پەیوەندییەکی تایبەت بە نووسینەوە:

کـازان لـە زۆربـەی ئـەو دەرهێنـەرە گەورانـەی لەگەڵیاندا ژیـاوە بـەوە جیادەکرێتـەوە، کـە هـەوڵی نووسینی ڕۆمانو شانۆو سینەمای هـەبوو. پێـش ئەوەی لە زانکۆی (یال) دەربچێت، شـانۆنامەیەکی نووسی. جگە لەوە ڕەخنەگریشەو تێڕوانینی خۆی هەیـــە بـــۆ ئـــەو نووســـەرانەی بەرهەمـــەکانیانی خوێندبۆوە. کازان سەرسام بوو بە (دیستۆفسکی)، بەڵام ئیرەیی بە (چیخۆف) دەبات، چونکە ناوەڕۆك لەلای ئەو چڕو پڕە، بەرهەمەکانیشی بە سادەیی و واقعیەتی شیعری جیادەکرێتەوە، بەڵام دستۆفسکی دوو ئاسـتی هەیـە: ئاسـتی بـەرزو ئاسـتی نـزم، هەروەها ترسو فۆبیا تێکەڵ بە کۆمیدا دەکات.

کازان باسی لەو پەیوەندیانەش کـردوە کـە بـە گـەورەترین نووســەرە ئەمریکیـەکانی لـە نمونـەی (کیلفۆرداودیتـــسو ئارســـەر میلـــەرو جـــۆن شـــتاینبك)ەوە هـــەیبوە، پـــەیوەندی بـــە ئارســـەر میلـەرەوە لـە سـاڵی ١٩٤٥ەوە دەسـت پێدەکـات، کـاتێك میلـەر شـانۆییە نوێکـەی کـە بـە نـاوی (هـــەموویان منـــاڵمن كلـــهم انبـــائی) خســـتە بەردەستو لە ساڵی ١٩٤٧ لە سەر تەختەی شانۆ نمایشی کـرد. ئـەم پەیوەندیـە لـە کـاری دوەمـی ئارســـەر میلـــەر (مـــوت بـــائع جـــوال- مـــەرگی دیوەرەیـەك). کـە کـازان لـە سـالی ١٩٤٩ دەریـهینا پتەوتر بوو.

هـــەروەها شـــانۆیی هەریـــەك لـــە (ئەرشـــیبالد ماکلیش، روبرت ئەندرسۆن)ی دەرهیناوەو لە سالی ١٩٤٧دا لەسـەر شـانۆ دەقـی (گالیسـکەیەك نـاوی ئـارەزوە- عربـة اسـمها الرغبـة)ی تنسـی ویلیـامز پیشکەش کرد، پیش ئەوەی لە سالی ١٩٥١ بیکاتـە فیلمی سینەمایی.

لە قۆناغێکی تردا چوار شانۆیی لە دەرهێنانی ئیلیاکازان لەسەر شانۆی برودوای– لە نیویۆرك لە یەك کاتدا پێشکەش کرا.

## ڕێگا بەرەو هولیوود:

لە ساڵی ١٩٣٦ کازان لە نیۆرکەوە بۆ هولیوود سەفەری کرد تاوەکو ڕێکەوتنێك بۆ شانۆی کۆمەڵە (مسرح المجموعة) گرێ بدات بە جۆرێك ئەو هەفتانە (٢٠٠ دۆلار)یەی بەربکەوێ، هەروەها وەك ئەکتەر لە فیلمی (ڕێگەیەکی داخراو– الطریق المسدود) سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا.. والتر وانجری بەرهەمهێنەریش پێی وت: ئەی هاوار.. ناتوانی بەناوی (ئیلیا.. کازان)ەوە بچیە سینەماوە، ئەمە ئاستەمە، شارەزایەکم هەیە لە بارەی ناوە هونەریەکانەوە، دەمەوێ ڕەوانەی لای ئەوت بکەم.. (هودن)ی شارەزاش هەستا بە گەڕان لە دەلیلی تەلەفۆنداو پاشان وتی ناوت دەنێین (سیزان) کازانیش پێی وت: بەڵام ئەمە ناوی وێنەکێشێکی بەناوبانگە.. هورنیش وەڵامی دایەوە: گوێ بگرە، دەتوانی دوو کەڤاڵ بکێشیت، تاوەکو وا دەرکەوێ کە ئەو هەر نەشبوە. پێشنیاری ئەوەشی کرد ناوی یەکەمی (ئیلیۆت) بێت و پاشان دوەمین داواکاری ئەوە بوو کە نەشتەگەریەکی جوانکاری بۆ لووتی بکات زیاد کە لە پێویست گەورەتر دیار بوو، بەڵام نە ناوەکەی گۆڕی نە شێوەی لووتی.

## ژیان و نواندن:

ئیلیا کازان وا دەبینێ کە هەموو ئەکتەرێك (کێشەیەکی تاکی– فردی) خۆی هەیەو جیاکاری ناکات لە نێوان ژیان و نواندن، هەروەها گرنگیەکی گەورەش دەدات بە ڕاهێنانی بەردەوامی ئەکتەرەکان، تەنانەت لەو کاتانەی دادەنیشن بۆ نانخواردن، ئەویش لەگەڵیاندا دادەنیشێت و لە بارەی دیمەنی دوەمەوە قسەیان بۆ دەکات، ئەمەش بۆ ئەوەی ئاستی فشار لەسەر ئەکتەرەکان بەردەوام بێت، جارێکیشیان گوێی لە یەکێك لە ئەکتەرەکان بوو لەبارەی ئەوەوە وتی: ئەم دەرهێنەرە بێژوە بۆ تەنها ساتێك وازمان لێ ناهێنێت!

ئەو لە کاتی نوستنیاندا بە ئاگایان دەهێنێ تا پێیان بڵێ: پێدەچێ بەو شێوەیەی کە تیایدا نوستوون لە کۆتایی دیمەنەکەدا وێنەتان بکەم، پرسیارە هەمیشەییەکەش بۆ ئەکتەرەکان دووبارە دەکاتەوە: (چیت لە دیمەنەکە دەوێ؟ پێش دیمەنەکە چی ڕویدا؟

کازان شێوازی خۆی لە هەڵبژاردنی ئەکتەرەکان بەم جۆرە دیاری دەکات:

ئاراستەی بنەڕەتی ڕۆڵەکە دەبێ لە ڕێی ئەکتەرەوە گوزەر بکات، دەشبێ ڕۆڵەکەی لە شوێنێك لە ناواخنیدا بپارێزێ و ئەکتەر بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵیدا بژی. لەبەرئەوە من کارەکتەرەکان بە پێی خوێندنەوە دابەش ناکەم، بەڵکو لەگەڵ ئەکتەردا پیاسەیەك دەکەم، یاخود بۆ خوانێك بانگێشتی دەکەم و لەوکاتانەی بێ ئاگایە چاودێری دەکەم تا ئەو شتانە بدۆزمەوە کە لە ناواخنیدایە. هەروەها من وا ناسراوم کە ڕۆڵەکان بە پێی غەریزە دابەش دەکەم.

شێوازی کازان کاریگەریەکی ڕوونی لە بەرجەستەی زۆر لە گەورە ئەکتەرە درەوشاوەکانی سینەمادا دیارە، لەوانە (جیمیس دین و ئەنتۆنی کوین و رود شتایجرو فیفان لی و جولی هاریس و

کارول بیکرو مارلون براندو)، سەبارەت بە مارۆن براندۆ (کازان) دەلێت: نیوانی وەحشیەت و کیشکردن و بازاری کۆدەکاتەوە.

### دۆزینەوەی براندو

کازان لە بارەی یەکەمین دیداری لەگەڵ مارلون براندو لە سالی ١٩٥١ دەگێریتەو دەلێ: کاتێك تەنسی ویلیامز (گالیسکەیەك ناوی ئارەزوە)ی پیشکەش کردم و پەیوەندیم پیوەکردو پیم وت: پیموایە ئەو ئەکتەرەم دۆزیوەتەوە کە بەرجەستەی رۆلی (ستانلی کوارسکی) بکات، ئەو تەمەنی بچوکە بۆ ئەم رۆلە، بەڵام دەمەوێ رەوانەی لای تۆی بکەم: بە خۆمم وت، تنسی پیی رازی نابیت، چونکە زۆر بچووکە، وەك منالیکی رووخۆش دیارە لەگەڵ ئەوەی بونیەتی بەهیزە، براندۆم گرت و پیم وت: ئەمە (٢٠) دۆلارە بیدەرە کریی ئوتۆمبیلیك بۆ (بوستن)، لە بوستنەوە بچۆ بۆ (راس کود) پارەی وەرگرت و وتی سوپاس. دواتر رۆیشت، بۆ رۆژی دوایی پەیوەندیم بە تنسی ویلیامزەوە کردو پیم وت: ها.. رات چۆنە لە بارەیەوە؟! وتی (بەرامبەر کێ؟).. براندو نەچووبوو بۆ لای، رۆژی دواتر پەیوەندیم پیوە کردو وتم: "بە دلت بوو؟" ویلیامز وتی: (مەبەستت کییە؟ هیشتا کەس نەهاتوە بۆ لام..".

رۆژی سییەم تەلەفۆنی بۆ کردم و وتی: "ئا ئەمە ئەوەیە کە داوامان دەکرد!" خۆشمدەوێ، ئەمە رۆلەکەیە. وتم چی رویداوە؟ وتی: (٢٠ دۆلار بۆ ئەو برە پارەیەکی زۆرە، بەردەوامبوو لە گەران بێئەوەی هیچ لەو (٢٠) دۆلارە سەرف بکات، ئەو بەو جۆرە ژیابوو. هەروەها باسی ئەوەیان بۆ کردووم کە پاش ئەوە بە نزیکەی سێ تا چوار سالْ، پەیوەندیەکەمان بە شیوەیەکی سەیر پەرەی سەند. وەکو باوکی بووم، راهاتبوو بیت بۆ مالەکەم و یاری لەگەڵ (کریس)ی کورم بکات کە ئەوکاتە منالیکی بچووك بوو. دوای ئەوەی بۆم دەرکەوت بەرامبەرم ساردوسرە، بەلام جیاواز بوو، هەستی بە خۆشەویستی دەکرد بەرامبەرم. خۆشی ئەویستم، ئەودەمەی (لە ریکەوتنامەدا) کاری نەکرد پیی وتم: تۆ تاکە دەرهینەری لە ژیانمدا کارم لەگەلدا کردبێ، منیش پیم وت: تۆش باشترین ئەکتەریکی لەگەلیا کارم کردبێ. دواتر لە باوەشی گرتم و ماچی کردم و لیك جیابووینەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئیستا بەرامبەرم هەست بە تورەیی دەکات هەروەك چۆن کور لە بەرامبەر باوکیدا هەست بەوە دەکات..

براندۆ لە نیوان سەرجەم ئەکتەرەکاندا بە تواناتر بوو، تاك و جیاواز بوو، شتیکی لە موعجیزە تیادا بوو، شتیك پەیوەست بە رونکردنەوەی ئەوەی لە هزرمدا هەبو لە بەرامبەری. گویگرتنی بۆم گویگرتنیکی تەواوەتی و بە ریژەیەکی زۆر بوو، بە جۆریك ئەزمونیکی باش بوو تا قسەی بۆ بکەم راستەوخۆ وەلامی نەدەدایەوە، بەلکو یەکسەر دەچوو شتیکی جیبەجێ دەکرد کە بە بەردەوام سەرسامی دەکردم. ئەم هەستەی لا دروست دەکردم "زۆر سوپاسی دەکەم بە هەستانی بەو شتە!" وەك ئەوە وابوو دیاری یەکتا پیشکەش بکات؟ ئەمە ئەو شتە بوو کە لیمان داوا دەکرد، بەلام لە ریی هەستیکی راستەقینەوە.

### چاودێری کردنی ئەکتەر:

کازان گرنگی بە ژیانی کەسایەتی ئەکتەر دەدات، ئەو دەستبەرداری کارکردن بوو لەگەڵ یەکێك لە کچە ئەکتەرەکان دوای ئەوەی لە مێردی پێشویەوە زۆر شتی لە ژیانی کەسیتیان زانی و دەڵێ: زۆر شت دەربارەی ژیانی کەسیتی ئەکتەرەکان دەزانم، لە ستۆدیۆی ئەکتەرەکان بە تەنها وەك لایەنی هونەری لەگەڵ ئەکتەرەکاندا گفتوگۆم نەدەکرد بەلکو وەك مرۆڤیش، مادەی پێکهێنەری پیشەکەم بریتیە لە ژیانی ئەکتەرەکانم کە هەتا ئیستا پیایدا تیپەریون.

(فیفان لی) کە لە فیلمی (ذهب مع الریح- لەگەل بادا رۆشت) لە سالی ١٩٣٩ لەگەڵ کلارك جیبل- دەرکەوت، لەگەڵ مارلون براندو لە دوایەمین فیلمدا بەشداری کرد کە ئەفسانەی ئافرەتی لە سینەمای ئەمریکیدا تیکشکاند ئەویش فیلمی "گالیسکەیەك ناوی ئارەزوە" لە دەرهینانی کازان لە سالی ١٩٥١و بە هەمان شیوەش رۆلی "بلانش دوبوا"ی دەبینی کە لەسەر شانۆ لە لەندەن لەگەڵ لورنس ئولیفیەی هاوسەری پیشکەشیان کرد، بەلام کازان دەیویست بە جۆریکی جیاوازتر هەستێ بە بینینی رۆلەکە، پیی دەلیّ: "تۆ ئیستا لەگەڵ (لاری) نیت تۆ ئیستا لەگەڵ منی" خەلاتی ئۆسکاریشی لە بەرامبەر ئەم رۆلە پی بەخشرا.

### لەگەل ئورسون ویلز:

لەگەڵ ئەوەی کەسیتی ئوروسن ویلز- سەرنجی زۆریك لە دەرهینانی بەلای خۆیدا کیش دەکرد، بەلام بۆ کازان وا نەبوو، بەلکو روانینیکی جیاوازی هەبوو، بە جۆریك دەیوت: لەگەڵ ئوروسن ویلز- لە دەوروبەری سالی ١٩٣٩ دا کە بەرنامەیەك بە ناوی "سیبەر- الظل"ی پیشکەش کارم کرد. لەو بەرنامەیەدا پشتی بە من دەبەست بۆ بەرجەستەکردنی رۆلی پیاوانی کاوبۆی (عصابة). ئەو رۆژانەی ئەندازە خۆ بە زل زان بوو. واش راهاتبوو بە جۆریك بیتە ناو ستۆدیۆ کەوا بنوینێ سەرجەمی شەوی لە دەرەوە بەسەر بردبێ. هاوەلەکەی جانتایەکی بچوکی بۆ ئامادە دەکرد لەگەڵ کراسیکی خاوین و بۆینباخیکی خاوین و ئامیری ریشتاشین، ئەودەمەی لە راهینانیش بوو بە شیوەیەکی زۆر جوان خۆی دەگۆری و خۆی ئامادە دەکرد بۆ بەردەوام بوون لە رۆژدا. حەزم بەم ریگە ئاسانەی ژیان کرد، (دروست کراو) و ترسناك بوو، دەنگی ترسناکی لە دەم دەهاتەدەر، لە شانۆی کۆمەلەدا گرنگی زۆرمان پی نەدا، بروایشم وایە کە کاریگەری سەرەکی سەر ویلز- هەلینجراوی تەکنیکی دەرهینانی ئیستگەییە، فیلمەکانی لە روی بینینەوە زۆر خۆشن، لەگەڵ ئەوەی لەسەر بیستن پیکهاتوە، بروانکاکەم قوول بیت، بەو مانایەی ئەوەی دەرکی پی دەکەی قوولی تەواوەتی ژیر روکەش نیە، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن توانایەکی گەورەی شانۆییە، ئورسونم زۆر خۆشدەوێ، بەلام پیی کاریگەر نیم.."".

### تنسی ویلیامزی نازدار:

ئیلیا کازان هەندێ لایەنی شاراوەمان لە ژیانی هەندێ لەو نووسەرانە بۆ دەردەخات کە خودی خۆی مامەلەی لەگەلدا کردوون، وەك ئارسەر میلەرو

ثۆرنتون وایلدرو تنسی ویلیامز. کازان لە کاتی پرۆژەدا نەیدەهیشت ویلیامز بیت لەسەر شانۆییەکەی و قسە لەگەڵ ئەکتەرەکاندا بکات، رووداویکی خۆش لە ویلیامز رووی دا، لە کاتی وینەگرتنی فیلمی "گالیسکەیەك ناوی ئارەزوە"، ئەم رووداوە لە باشور روی داوەو بەم جۆرەیە: لە کۆتاییدا بەرەو ئوتیلیك لە جرینفلید هاوەلیم کرد، ئەو پیاویکە رۆژانە مەلە دەکات، پاش دوو رۆژ سەری سورماندم کە وتی: دەرۆم.. لیم پرسی: بۆچی؟.. وتی: ناتوانم مەلەوانگە بدۆزمەوە. پیم وت: ئەمە حالە.. کۆتایی ئەم فیلمەم دەوێ، تنسی ناتوانی مەلەوانگە بکەیتە پاساویك بۆ سەفەرکردن، لە ویستگەیەکی ئالۆزدا بەجیم دەهیلی.. تیمیکم لەگەلدایەو تاقمیکی گەورەم هەیە لیرە چاوەریم دەکەن، تۆش دییت باس لە نەبوونی مەلەوانگە دەکەیت، پاشان وتم: مەلەوانگەیەکت بۆ پەیدا دەکەم تەنانەت گەر ناچار بم دروستیشی بکەم. لەگەڵ بەرپرسانی شارەکەدا کۆبوومەوەو وتم: پیویستە مەلەوانگەیەك بدۆزینەوە. مەلەوانگەیەکیان دۆزیەوە، بەلام خراپو بێ ئاو بوو. دەستیان کرد بە چاکردنی، گەرامەوە بۆ ئوتیلەکەو نامەیەکی ولیامزم دۆزیەوە: شارەکەی بەجیهیشتو بە تەنیا مامەوە..

ئەو شتەی تر کە رویدا شتیك بوو خۆی پیی جیادەکرایەوە.. لە دوای ئەوەی بەوجۆرە بیزارکارە هەلسوکەوتی کرد، بە شتیکی گەورە هەستا کە لە ماوەی دوو رۆژدا کۆتایی فیلمەکەی بۆ رەوانە کردم کە زۆر بە گەورەیی بینیمەوەو ئەو کۆتاییە بوو کە لە فیلمەکەدا بە شیوەیەکی بنەرەتی بەکارم هینا.

لە پاشان پیم وت: بۆچی بەم جۆرە بەجیت هیشتم؟ وتی: خەلکی لە شەقامەکاندا کە رووبەرووم دەهاتن بە شیوەیەکی پیکەنیناوی سەیریان دەکردم.

### پوختەی ئەزموونەکە:

بەرای من ئەزموونی ئەو بە کورتیەکەی، روانینیکی چر بوو. دەربارەی پەیوەندی نیوان هونەرمەندو کاری هونەری و دەلێ: کیشەی خودی لەسەر هونەرمەندیتییە لە گونجاندن لەگەڵ خودی خۆیدا. رۆلی رەقیب لەسەر هەستەکانت بەرجەستە مەکە، بە تایبەت هەستە کتوپرەکان، یاخود تیکشکاوو خەمناکەکان، یاخود ئارەزوە مەشروعو نامەشروعەکان (رەواو نارەواکان)و شۆرشی تورە بوونت، ئەوانەشی لیوەی هەست بە شەرمیکی توند دەکەیت، هەموو ئەو شتانەشی کە ئەو رەقیبەی (لە ناوتایە) هەول دەدات رەتی بکاتەوە.

وازبهینە ئەم شتانە بچنە ناو گۆرەپانی هۆشیاریتەوە، ریگرییان مەکە، بەلکو باوەشیان بۆ بکەرەوە، چونکە ئەم شتانەی هەول دەدەیت دوریان بخەیتەوە یاخود رەتیان بکەیتەوە، یاخود بیدەنگیان بکەیتو لە ناویان بەریت چونکە (شلەژانت) بۆ دروست دەکەن، گەورەترین بەهاو سودن لە هونەردا.

شتیکی تریش کە دەمەویت تەئکیدی لەسەر بکەمەوە ئەوەیە کە زۆرینە باش نیەو هیز لە کاری درامیدا وەکو ئەو پالنەرەیە کەلە فشارەوە دیت.

# چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سەمیح قاسم دا

## لەسەرەتای دەستپێکردنمەوە ڕووبەڕووی زیاد لە قاڵبێکی شیعری بومەتەوە.
## هیچ شاعیرێك نییە حەز بەوە بکات ناوی لەگەڵ ناوی شاعیرێکی دیکەدا بەراورد بکرێت

**وەرگێڕانی: هەورامان وریا**

***دواجار "سەمیح قاسم" سەردانی (عەمان) ی کرد، بۆ ئەوەی لە چالاکییەکانی (عەمان پایتەختی ڕۆشنبیری عەرەبییە بۆ ساڵی ٢٠٠٢) بەشداری بکات، ئەو چالاکییانەی بەهۆی داگیرکردنی ناوچە فەلەستینیەکان لەلایەن ئیسرائیلەوە دواخرا. لەم چاوپێکەوتنەدا" سەمیح قاسم" قسە لەسەر ئیشە تازەکەی دەکات، هەروەها قسە دەربارەی هاوڕێکەی "مەحمود دەروێش" و پەیوەندی نێوان شیعر و هونەری ڕۆمان دەکات.***

-دوای ئەم ماوە دوورودرێژە، تاچەند لێکنەچوون و لێك نزیکبونەوە هەیە لەنێوان ئەزمونی ئێستای خۆت لەگەڵ ئەزمونی "مەحمود دەروێش"دا، ئێوە هەردووکتان کاتێ دەستانپێکرد لەساڵانی شەست و حەفتاکان ، دوو ئەزمون بوون بەتەنیشت یەکەوە؟

+*ئەمە بۆتە قەزاوقەدەر بەسەرمانەوە*، پرسیاری مەحمود دەرویش لە من دەکەن و پرسیاری منیش لەو دەکەن، ئەم پیکەوە بوونە، بمانەوێ و نەمانەوێ، پیمان خۆشبیت یا ناخۆشبیت سەپاوە بەسەرماندا، ئیمە هاوریی یەکین، بەلام شاعیر کەیفی بەوەدیت کە هەر خۆی بیت، هیچ شاعیریك نییە حەز بەوە بکات ناوی لەگەل ناوی شاعیریکی دیکەدا بەراورد بکریت، ئەوەی کە خەلك نایزانیت و ئاگایان لی نییە ئەوەیە ئیمە تا رادەیەکی باش لە کاروبارە هونەریەکاندا زۆر جیاوازین لە یەکتری. تەنانەت هەندێ جار هەلە و بە سەهوچونیك هەیە لە جیاکردنەوەی کەسایەتیشمان لە یەکتری، خەلکانیکی زۆر لەسەر شەقام و لە چاخانەو لەناو فرۆکەدا بانگی مەحمود دەکەن وادەزانن منم و هەندیکی دی بانگی من دەکەن وادەزانن مەحمود دەرویشە.

دەڵێن ئێوە لە یەکدی دەچن، بەڵام ئێمە لە یەکدی ناچین، تەنانەت لە ڕوخسار و سیماشدا جیاوازین، گەرچی لە میانەی ئەزمونەوە هاجسێکی گشتی پێکەوەمان دەبەستێت.

ڕاستە زۆر خاڵی هاوبەش هەیە کە پێکەوەمان دەبەستێت و لەسەر ئاستی ژیان و فیکرو ئەزمون و قەناعەت و ئاراستەی هونەری، کۆمان دەکاتەوە. بەڵام لە وردەکارییەکاندا جیاوازییەکی گەورە و فراوانمان لە نێواندا هەیە، دواجار ئەوجیاوازیە لە چوارچێوەی یەکتر تەواوکردندا دەمێنێتەوە، ئەو جیاوازییە ناو نانێم دژ-التناقض- خۆ ئەگەر ناویشی بنێم دژ، ئەوا جوانییەکەی لەوەدایە کە ئەو دژە دروست بوون و گۆڕان و وەرچەرخان و تازەگەری و جیاوازییە لە ئەزمونە هونەرییەکاندا. لەوبڕوایەدام ڕەخنەگری بەسەلیقە و شارەزا دەتوانێ ئەو جیاوازی و لێك نەچوونانە ببینێت لە چۆنیەتی گوزارشتکردن و لە بڕی گرنگی و بایەخدان بە شێواز یان ناوەڕۆك و مەسەلەی ڕەمز و قەناعەتە ڕۆحییەکان.

*ڕووت کردە نووسینی ڕۆمان، بەڵام تێیدا بەردەوام نەبوویت. ئایا تۆ ئێستا کە لە دوورەوە لەو ئەزمونەت دەڕوانیت پێخۆشحاڵ و ڕازیت لێی؟ ئەی پەیوەندی نێوان شیعر و ڕۆمان چۆن دەبینی؟

-ڕۆمانی یەکەمم ناونا(بەسەرهاتی خۆم-حکایة ذاتیة) چونکە تێیدا پشتم بەستبوو بە تیکەڵ کردنی نێوان خەیاڵی ئەدەبی و ئەزمونی ژیانی خۆم، ئەزمونەکانم لەم بوارەدا ناو نەناوە ڕۆمان، ئەمەش لەبەر ئەوەنا کە لە هەڵسەنگاندنە ڕەخنەییەکان دەترسم و سڵیان لێدەکەمەوە، بەڵکو لەبەر پابەندبوونم بەو قەناعەتەی کە من شێوەیەك لە ڕۆمانی تەقلیدی نانوسم، بەسەرهاتەکانم لە نێوان یاداشت و خەوندا دێن و دەچن.

لەم چوارچێوەیەدا دوو ئیشم بڵاوکردوەتەوە (دوا وێنە لە ئەلبومێکدا) و (بۆ دۆزەخ ئەی لەیلەك)، هەروەها ساڵانێکە پرۆژەی نووسینی ڕۆمانێك یان چەند بەسەرهاتێکم هەیە، ڕوداوەکان و کەسایەتیەکان و وردەکارییەکانی ئەم پرۆژەیەم لە وەعی و یادەوەریمدا ئامادەیە و پێگەیشتوە، بەڵام پێویستە کاتێکیان بۆ تەرخان بکەم تا بیاننوسمەوە، تەنانەت ناونیشانێکی گونجاویشم بۆ داناوە کە بریتیە لە (ڕۆژی سێ جار کەوچکێکی بچوك ژەهر). هیوادارم کاتێکی لەبارو باشم بۆ هەڵکەوێت تا بیانخەمە سەر کاغەز.

*لە فەلەستیندا دوای "ئەمیل حەبیبی" گوێمان لە دەنگی هیچ ڕۆمان نوسێکی تازە نەبووە، یان بەلانی کەمەوە ڕۆمان نوسێك پەیدا نەبووە بگاتە ئاستی ئەزموونی "حەبیبی". ئەم دیاردەیە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

-هەندێ ڕۆمان نوسمان هەیە جێگای دڵخۆشین و چاوەڕوانیی باشیان لێدەکرێت، پێویستە ئەوەت لەبیر نەچێت ئەزمونی "ئەمیل حەبیبی" نزیکەی نیو سەدەی خایاند تا گەیشتە ئەم ئاستەی ئێستای و ئەم دەرکەوتنە ئەدەبییە بایەخدارەی لێکەوتەوە، لەو بڕوایەدام ئەو زەویەی کە "ئەمیل حەبیبی" بەرهەم هێناوە توانای ئەوەی هەیە ڕۆمان نوسی دیکەش بەرهەم بهێنێت.

وەك پێشتر ئاماژەم پێدا هەندێ ناومان هەیە چاوەڕوانی باشیان لێدەکرێت وەك" سوهەیل

کـەیوان، ریـاز بیـدس" لـە چیرۆکنووسـە بـاش و دەرکـەوتوەکانیش"محەمـەد عـەلی تـەها و محەمـەد نفاع و زەکی دەرویش و رەجا ئەلبەکەریـە و نـەبیل قاسم کـە رەخنەگریشـە". ئەزمونەکـە بەردەوامـە و پیویسـتە لەسـەرمان چاوەریکـەین، هـەموو بـاخیك وەرزی تایبەتی خۆی هەیە.

*ئایا هەستت بەوە کرد نوسینی رۆمان فـەزاو پانتاییـەکی گـەورە و فراوانـتری هەیـە لـە جیـهانی شیعر؟

-بیگومان لەو بروایەدام شیوەی گوزارشتکردن گرنگە، بەلام سروشتی گوزارشتکردن و دەربرین لە شـیعرەوە بـۆ رۆمـان جیـاوازە. شـیعر بـەرەو چربوونـەوە دەچیـت، لـەکاتیکدا رۆمـان بـەرەو دریژی و پەل کوتان دەروات و دەچیتە ناو شتە زۆر بچوکـەکان و راڤەکردنـەوە، لـە پاشـان نـاوەوە جیدەهیلیـت و دەگەریتـەوە بـۆ دەرەوە، جـاریکی دیکـە دەگەریتـەوە بـۆ نـاوەوە، بـەم شـیوەیە لـە جوولەیەکی لوولویی سەربەرەوژوردایە.

هەندیَ حالەت هەیە جارس و بیزارکەرە، مرۆڤ لـە بـەکارهینانی شـیوەیەکی دیـاریکراودا تووشـی بیزاری و بیتاقـەتی دەبیت، بۆیـە پـەنا دەباتـە بـەر هەندیَ شیوەی دیکە، ئەمەش حالەتیکی سروشتیە، رەنگـە مـرۆڤ لـە هـەر شـیوەیەکی هونـەری کـە هـەلیدەبژیریت داهینـەر بیـت، دەکـریَ شـاعیریك حەکایـەت یـان رۆمـان بنوسـیت، یـاخود وینـە بکیشـیت، یـان ئاوازدانـەر بیـت، بـەلام شـیوەی داهینانە بنەرەتیەکەی لە ژیانیدا هـەر دەمینیتـەوە، لەو بروایەدام سەرکیشی هونەری بۆ خۆی شتیکی جوان و لەزەت بەخشە.

*ئـەوەی لـە رۆمـاندا تیبینـی دەکریـت بـۆ شیعریش هـەر وایـە و تیبینـی دەکریـت، مەبەستم نەبوون و دەرنەکەوتنی شاعیری تازەیە کە تەجاوزی شـەپۆلی یەکـەمی شـاعیرانی بـەرگری شـعراء المقاومة- کردبیت؟

-کۆمـەلیَ دەنگـی باشمـان هەیـە کـە جیگـای خۆشحالین و مـژدە بەخشـن، بـەلام پیویسـتیان بـە کەلەکە بوون وخۆکۆکردنەوە هەیە.. کەلەکـەبوونی ئـەزمون و داهینـان، کەلەکـەبوونی پرۆسـەی بلاوکردنـەوە و ئـەو کەلەکەبوونـەش کـە پیـش بلاوکردنەوە دەکەویت. لە راستیدا زەویەکە یەجگار بـەو شـیوەیە وشـك و برنـگ نییـە و دوارۆژیـش بەرووی هەندیَ ناوی تایبەتیدا دانەخراوە.

من باوەرم بە بوونی قالبکاری نییە. کەسانیك هـەن دەلین ئیوە قالبیکتـان دروسـت کـردوە کـەس نـاتوانیت بیـبریت و تیخـەی بکـات، ئـەم جـۆرە قسەکردنە لەلای من رەواجی نییـە و وەرناگـیریت، چونکـە مـن خـۆم لـە گـەنجیمدا و لـە سـەرەتای شـیعریما رووبـەروی زیـاد لـە قـالبیکی شـیعری بومەتـەوە. پرۆسـەی داهینـان هیـچ سـنوریکی بـۆ نییە.

*لـە میانـەی ئـەزمونی خۆتـەوە سـەرچاوەکانی رۆشـنبیری شـاعیر لـەمرۆدا چییـەو، تاچـەند ئـەم سـەرچاوانەی ئیسـتا جیـاوازن لەگـەل سـەرچاوەی رۆشنبیری دامەزراو لە ماوەی نیوان سالانی پەنجاو شەستەکان؟

-یەکـەم سـەرچاوە و دوا سـەرچاوەی شـاعیر ژیان و ئەزمون و ژینگەکەیەتی، بەلام سروشتی ئەم سـەرچاوەیە بـەپیی بـارودۆخ و گەشـەکردن و

وەرچەرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان دەگۆڕێت.

من کە شاعیرێکی فەلەستینی دەربەستم، ئەو تراژیدیا و ناسۆرییەی فەلەستین و خەمی فەلەستینی هەموو کاتێك لە قوڵایی و ناخی ئەزمونە شیعریەکەمدا ئامادەبوون، بەڵام بەبێ دابڕان لە خەمی نەتەوەی عەرەب و خەمی مرۆڤایەتیش. بەم مانایەش نەگۆڕی سەرچاوە مانای نەگۆڕی حاڵەتە شیعرییەکە نییە، لکاندنی ئەزمون بە ژیان و گەشەکردن و بەرەوپێشچون، ئەم ئەزمونەش بە شێوەیەکی گشتی بەهۆی ئەو پێشهاتانەوە کە واقعی ڕۆژانە دەیانسەپێنێت لەسەر ئاستی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئەزمونی تایبەتی خۆت و کەڵەکەبونی مەعریفە ڕاوەستاوە.

**سەرچاوە**

**لاپەڕەی ڕۆشنبیریی ڕۆژنامەی "الشرق الاوسط"**

خوینەران و وەرگیرانی "سەردەم" ئاگادار دەکەین کە فایلی ژمارەی داهاتوومان تایبەتە بە:

**بوونگەرایی**

**یان**

**(وجودیەت)**

چاوەریی بەشداریکردنتانین.

## سەلمان ڕوشدی

# ڕۆژنامەکانی بەریتانیا ئومێدبڕ بون، چونکە نەکوژرام



نووسەری بەریتانی سەلمان ڕوشدی زمانی هێرشبردنی لە ڕۆژنامەکانی بەریتانیا خستە کار. گوایا هەندێك لە ڕەخنەگرانی ئەدەب لەوە ئومێدبڕ بوون کە ئەو فتوایەی بۆ کوشتنی درابوو، تا ئێستا جێبەجێ نەکراوە. سەلمان ڕوشدیی ئەدیب، دوای ئەوەی ڕابەری ڕۆحی پێشوی ئێران ئایەتوڵڵا خومەینی لەسەر ڕۆمانی –ئایەتە شەیتانیەکان– فتوای کوشتنی دا، چونکە سوکایەتی بە ئیسلام دەکات تووشی مەترسی تیرۆر هات. ڕوشدی لە دیمانەیەك لەگەڵ هەفتەنامەیەکی ئەڵمانیدا وتی: *چەند ساڵێکە ڕۆژنامەکانی بەریتانیا هەوڵی ئەوە دەدەن وام پیشان بدەن کە کەسێکی نوشوست خواردووم*. هەر لەو دیمانەیەدا ڕوشدی وتی: *"دیدگای ڕۆژنامەی بەریتانی دروستکردنی ئامانج و پاشان لێدانیەتی. گومان لەوەدا نیە کە ئەو نوسەرانە هیوابڕ بوون لە نەکوژرانم، ئەوان ڕقیان لە منە، چونکە لەگەڵ ئەو فتوایەیشدا کە بۆ کوشتنم دەرکرا، من هەر دەژیم، ئەمڕۆ ژیانێکی چاك بەسەر دەبەم"*.

لەگەڵ ئەوەشدا کە لە چەند ساڵێك لەمەوبەرەوە فتواکە ڕەت کراوەتەوە، بەڵام هێشتا چەند گروپێکی توندڕەوی ئێرانی بە تەمای پاکۆدانی ڕوشدین. شایانی باسە کە پارەیەکی بێشومار بۆ پاراستنی ڕوشدی خەرج دەکرێت، بەڵام بە پێی قسەی خۆی ئەو پارەیە زۆر نیەو بڕەکەی ناگاتە *11* ملیۆن جونەیهی ئیسترلینی لە ساڵێکدا وەك پێشان باسکراوە. سەلمان ڕوشدی وتی: *"ئەو بڕە پارەیە زۆر لەوە کەمترە، بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە بەریتانیادا خۆم شاردبوەوە باجی دەرامەتم داوە، ئەگەر بەراوردی ئەو پارەیە بکەی کە داومە بەو پارەیەی بۆ پاراستنم لێیان سەندوم ئەوا ئینگلتەرا قازانجیەتی"*.

ناوی سەلمان ڕوشدی لەم دواییی دواییەدا کەوتەوە ناو ناوانەوە کاتێك کە کۆمپانیای هەوایی "ئێرکندا" بە بیانووی باری ئەمنیەوە ڕێگای لە ڕوشدی گرت سواری یەکێك لە فڕۆکە سەفەریەکانی ببێت. کۆمپانیاکە پاساوەکەی ئەوە بوو کە ترسی ئەوەی هەیە ئەو بێنەو بەردە ئەمنیەی بۆ ڕوشدی دەکرێت ببێتە هۆی دواکەوتنی هەستانی فڕۆکەکەو سەرنشینەکانی تووشی سەرئێشەو دواخستن بکات. بەڵام لە دواییدا کۆمپانیاکە لەو هەڵوێستەی پەشیمان بوەوە.

لە "یدیعوت احر و نوت"ی چاپی عەرەبییەوە.

repin

# میتۆدە مێژوویەکەی مارکس و چەمکە سۆسیۆلۆژیەکان

تۆم بۆتۆمۆر

وەرگێڕانی: بڕوا عەلادین



زۆرجار بە میتۆدەکەی مارکس دەگوترێ (ماتەریالیزمی مێژوویی)[1]. ئەم گوزارشتە سەر لێ شێوێنەرە، چونکە مەبەستێکی فەلسەفی دەداتە پاڵ مارکس کە خۆی نەیبوە. مارکس نە بایەخی بە مەسەلە ئەنتۆلۆژیەکانی پەیوەندی نێوان فیکرو بوون داوە، نە بە مەسەلەکانی تیۆری مەعریفە. ئەو زۆر بە توندی ئەو فەلسەفە تێڕامانئامێزانەی (التاملیة) ڕەتکردەوە کە دەیانەوێت زانستێکی میتافیزیکی لە بوارێکی تازەی بوارەکانی مەعریفەدا بونیات بنێن[2]. مارکس زۆر بە سادەیی باسی بنەمای ماتەریالی میتۆدەکەی خۆی بۆ لێکۆڵینەوە کردوە.

لە پێشەکیەکەشیدا بۆ چاپی دوەمی کتێبی (سەرمایە) داوا لە خوێنەر دەکات پێشەکی کتێبەکەی ((بەشداریەك لە ڕەخنەی ئابووری سیاسیدا)) بخوێنێتەوە کە تیایدا بە تەواوەتی مەبەستی خۆی بەرامبەر ماتەریالیزم روون کردۆتەوە. لێکۆڵینەوەش لەو پێشەکیە- کە کارە تیۆریەکەی مارکس کورت دەکاتەوە بۆ چەند گریمانەیەکی کەم، ئەوکارەی بەر لە *15* ساڵ لە دەستنوسەکانی بروکسل‌و پاریسدا ئەنجامی داو تەواوی کرد-ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەو گوزارشتی "مادی" بەکار هێناوە تاوەکو مەرجە سەرەکی‌و سەرەتاییەکانی بوونی مرۆڤمان نیشان بدات‌و نمایشی بکات. ئەو دەربڕینانەش کە بەکاری هێناون بریتین لە: (ژیانی مادی)، (مەرجە مادیەکانی ژیان)، (هێزە مادیە بەرهەمهێنەرەکان)، (شێوە بەرهەمهێنانی ژیانی مادی)، (گۆڕانی مادیانەی مەرجە ئابوریەکانی بەرهەمهێنان)...تا دوایی. وەکو پێشتریش وتمان مارکس بە پلەی یەکەم زانایەکی تازەی مێژوە، یەکەم بایەخیشی بریتیە لە گۆڕانی مێژوویی. ئەو بیرۆکەی خوڵقاندنی خودگەریانەی

مرۆڤی لە هیگڵەوە وەرگرت، بەڵام بە پێچەوانەی هیگڵەوە ئەم خوڵقاندنە خودگەریە وەك پەرەسەندنێکی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنێت کە پشتی بەباڵادەستی مرۆڤ بەسەر سروشتدا بەستوە. ئەو لە ڕاپۆرتەکەیدا دەربارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی هەر ئاماژەیەك بۆ هێز یا نێوەندی چواردەوری ئەو کەسانە بەدوور دەزانێ کە دەژین و لە کۆمەڵگەدا کار دەکەن. لەبەرئەم هۆیە زۆر هەڵەیە وەکو فەیلەسوف مێژوو لە مارکس بڕوانین، چونکە ئەو بایەخی بە نوسینی ڕاپۆرتێکی زانستی دەدا سەبارەت بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، ڕەخنەشی لە هیگڵ و هیگڵیستە لاوەکان ئەوە بوو کە ئەمانە فەیلەسوف مێژوون و مێژوونوس نین. ئەگەر دەشڵێن مارکس فەیلەسوف مێژوە ئەوە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ڕاستکردنەوەی زانستی و ئاکاری تێکەڵاو کردوە لە زانستەکەیدا، بەڵام ئەمە زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنێکی هەڵە لە چەمکە مێژووییەکەی کە بە هۆی حەماسەتی لایەنگرە هەڵەکانیەوە بڵاوبۆوە. مارکس خۆی لە دیکۆمێنتێکدا وەڵامی ڕەخنەیەك دەداتەوە کە یەکێکە لە ڕۆشنترین پەرەگرافەکانی بۆ چەمکە تایبەتیەکەی سەبارەت بە چەمکە مێژووییەکەی[3] :

((دەبوایە دەستنووسەکەم سەبارەت بە ئەسوڵەکانی کەپیتالیزم لە ئەورووپای خۆرئاوادا بگۆڕێت بۆ تیۆرەیەکی فەلسەفی-مێژوویی سەبارەت بە بزوتنەوەیەکی جیهانی کە بێگومان لە نێو خەڵکیدا هەیە، بێئەوەی گوێ بەو بارودۆخە مێژووییە بدات کە لە ڕێگەیەوە سیستەمێکی ئابوری دەستنیشان دەکات، کە زۆرینەی زۆری کاری کۆمەڵایەتی جگە لە مەحاڵبوونی پەرەسەندنێکی هاوسەنگی مرۆڤایەتی هیچی دیکە ناگەیەنێت. بەڵام دەبێت من ڕێگەی لێبگرم. ئەو زۆر شەرەفمەندانە مامەڵەی لەگەڵدا کردم، بەڵام لەهەمانکاتدا ڕقی لێم بوو. با نمونەیەك بهێنینەوە. لە کتێبی سەرمایەداو لە چەندین بۆنەی دیکەدا ئاماژەم بەو چارەنوسە دا کە زۆرینەی خەڵکی لە ڕۆمای کۆندا هەیانبوو. ئەوان لە بنەڕەتەوە جوتیاری ئازادبوون و زەوی تایبەتیی خۆیان دەکێڵا، بەڵام لە کۆتایی مێژووی ڕۆمانیدا بوون بە کەسانێك کە خاوەنی هیچ نەبوون و هیچ موڵکێکیان نەبوو. هەمان ئەو پەرەسەندنەی کە لە ئامرازو ماتەریاڵە بەرهەمهێنەرەکانیانی دابڕین، یارمەتیدەر بوو بۆ گەشەکردنی موڵکیەتی زەوی و زارە گەورەکان و سەرمایەی سامانی گەورە. بەو شێوەیەش لەهەمانکاتدا یەکەمجار کۆمەڵێك خەڵکی ئازادمان هەیە کە جگە لە هێزی کاری خۆیان هیچی دیکەیان نیە، دوەم جاریش خاوەن سەروەت و سامانەکانن کە ئامادەن کاری ئەوانە بقۆزنەوەو بیان چەوسێننەوە. بەڵام ئایا چی ڕووی دا؟ پرۆلیتارە ڕۆمانیەکان جوتیاری کرێگرتە نەبوون، بەڵکو کۆمەڵێك ئاژاوەچی پیس، لە سپی پێستە چەوساوەکانی وڵاتەکانی باشوری ئەمریکا چەوساوەتر بوون. وەك چۆن لە پاڵیاندا سیستمێکی بەرهەمهێنان سەری هەڵدا کە سەرمایەداری نەبو، بەڵکو لەسەر بنەمای کۆیلەیتی ڕاگیر ببوو. بەو شێوەیەش دەبینین کە ڕووداوی مانگرتنە هاوشێوەکان، بەڵام لە پێکهاتەی مێژوویی جیاجیادا، کۆمەڵێك ئەنجامی جیاوازی داینێ. بۆ تێگەیشتنیش لەم دیاردەیە دەتوانین لە ڕێی هەریەك لەو پەرەسەندنانەوە کەشفی بکەین، بەڵام ئەگەر

تەواوی متمانەی خۆمان بە تیۆرەیەکی فەلسەفی- مێژوویی بەخشی کە خاسیەتە سەرەکیەکەی بریتیە لەوەی چۆتە سەرووی مێژووەوە، ئەوا لەم کارەدا سەرکەوتوو نابین))[3].

چەمکەکەی مارکس بۆ زانستی مێژوو زۆر تازە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە زۆر ڕەگەزیدا قەرزاری (سان سیمۆن) بوو، بە ڕادەیەکی کەمتریش قەرزاری ئەو نوسەرانە بوو کە لە مێژووی (کۆمەڵگەی مەدەنی)یان کۆڵیبوٚوە. هەروەها مارکس باوەڕی وابوو کە دەبێت بابەتی زانستی مێژوو زۆر فراوانتر بێت لە بابەتە باوەکان. بە تایبەتی لە نێو مێژونوسەکانی ئەڵمانیادا کە دەبێت کەش وهەوای ئایین، سیاسەت، ئەدەب و هونەریش بگرێتەوە. هەروەها بە بڕوای ئەو دەبێت پیشەسازی کە چالاکی کردەگییانەی مرۆڤە لە هەموو لایەنێکەوە ئامانجی سەرەکی لێکۆڵینەوە بێت لە سایکۆلۆژیا[4] و مێژوو، هەردووکیشیان بەشێك بن لە زانستێکی فراوانترو سەراپاگیرتر کە بایەخ بە سروشت و مرۆڤ بدات. بە پێی ئەم تێڕوانینەش دەکرێت بە زانستی مێژووی مارکس بڵێین سۆسیۆلۆژیای مێژوو. بایەخدانی ئەو بە تێپەڕاندنی سنووری تایبەتی هۆکارە مێژووییەکان کەمتر بوو لە بایەخدانی بە ڕستێك وتەزا بۆ شیکارکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان، بەو پێیەی کە هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی بەردەوام لە گۆڕاندایەو دەگۆڕێت. مارکس ئامانجە سەرەکیەکانی ئەم سۆسیۆلۆژیایەی لە پێشەکی 1895 دا پوختکردەوە، کە وەك پێشتر وتمان ئەو ناوەرۆکانەمان بۆ پوخت دەکاتەوە کە مارکس لە دەستنوسەکانی سەرەتایدا پێیان گەیشتوەو هێشتا چاپ نەکراون، ئەو ئامانجانەش بریتین لە:

1-بونیادی ئابووری کۆمەڵگە.
2-سەرخانی ئایدیۆلۆژی.
3-شۆڕشی کۆمەڵایەتی.
4-پاشەڕۆژی کۆمەڵگە.

لێرەدا مەبەستمان گفتوگۆکردنێکی گشتی نیە دەربارەی ئەو ئامانجانە یاخود ئەو چەمکە جیاوازانەی مارکس لە چارەسەرکردنیدا بەکاری هێناون، بەڵکو بایەخی سەرەکیمان بریتیە لە کەشفکردنی ئەو ڕەگەزە تایبەتیانەی مارکس بۆ تیۆرەی کۆمەڵایەتی زیاد کردوە. ئەوەی مارکس لە بارەی بونیادی ئابووری کۆمەڵگەوە بەدی هێنا شتێکی تازەو سەیر نیە: چونکە ئەو کەسێك بوو لە نێوان مێژونوس و ئابوریناسەکاندا، وەك لە کاتی گفتوگۆکردن دەربارەی کەسانی پێش مارکسدا بینیمان. بەشداریە تایبەتیەکەی مارکس لەم بوارەدا بوو، لەو ڕەوتەدا کە گفتوگۆی لە بارەی بونیادی ئابوریەوە دەکرد، لە ڕەوتی پەرەسەندنی مێژووییانەی کاری مرۆڤ وەك یەکەمین پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت، هەروەها هەوڵدانی بۆ پۆلێنکردنی مرۆڤایەتی لەبەر ڕۆشنایی سیستەمە ئابوریەکانیدا.

بەشداریە مەزنەکەی مارکس بریتیە لە شیکردنەوەکەی بۆ سەرخانی ئایدیۆلۆژی و پەیوەندی ئەم سەرخانە بەو شتەوە کە ناوی نابوو (بنەما ڕاستەقینەکانی) کۆمەڵگە، کە ئەویش خۆی بریتیە لە سیستەمی بەرهەمهێنان و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیە بەیەکداچوەکان. پێداگرتنی ئەو لەسەر

ئەوەی کە (ئەوەی بوونی خەڵکی دەستنیشان دەکات هۆشیاریان نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەوە بوونی کۆمەڵایەتیانە کە هۆشیارییان دەستنیشان دەکات) گریمانەیەکی فەلسەفی (ئەبستمۆلۆژی) نیە، بەڵکو راپۆرتێکە دەربارەی بنچینەی بونیادە ئایدیۆلۆژی، یاسایی، سیاسی، ئایینی، هونەریو فەلسەفیەکان. بە رای مارکس ئەم (فۆرمە ئایدیۆلۆژیانە) سەرچاوەی هەڵەی توێژینەوەی زانستین، ئەو کاتەی سەیری شتەکان لە خۆیاندا دەکات بێئەوەی هیچ بایەخێك بدات بەو پەیوەندیە بەیەکداچوانەی لە ئاکامی قۆناغێکی دیاریکراو لە پەرەسەندنی ئابوریو بەرهەمهێنانی هەمەڕەنگی کلتوریەوە سەر هەڵدەدەن. بە رای ئەو ئەم جۆرە پەیوەندیە بەیەکداچوانە، لە نێوان سیستەمەکانی بەرهەمهێنان، بونیادی چینایەتیو نێوانی ڕێگەی بیرکردنەوەو داهێنانی ئەدەبیدا، لە زۆر حاڵەتدا بێ هیچ کێشەیەك پێکدێت.

لە ڕاستیدا مارکس یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە، کە بە رای ئەو تیۆرەیەکی ڕەخنەیی بوەو ئامانجی زەمینەسازکردن بوە بۆ دامەزراندنی سۆسیۆلۆژیایەکی توندو پتەو. ئەوانەشی کە لە هەمان بواردا بە دوای مارکسدا هاتن، زۆر باسی سۆسیۆلۆژیای مەعریفەیان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك ئیشی گرنگیان پێشکەشی مێژووی فیکر کرد بە تایبەتی فیکری سیاسی.

بەڵام ئامانجی سێهەم، واتە ئامانجی شۆڕشی کۆمەڵایەتی، زۆربەی سۆسیۆلۆژیستەکان فەرامۆشیان کرد. لە پاشتریشدا گۆڕانی کۆمەڵایەتی (کە ئەوەش بۆ خۆی مایەی سەرسوڕمانە) بایەخێکی کەمی پێدراوە. سۆسیۆلۆژیستەکان تازە بەتازە خەریکی لێکۆڵینەوەن لە تەنها سیمایەکی تایبەتی ئەم مەسەلەیە، ئەویش بریتیە لە پرۆسەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەو وڵاتە دواکەوتوانەدا کە کەوتونەتە ژێر کاریگەری تەکنیکی خۆرئاواوە. دیارە گرنگە ئەو کاتەی تێبینی ئەو کاریگەریە گەورانە دەکەین کە شۆڕش لە ڕێکخستنە کۆمەڵایەتیە مرۆییەکاندا دەیکات، دەبینین هەر لە سەردەمی مارکسەوە هەرچی سۆسیۆلۆژیستێك هەیە بە جیدی بیری لە شیکردنەوەی بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکان نەکردۆتەوە یاخود هەوڵی نەداوە لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریانەی شۆڕشەکان بکات. پێویستیشە بڵێین سۆسیۆلۆژیای شۆڕش دامەزرێنەرێکی گەورەتری هەیە کە مارکس خۆیەتی.

دواجار چوارهەمین ئامانجی شیکردنەوە سۆسیۆلۆژیەکەی مارکس بریتیە لە پاشەڕۆژی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، کە لێرەدا مانای وایە سۆسیۆلۆژیاو فەلسەفەی کۆمەڵایەتی بەشداریان کردوە لە پێشکەشکردنی ڕێبازێکدا کە لەیەك کاتدا جەستەی مەعریفەی سیاسیو گۆچانی کاری سیاسیە.

### سەرچاوە

في سوسيولوجيا ماركس وفلسفته الاجتماعية، توم بوتومور–م.ربل.

ترجمة:محمد حافظ يعقوب. لاپەڕە(*48* بۆ *55*) .

### پەراوێزەکان

*1*– مارکس خۆی هەردوو تەعبیری (ماتەریلیزمی مێژوویی)و (ماتەریالیزمی دیالەکتیکی) بەکار نەهێناوە، بەڵکو

تـــــەعبیری یەکـــــەمیان هـــــی ئێنگڵـــــزەو تـــــەعبیری دووهەمیان هی بلیخانۆفە.

*2*– ئەمـــــە زۆر ئاشـــــکرایە، بـــــە تایبـــــەتی لـــــە (تێزەکان دەربارەی فیورباخ)دا.

([3])–وەڵامێکی چاپ نەکراوە بۆ نامەیەکی میخائیلۆفسکی، کە جەخت لەوە دەکاتەوە بەپێی رێبازە فەلسەفیەکەی مارکس روسیاش وەك هەر نەتەوەیەکی دیکە ناچارە بە قۆناغێك لە پەرەسەندنی سەرمایەداریدا تێبپەرێت. بۆ بەراوورد کردن بڕوانە نیکۆلای (بە ناوی خوازراوی ن.دانیلسۆن)ەوە، مێژووی پەرەســــەندنی ئابوریانــــەی روســــیا لــــە ئــــازادکردنی کۆیلەکانەوە. پاریس *1902*

*3*– بۆ بەراوردکردن بڕوانە نامەکەی مارکس بۆ ئەنینکۆف (*28* ی کانونی یەکەمی *1846*) کە تیایدا مارکس رەخنەی لە برۆدۆن گرتوەو پاشتر لە کتێبی (هەژاری فەلسەفە) دا بڵاوبۆتەوە. مارکس هێرشی کردۆتە سەر برۆدۆن چونکە فەیلەسوفی مێژوە: (بە کورتی، ئەوە مۆدێلێکی کۆنە لە هیگڵیزم نەوەکو مێژوو. ئەوە شێوێنەری مێژووی مرۆڤ نیە، بەڵکو مێژوویەکی فیکری نمونەکانە. لە چەمکەکەشیدا "واتە برۆدۆن" مرۆڤ وەسیلەیە، لە کاتێکدا ئەوە بیرۆکە یا هۆی ناوەکیە کار بۆ پێشخستنی دەکات).

*4*– پیشەسازی (کتێبێکی کراوەیە بۆ چالاکیەکانی مرۆڤایەتی). (دەستنوسە ئابووریو فەلسەفیەکان)



Renoir-boating

# بە بۆنەی خولی حەفتاو چوارەمین ساڵەوە: چیرۆکی خەڵاتی ئۆسکار

و: سەردەم




لە ساڵی *1927*ەوە کە ئەکادیمیای هونەری سینەماو زانستەکانی دامەزرا (ئەوە مێژووی دەستپێکردنی فیلمی دەنگداریشە) ئەو لیژنەیەی کە سەرپەرشتی دەکردو لە گەورە بەرهەمهێن و ئەکتەرو دەرهێنەری ئەو سەردەمە پێکهاتبوون، بڕیاری خەڵاتێکی ساڵانەی دا، بۆ شیاوترین فیلم، دەرهێنەر، ئەکتەری ژن و پیاو، خەڵاتەکە بە ناوی "خەڵاتی شایانی ئەکادیمی"یەوە ناونرا، ئەو خەڵاتە ناودارە جیهانیەی کە بە "ئۆسکار" ناوزەد کرا. ساڵی *1928* فیلمی "ئاسمانی حەوتەم" دوو خەڵاتی بەرکەوت یەکێکیان بۆ جانیت غینر وەك چاکترین ئەکتەری ژن و دوەمیان بۆ فرانك بورزا وەك چاکترین دەرهێنەر. ئیمیل جینیز خەڵاتی چاکترین ئەکتەری پێ درا لە "داواداوا"داو چاکترین فیلمی ساڵی *1927*یش "باڵەکان" بوو.

**بۆ ناوی "ئۆسکار" بەم خەڵاتەوە نرا؟**

لەبەرئەوەی بەڵگەنامە یان سەرچاوەیەك لە بەردەستا نیە بە تەواوی و بنەبڕ ئەوەی ساغ کردبێتەوە کە هۆی ئەو ناولێنانە چی بوە، بەڵام ئەوانەی لە بواری سینەمای هۆلیودا کاردەکەن چیرۆکێك دەگێڕنەوە کە بوە بە سەرچاوەی سەرەکی بۆ هۆکاری ئەو ناولێنانە کە ئەمە پوختەکەیەتی:

مارگریت هیریك کە کارمەندی کتێبخانەی ئەکادیمیاکەو پاشان بوە بەڕێوەبەری، کاتێك کە پەیکەرەکەی بینی هاواری لێ هەستا: *" خودایا، ئەم پەیکەرە هەر لە "ئوسکار"ی مامم دەچێت"* ڕۆژنامەنووسێك کە گوێی لە قسەکەی مارگریت بوو ناوەکە سەرنجی ڕاکێشاو کەوتە بانگەشە بۆ کردن و بڵاوکردنەوەی.

خەڵاتی ئوسکار بریتییە لە پەیکەرێکی بچووکی کانزایی ڕووپۆش بە ئاڵتوون، درێژیەکەی سیانزە ئینچ و نیوە، کێشی هەشت پاوەندو نیوە. سیدریك گیبون خاوەنی بیرۆکەکەو داهێنەریەتی. پەیکەرەکە بریتییە لە پیاوێکی شمشێر بە دەستی لە خاچ چوو کە بەسەر شریتی فیلمەوە ڕاوەستاوە.

لە سالانی بەراییدا، بەخشینی خەلاتی ئۆسکار وەك ئێستا لە ئاهەنگی گەورەو گراندا بەڕێوە نەدەچوو، یەکەم ئاهەنگ بۆ بەخشینی ئەو خەلاتە لە شێوەی خوانێکدا سازکرا لە ئوتێل روزفیلت هولیود لە شانزەی ئایار (مایو)ی سالی *1929*دا، ژمارەی ئامادەبوان *250* کەس و بلیتی چوونە ژوورەوە دە دۆلار بوو. لە دە سالی بەراییدا ئەنجامەکان پێشەکی دەدرانە رۆژنامەکان تا لە هەمان شەوی دابەشکردندا بلاوی بکەنەوە، بەرندەکانی خەلاتەکە پێش وەرگرتنی دەیانزانی خەلاتەکەیان پێ دەدرێت، چونکە لە سالی *1941*ەوە ئەوە داهات کە بخرێتە ناو زەرفێکی مۆر کراوەوە. بەلام شەڕی دووەمی جیهانی دۆخی ئاهەنگەکەی لە خوانی ناو ئوتێلێکەوە گۆڕی بۆ ئاهەنگی نێو هۆلی سینەمایەك و لە هەوادا بلاوکردنەوەی، لەکاتی شەڕەکەدا راستەوخۆ هەوالی ئاهەنگەکە لە رادیۆوە بۆ دەرەوەی ئەمەریکا بلاو دەکرایەوەو سەربازە ئەمریکیەکان گوێیان لێ دەگرت، لە سالی *1961*دا بۆ یەکەمجار بەرنامەی ئاهەنگەکە لە رێگای تەلەفزیۆنەوە بە رەنگاورەنگی بلاوکرایەوە. ئاهەنگی دابەشکردنی خەلاتەکە تا سالی *1969* لە هۆلیودا دەکرا، پاشان رێ و رەسمی ئاهەنگەکە لەناو هولیودەوە گوێزرایەوە بۆ "مەلبەندی موسیقا" لە لوس ئەنجلس، لە سالی *1986*ەوە شوێنی ئاهەنگی خەلاتدانەکە لە نێوان "مەلبەندی موسیقا" و "هۆلی شراین"دایە. بەلام خولی حەفتاو چوارەمین، ئێوارەی یەك شەمو (*2002/2/24*) بە رووداوێکی گەورە دادەنرێت، چونکە رێورەسمی دابەشکردنی خەلاتی ئوسکار لە ناوجەرگەی هولیود لانەی خەونەکاندا، لەسەر "شانۆی کوداك" بەڕێوە دەبرێت، چونکە لە حەفتا سال زیاتری لەوەو بەرەوە هەر لەوێوە دەستی پێکرد. بەم بۆنەیەوە ئەکادیمیا داوای لە ئەلیکس روسی هونەرمەند کرد کە پۆستەرێکی رەسمی بۆ خولی *74* سالەی خەلاتی ئۆسکار دروست بکات. گەورە پسپۆرەکانی بواری دیکۆرو رووناکی کەوتنە کار بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی نوێ و دەگمەن هۆلەکە رێك بخەن. ئەو شانۆ تازەیە سالی *2001* کرایەوە کە نزیکەی *90* ملیۆن دۆلاری تێچوو. تازەترین ئامێری دەنگ و روناکی و شانۆیی بۆ ئامادە کرا.

رەنگە خوێنەرێك بپرسێت کە فیلمێك چۆن دەپالێورێت بۆ ئەم خەلاتە.؟ ئەوە بەسە کە هەر کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنەری فیلم داوای چوونە ناو کێبڕکێکە بکات. نزیکەی *24* بەش لەوێدا هەیە کە هەریەکەیان پسپۆڕی بابەتێکن، هەر بەشێك چەند ئەندامێکی پسپۆڕ سەرپەرشتی دەکات، بۆ نمونە ئەو دەرهێنەرانەی بۆ دەستنیشان کردنی ئەو فیلمانەی کە پێشکەشیان کراوە بۆ بە دەستهێنانی خەلاتی چاکترین دەرهێنان، تەنیا فیلمی بێگانە، یان فیلمی کورت یانی فیلمی دیکۆمێنتی. ئەوانەی سەرپەرشتی ئەم کارانە دەکەن تێکەلن لە چەند پسپۆڕیەك، بەلام دەستنیشانکردنی چاکترین فیلم و ناوی بەرندەکان، بە دەنگدانی هەموو ئەندامانی ئەکادیمیا دەبێت کە دەنگیان داوەو نزیکەی *5700* کەس دەبن. ئەو فیلمانەی کە بەرندەی پێنج خەلاتە سەرەکیەکە بن: چاکترین فیلم، دەرهێنان، ئەکتەری پیاو، ئەکتەری ژن و سیناریۆ. لە هەموو مێژووی هۆلیودا، تەنیا سێ فیلم توانیویەتی بە جارێك سێ خەلات لەو پێنج خەلاتە بباتەوە، ئەوانیش: "شەوێك لە شەوان *1934*" "فڕین بەسەر هێلانەی کوکوختیدا *1975*" و "بێدەنگی مەڕەکان *1991*" ئەو کەسایەتیش کە زیاتر لە هەر کەسێکی دی بۆ ئەو خەلاتە دەستنیشان کراوە "میریل ستریب"ەو *12* جار پالێوراوە، والت دیزنیش لە هەموو کەس زیاتر ئەم خەلاتەی بە دەست هێناوە کە *26* خەلاتی ئوسکارە.

**سەرچاوە**

لە تۆڕی ئینتەرنێتی (ئیلاف)ەوە